# گوڵشان

## ژیانی ناوداران و شاعیرانی کورد

ئامادەکردنی:
مەلا سامان هەڵەبجە



# گوڵستان

ژیانی شاعیرو ناودارانی کورد

ئامادەکردنی: مەلا سامان هەڵەبجەیی

# پێناسی کتێب

- ناوی کتێب: گوڵستان
- ئامادەکردنی: مەلا سامان هەڵەبجەیی
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نۆبەو ساڵی چاپ: دووەم ٢٠١٧

بڵاوکراوەی کتێبخانەی هەژار موکریانی

سەرپەرشتی چاپ: عەتا ڕەووف

٠٧٥٠١١٧٣٩٢١

# نالی

## باشور کوردستان

## (١٨٠٠ – ١٨٥٦ ز)

نالی ناوی خدر (خضر)ە و کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی ئالی بەگی مکایەلییە. لە گوندی خاك وخۆڵ لە دەشتی شارەزوور هاتوەتە ژیانەوە. بەپێی ڕێبازی خوێندنی ئەو سەردەمە لە سەرەتاوە قورئانی پیرۆزی و وردە پەرتووکی فارسی خوێندوە و چووە بۆ فەقێیەتی و لە پێناوی وەرگرتنی زانستە ئایینییەکاندا شار و دێهاتە قوتابخانەدارەکانی بەشێکی کوردستان گەڕاوە و دوا پلەی ئەو خوێندنەی بڕیوە و مۆڵەتی مەلایەتیی وەرگرتوە .

ئەو شوێنانەی نالی بۆ ماوەیەکی زۆر تێیاندا مابووبێتەوە : سنە ، سابلاغ، زەردیاوای قەرادغ، هەڵەبجە و سولەیمانی. لە قەرەداغ لای شێخ موحەممەدی ئیبنولخەبیاط خوێندویەتی. لە تەکییەی قەرەداغیش ماتماتیکی لای شێخ عەلیی مەلا خوێندوە. لە سولەیمانی لە مزگەوتی سەیید حەسەن لای مەلاعەبدوڵڵای ڕەش بووە . زۆرترین کاتی موستەعیددیی لە خانەقای مەولانا خالید لە سولێمانی بەسەربردووە . هەروەها گەلێکیشی لە هەڵەبجە و سولەیمانی لای شێخ ئەوڵای خەرپانی خوێندوە .

سەبارەت بەتەمەنی نالی چەندین بۆچوونی جیاواز: خوالێخۆشبوو موحەممەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: نالی لە ساڵانی ١٢٧٣-١٢١٥دا کۆچیکردووە و ١٨٠٠-١٨٥٦ زایینیدا ژیاوە . دکتۆر مەعروف خەزنەداریش هەر هەمان مێژوو دیاری دەکات، هەروەها دکتۆر کەمال فوئادیش هەمان بۆچوونی هەیە . مامۆستا عەلائەددین سەجادییش دەڵێت: لە ١٧٩٧ی زایینیدا هاتوەتە دنیاوە و لە ١٨٥٥دا مردووە .

هەموو ئەم مامۆستایانە، بێجگە لە مامۆستا سەجادی نەبێ، مێژووی لەدایکبوون و مردنی نالییان وەك یەك دانا و بەو پێیە نالی ٥٦ ساڵ ژیاوە. تەنها بەپێی بۆچوونەکەی مامۆستای سەجادی تەمەنی بووە ٥٨ ساڵ.

ئەم جیاوازیەش وەکو سەرنجی بۆ دراوە قسەی مامۆستا سەجادی لەلایەك و دکتۆر خەزنەدار و دکتۆر کەمال فوئاد لە لایەکی ترەوە دەربارەی تەمەنی و ساڵی لەدایکبوونی نالی ئەو بەراوردکردنەی کوردی و مەریوانی و بەدوای ئەوانیشدا مامۆستا عەلی موقبیلە ، ئەوەی لە پێشەکی دیوانەکەیاندا ساڵی ١٢١٥ی کۆچییان لەگەڵ ساڵی ١٧٩٧ی زایینیدا بەراوردکردووە .

جا ئەگەر وەها بێت، ئەوا وەك كوردی و مەریوانی و موقبیل و سەجادی ئەفەرموون نالی ٥٨ ساڵ ژیاوە. بەڵام لە ڕۆژنامەكانی ڕۆژهەڵاتناسی ئەرمەنیی یوسف ئەبگارەڤیچ ئۆربێلیدا ساڵی ١٢١٥ی كۆچی لەگەڵ ساڵی ١٨٠٠-١٨٠١ی زایینی بەرامبەر كراوە . بەپێی ئەمە وەك دكتۆر مارف خەزنەدار و دكتۆر كەمال فوئاد لەسەری ڕۆیشتون، ساڵی لە دایكبوونی نالی دەكاتە ١٨٠٠ی زایینی و تەمەنیشی دەبێتە ٥٦ ساڵ.

لەوانەی باسكران هیچیان ناتوانرێت وەك سەرچاوەیەكی ڕاستەقینە و باوەڕپێكراو ساڵی لەدایكبوون و كۆچی نالی دیاری بكەن. بەڵام هەندێ شت هەیە دەبنە هۆكاری ڕوونكردنەوەی سەردەمی نالی و نزیكبوونەوە لە زانینی ساڵی لە دایكبوون و مردنی.

١- نالی پەیوەندییەكی تایبەتیی لەگەڵ سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای كوڕیدا بووە. ئەم پەیوەندییەیش بەم بەڵگانەی خوارەوەدا دەرئەكەوێ :

- ئەو غەزەلەی كە سەرەتاكەی ئەم بەیتەیە:

بولبولی تەبعم ئەوا دیسان پەناخوانــی دەكــات

كە تێیدا دەڵێت:

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین

خۆی كە دامێن‌گیری شاهی ئاصەفی پانی دەكــات

شاهی ئاصەف یەكەم حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر(درودی خوا لەسەر بێت) بووە كە شالیارەكەی ناوی ئاصەف كوڕی بەرخیا بووە و مەبەستی لە شای دووەمی ئاصەفیش، سولەیمان پاشای بابانە .

- ئەو غەزەلەی، ئەوەی یەكەم بەیتی ئەمەیە :

ئەم تاقمە موماتزە كەوا خاصەیی شاهــــن

ئاشوبی دڵی مەملەكەت و قەلبی سوپاهـــن

ئەوانەش هەمووی بریتییە لە پیاهەڵدان و باسكردنی تاقمە سوپایەك. دەبێت ئەو سوپایە سوپای كێ بووبێت، ئەگەر هیی سلێمان پاشا یان ئەحمەد پاشای كوڕی نەبووبێت" بەتایبەتی، كە پەرتووەكەكانی مێژوو دەڵێن، ئەم ئەحمەد پاشایە سوپایەكی ڕێكوپێكی و تازە بابەتی پێكهێناوە. وەكو مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەریس دەڵێت: نازانم 'نالی' لە كاتی دەستەڵاتی ئەحمەد پاشادا لە سولەیمانی ماوەتەوە و ئەو سوپایەی بە چاوی خۆی بینیوە و باسەكەیان بۆ گێڕاوەتەوە و دووربەدوور پێناسەی كردووە ، یاخود مەبەستی

سوپای سلێمان پاشای باوکیەتی، ئەوەی لە ١٢٣٤ی کۆچییەوە تا ١٢٥٤ حوکمرانیی سولەیمانی کردوە؟!

– قەسیدە درێژەکەی، ئەوەی بۆ سالمی هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆی ناردووە و ئەوەش تێکڕا پرسیارە لە وەزعی سولەیمانی پاش نەمانی دەوری بابانەکان.

– غەزەلەکەی، ئەوەی بەبۆنەی سەفەری حەجی (نووری ڕوودباری)یەوە وتوویەتی کە وەك لە تێکڕای بەیتەکانەوە دەرئەکەوێ خاوەنی ڕێبازی نەقشبەندی و یەکێك بووە لە موریدە ناودارەکانی مەولانا خالید (١١٩٧ی.ك-١٧٨٣ی.ز، ١٢٤٢ی.ك-١٨٢٦ی.ز).

– قەسیدەکەی، ئەوەی بە مەستوورەیا وتوە :

خوسرەو خانی ئەردەڵان مێردی مەستوورە خانم، ئەوەی بە خوسرەو خانی ناکام بەناوبانگە ، لە ساڵی ١٢٤٠ی کۆچی و ١٨٢٤ی زایینییەوە لە سنە والی بووە. خوسرەو خان لە ساڵی ١٢٤٤ی کۆچیدا، لەگەڵ ئەوەش حوسن جیهانی کچی فەتح علی خانی قاجار ژنی بووە ، بۆ خۆشکردنی ناوبەین و دڵدانەوەی ئەبولحەسەن (مەستوورە)ی ئەدیب و شاعیریش ئەخوازێ. بە حیسابە پێشووەکە لەو کاتەدا کە مەستوورە شووی بە خوسرەو خان کردوە (نالی) ٢٩ ساڵان بووە . ئیتر هەرچۆن بێت، نالی خەوەکەی – لە قەسیدەیەکدا بۆ مەستوورە باسی لێ دەکات– پێش شووکردنی مەستوورە دیبێ و قەسیدەکەی بۆ هاتبێ یا پاش شووکردنی و چریبێتی، ئەم کەین و بەینە ڕووناکییەك هەر ئەگرێتە سەردەمی ژیانی نالی.

– مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس دەڵێت: کۆمەڵە پەرتووکێکی دەسنووسی پێکەوە جوزوبەندکراوی پەرتووکخانەی بنەماڵەی موفتی هەڵەبجەم – بنەماڵەی موفتیی هەڵەبجە ئەچنەوە سەر شێخەولای خەرپانی – دی. دوو غەزەلی تیا نوسرابوەوە لەسەرەوەیان نوسرابوو 'نالی'.

سەرەتای یەکێکیان ئەم بەیتەیە :

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بـــــێ تـــۆ
نەچم، شەرت بێ، هەتا ئەو خوارە بێ تۆ

سەرەتای ئەویشیان ئەم بەیتەیە :

عاشقی بێ دڵ دەناڵی، مەیلی گریانی هەیە
بێ شکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هەیـــە

هەرچەند لە هیچ لایەکی غەزەلەکانەوە نەنوسرابوو کەی نووسراونەتەوە ، بەلاّم دیار بوو وەك پەرتووکەکان خۆیان زوو نوسرابوونەوە . پەرتووکەکانیش لە مێژووی جیاجیادا نووسرابوونەوە. بۆ نموونە یەکێکیان 'کفایە'ی بێتوشی بوو بە دەستی 'مەعروف کوڕی شێخ ئەولاّی خەرپانی' نووسرابوەوە – لە سالّی ١٢٦٩ ی کۆچیدا. یەکێکی تریان قەسیدەی 'بانت سعاد' بوو لە سالّی ١٢٣٢دا نووسرابوەوە . یەکێکی کەشیان قەسیدەیەکی ١٥٠ بەیتیی جەلاددینی سیوطي بوو ڕەسوولّ ناوێك لە سالّی ١٢٣٢دا لە مەدرەسەی مەولانا ئەحمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەولانا سلێماندا نووسیبویەوە .

هەروەها لە لاپالّی کۆمەلّە دەستنوسێکی تر پێکەوە جوزوبەندکراوی هەر ئەم پەرتووکخانەیەدا شیعرێکی ترم دی درابوە پالّ نالی. پەرتووکەکانی ئەم کۆمەلّە لە سالاّنی ١٢٧١ و ١٢٧٢دا نوسرابوونەوە . هەرچۆن بێ دیارە سالاّنی ١٢٣٢ و ١٢٦٩ و ١٢٧١ و ١٢٧٢ کە سالّی نووسینەوەی ئەو پەرتووکانەن جۆرە ڕۆشناییيەك ئەخەنە سەر سالاّنی ژیانی نالی.

– لە هەموو گرنگتر لێرەدا ئەوەیە کە ڕۆژهەلاّتناس خۆدزکۆ، ئەوەی شابەندەری ڕوسیا بووە لە پاریس ئەیگێڕێتەوە کەوا لە سالّی ١٨٥٣دا لە پاریس چاوی بە ئەحمەد خان ناوێکی بابان ئەکەوێ، ئەوەی خەلّکی کوردستان بووە و لە ئەستەمبولّ دانیشتووە . خۆدزکۆ ناوی نالی لەم ئەحمەد خانە بیستووە ، ئەوەی دۆست و هاوڕێی بووە .

گەلێ بەیتی نالی هەیە وەها ئەگەیەنن، کە نالی گەیشتوەتە تەمەنی پیرییەکی ڕاستەقینە و بێ هێزبوون، کە دیارە ئەوەش لە ٥٨ سالّیدا پەیدا نابێ، وەك ئەمانە:

١– موی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرە شەگ

٢– بۆ مەمك (نالی) چ منداڵانە وەی وەی کردوە

گەرچی مووی وەك شیرە ، بەو شیرە شکۆفەی کردوە

٣– ئەی تازە جوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم

٤– من پیرم و فانی

ئەحمەد پاشای بابان لە ١٨٥٣دا لە پاریس باسی نالی بۆ خۆدزکۆی شابەدندەری ڕوسیا کردوە وائەگەیەنێ نالی لەو سەردەمەدا لە شام ژیاوە . چونکە شیعرەکەشی، ئەوەی پاش تێکچوونی فەرمانڕەوایی بابانییەکان بۆ سالمی ناردوە بۆ سولەیمانی، لە شامەوە ناردوویە. لە لایەکی دیکەوە هەموو ئەوانەی مێژووی ژیانی نالییان خستوەتە سەر کاغەز، باسی

ئەوەیان کردووە ، کە نالی پاشان چوەتە ئەستەمبوول و لەویٚ لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان ماوەیەکی دوور و درێژیان پێکەوە بەسەربردووە . جا سەرەڕای ئەوە ، کە لەوانەیە نالی ماوەیەکی زۆریش لە شام مابێتەوە ئەنجا چووبێتەوە ئەستەمبوول، ئەو ماوەی کەمتر لە دوو ساڵەی نێوان یەکتری دیتنی خۆدزکۆ و ئەحمەد پاشا و مردنی نالی لە ئەستەمبوڵ لە ١٨٥٥دا، کە ئەڵێن لەو ساڵەدا لەوێ مردووە ، بەپێی توانای هات و چۆی ئەو سەردەمە بە حاڵ بەشی تەنها پۆیشتنێکی لەسەرخۆی ئەو چەرخە ئەکا، چ جایێ ئەوەش ماوەیەکی دوور و درێژی لە ئەستەمبوڵ لەگەڵ ئەحمەد پاشا بەسەربردبێ.

نالی لە شیعرێکیا لە بەرامبەر مەزاری پێغەمبەر (درووردی خوای لەسەر بێت) ئەڵێت:

موودێکە کە هەم گەردشی دەورانی سوپیەرم

واتە : دەمێکە ئاوارەی نیشتمانم و ئەسوڕێمەوە و ئێستا گەیشتوومەتە ئێرە . ئەبێ ئەم (دەم)ە چەند ساڵی خایاندبێت و ئەو ماوەیەی لەکوێ بەسەربردبێ و کوێ گەڕابێ؟ دیارە نالی ئەم شیعرەی پاش بۆنەکەی لە شامدا وتوە ، وەکو دەردەکەوێ ئەبێ لەپێش ساڵی ١٨٥٣دا لەوێ بووبێت، چونکە هەر لەم پارچە شیعرەیدا گلەیی لە دەست پیری ئەکات و دەڵێت:

ئەی تازە جوان! پیرم و ئوفتادە و کەوتووم

هەروەها ئەڵێ:

من پیرم و فانی

حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە (باوکی جەنابی مەلای گەورەی کۆیە ) گێڕاویەتیەوە و بێگومان قسەشی جێگای باوەڕە ، کە لە ساڵی ١٢٨٨ی.ك (١٨٧١-١٨٧٢ی.ز)دا نالی لە مەککە دیوە و ئەو ساتەش زۆر پیر بووە .

لەبەر ئەوەی نالی خوێندەوارێکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە هەربۆیە شارەزاییەکی چاکی لە کۆمەڵگەی کوردیی ئەو سەردەمە هەبووە، لە شیعرەکانیدا باسی خواپەرستی و نیشتمان و ئەڤینداری ڕەنگی داوەتەوە. ئەگەرچی ئەو سەردەمە زمانی عەرەبی و فارسی برەویان هەبووە و زۆرێك لە شاعیرانی کوردیش بەو زمانانە شیعریان نووسیوە، بەڵام نالی بە زمانی کوردی شیعری نووسیوە و رۆحێکی تازەی کردووە بەبەر زمانی کوریدا، ئەوەتا لە شیعرێکدا نالی شانازی بە زمانی کوردییەوە دەکات و دەڵێت ...

تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکــا

ئیمتیحانی خۆیە مەقسوودی، لە عەمدەن وا دەکـــا
با لە مەیدانی فەساحەتدا بە میسلی شەهســـــــوار
بێ تەئەمول بەو هەموو نەوعە زبانی ڕادەکـــــــا
کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردی یە خۆ کردی یـە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکـــا
بێتە حوجرەم پارچە پارچە موسوەدەم بکرێ بە ڕۆح
هەر کەسێ کوتاڵ و پارچەی بێ بە دڵ سەودا دەکا
شیعری خەلقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکـی
کەی لە دیقەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکـــا

مامۆستا مەلا عەبدلکریمی مودەڕیس لە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی دیوانی نالیدا بە وردی ئەم شیعرەی سەرەوەی لێکداوەتەوە کە من لێرەدا تەنها لێکدانەوەی دوو کۆپلەی یەکەم و کۆتایی دەخەمە بەر چاوی قوتابیان کە باس لە گرنگی و خۆشەویستی نالی دەکات بۆ زمانی کوردی:" زەوقی شیرینی من کە بەلای ئەوەدا ئەچێ بە کوردی شیعر بڵێ، لەبەر ئەوە نییە کە کوردییەکە ئاسانە و دەستەڵاتی بەسەر عەرەبی و فارسیدا ناشکێ، بەڵکو لەبەرئەوەیە ئەیەوێ خۆی تاقی بکاتەوە بزانێ شتێکی تازەی لە دەست دێ لەمەوپێش کەس نەیکردبێ کە شیعر وتنە لەسەر عەروزی عەرەبی بەزمانی کوردی، یا نە ؟...

شیعری خەڵکی هەرگیز لە ناسکیدا ناگاتە ڕادەی شیعری من. شیعری من لە چاو شیعری خەڵکیدا وەك تاڵی ئاوریشم وایە لە چاو پەتکدا و پەتکیش هەرگیز ناتوانێ لە بارێکی وا ناسکیدا بەربەرەکانێ لەگەڵ ئاوریشم بکا."

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە نالی چەندە زمانی کوردی لا جوان و خۆشەویست بووە. لە شیعرێکی دیکەیدا، نالی، زمانی کوردی دەخاتە ریزی زمانی عەرەبی و فارسی کە لەو سەردەمەدا زمانی شیعر و غەزەل و دەوڵەتانی گەورەی ناوچەکە بوون. نالی جگە لەوەی بە زمانی کوردی شیعری نووسیوە، هاوکات بە زمانی عەرەبی و فارسیش شیعری نووسیوە، بۆیە خۆی بە پاشای هەرسێ زمانەکە دەزانێت، لە شیعرێکیدا بە شانازییەوە ئەو هەستەی خۆی دەربڕییەوە :

فارس و کورد و عەرەب هەر سێم بە دەفتەر گرتووە (نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە، دیوانی هەیـە

هەر لەم پەیوەندیەدا لەگەڵ گرنگی زمانی کوردی و نووسین بەو زمانە، شاعیری نەتەوەپەروەری کورد، حاجی قادری کویی، ئاواتەخواز بووە کە کاشکی هەر لە زووەوە کورد بە زمانی خۆیان بیانووسیایە تا مێژووی کورد و پاشا و کەسایەتییە گەورەکانی کورد ناویان ون نەبوایە :

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز　　　بە کوردی گە بنوسرایە زمانـــی

مەلاو و میر و شێخ و پادشامـــان　　　هەتا مەحشەر دەما نام و نیشانی

یەکێك لە بەناوبانگترین شیعرەکانی نالی ئەو شیعرەیە کە بۆ (سالم) ی نووسیوە و ئەویش وەڵامی دەداتەوە، ئەو دوو قەسیدەیە بە ناوی (دوو نامەکەی نالی و سالم)ەوە ناوبانگیان دەرکردووە. نالی ئەو قەسیدەیەی وەکو نامەیەك بۆ سالمی هاوڕێی نووسیوە و باسی دوورە وڵاتی خۆی لە شام دەکات و هەست و تاسەی دووری نیشتمان و شارەزوور و سلێمانی کە لە لایەن عوسمانییەکانەوە داگیرکرابوو، دەردەبڕێت. (عەبدالرحمن سالم)یش لە وەڵامدا شیعرێکی بەرزی بۆ دەنووسێت و هەردووکیان بە خەیاڵ و بە (با) دا، نامەکانیان دەنێرن.

نالی بەم شێوەیە قسیدەکەی دەست پێ دەکات:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مـروورووەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شـــارەزوور

ئەی لوگفەکەت خەفیو هەوا خواه و هەمدەمـــە!　　　وەی سروەکەت بەشارەتی سەر گۆشەیی حوضور!

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بەم شێوەیە ئەو دوو بەیتە شیعرەی شیکردۆتەوە و دەڵێ: نالی لە ڕێگای (با)ی تیژڕەوەوە نامەکەی دەنێرێت و پێی دەڵێت ( خوا بمکا بە قوربانی تۆزی ئەو ڕێگایەی تۆ بەسەریا ئەڕۆی، تۆ شارەزای هەموو کون و کەلەبەرێکی شاری شارەزووری و ڕێت لێ ون نابێ، بڕۆ ئەم نامەیەم بۆ بگەیەنە و هەواڵم بۆ بپرسە و بزانە...) . نالی بەو شێوەیە تاسەی دووری خۆی و دوورە وڵاتی دەکاتە هەوێنی ئەو شیعرە بەرزە کە ( هەڵقوڵاوی ئاخ و دەنگدانەوەی ژانی دەروونی خۆیەتی ).

## نالی و شیعری ئەڤینداری

نالی وەکو هەر شاعیرێکی دیکە شیعری ئەڤینداریشی نووسیوە بە تایبەتی بۆ خۆشەویست و دڵبەرەکەی (حەبیبە). تەنانەت کاتێك کە خۆشەویستەکەی لێی جیا دەبێتەوە ئەگەرچی نازانرێت ئەو جیابوونەوەیە بە هۆی مردنی خۆشەویستەکەیەوە بووە

یانیش (حەبیبە) نالی بەجێهێشتووە و نەیویستووە لەگەڵی بێت، شیعرێکی نووسیوە کە لە دوای (حەبیبە)کەی پێی وابووە کە ئیتر سلێمانی کەسی تێدا نەماوە:

هەتا تۆم ئاشنا بوویت ئاشنا بـــــووم
ئەمێستا موو بە موو ئەغیارە بێ تـــــۆ

لە کن من با وجوودی ناس و ئەجنـاس
کەسی تێدا نیە ئەم شارە بێ تـــــۆ

هەموو ڕۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمســـاڵ
تەمەنناى مردنی پێرارە بـــێ تـــۆ

لێکدانەوەی ئەو شیعرە: تا تۆ دۆست و ئاشنام بوویت هەموو کەسم هەبوو، ئێستە کە تۆ نەماویت هەموو کەسم لێ بووتە بێگانە، لەگەڵ ئەو هەموو مەردمەشا (خەڵکەدا) کە لەم شارە- سلێمانی- دا هەیە هەر لەبەرئەوە کە تۆ نەماوی کەسی تێدا نیە، لەبەر ئەو کۆچە کە ئیمساڵ تۆ کردت داوای مردنی پێرار ئەکەم، چونکە پێرار لەبەرئەوەی بە تۆ شاد نەبووبووم، هەموو دەمێك ئاواتی مردنم ئەخواست، ئێستە کە تۆ نەمایت کەوتوومەتە داوا کردنی ئەو مردنە. ”

نالی هەر بۆ حەبیبەی دڵبەری، شیعرێکی دیکەی نووسیوە کە تێیدا باسی خێلی یارەکەی دەکات و وەك دەزانرێت لە ناو کوردەواریدا خێڵ بوون وەك عیبەیەك تەماشا دەکرێت بەڵام نالی هێندە جوان وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە تانە لە یارەکەی دەدەن و دەڵێت:

پێم دەڵێن: مەحبوبە خێل و قیچە، مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە، یا ترازوی نازی نەختێ سەر ئەکـــا
خێل و قیچە، یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چـــاو
مەیلی ڕاست هاوێتنی موژی دڵ پەی کەر دەکـــا؟!

دیسان بۆ لێکدانەوەی ئەم شیعرە دەبێت پەنا بۆ لێکدانەوەکەی مامۆستا مەلا عەبدلکریمی مدرس ببەین کە دەفەرموێ: ناحەزان پێم ئەڵێن خۆشەویستەکەت خێل و چاولارە، خێسە لە خەڵکی ئەکات وەك بڵێی شەڕیان پێ بفرۆشێ. نەخەیر نە خێلە و نە خێسە لە کەس ئەکات .. تەنها ئەوەندەیە ترازوی نازی، کە چاویەتی، کەمێك سەر ئەکا و بەسەر لایەکا ناز زۆرتر ئەکا تا بەسەر لایەکی ترا .. سەرکردنی ترازو ئەوەیە کە هەڵی ئەبڕی هەردوو سەرەکەی هاوسەنگ نەبن.

لە کۆتایدا دەتوانین بڵێین کە شیعرەکانی نالی چەند لایەنێکیان لەخۆ گرتووە وەکو ئەڤینداری، وەسفی سروشتی کوردستان و شیعری خواپەرستی و پیاهەڵدان و لاواندنەوە.

بەداخەوە نالی وەکو زۆر نیشتیمانپەروەری دیکەی سەردەمی خۆی و دوای ئەویش، لە دوورە وڵاتیدا کۆچی دوایی کردووە و گۆرغەریب بووە. بۆیە تا ئێستایش بەتەواوەتی کاتی مردنەکەی ساخ نەبۆتەوە، بەڵام نالی هەمیشە بەشێکی گرنگی لە لاپەڕەی ئەدەبیاتی کوردی لەسەرخۆی تاپۆ کردووە .

**یەکێ لە پارچە هەڵبەستەکانی نالی .....**

لــــــە دڵدا ئاتەشی عیشقت بلێسەی میسلی تەندورە
شـەتی ئەشکم نەبێ مانیــع، دەسوتێم دەبمە کۆی نوورە

بە نـاری عیشق و ئاوی دڵ، جەسەد وەك حەزرەتی موسا
تەریقی: بەحـــــــری فیرعەون و، ڕەفیقی ئاتەشی توورە

دەچێ بۆ لای ڕەقیب خۆشە، وەلێ ئەو داخــە کوشتومی
لە کــن ئەو چەندە مەجبورە، لە لای من چەندە مەغرورە

پەیامت هـــات و پەیکت ڕۆی، خـەیاڵم ناردوو نەیگەیێ
ڕەسوڵم کــــــەوتە ڕێ، گرتی، هێنای وەك ئاگرە سورە

کە دیتـــم شکلی سەد ڕەنگی، گوتم: بابایی عــەیارە
کە بیستم لەفزی یێدەنگی، گـــــوتم: شەیپوری شاپوورە

گـوتم:ڕاستی سەبـــا هەڵسە، گوتی: مەشرەب موخالیفە
گـــــــوتم: ناری، گـوتی: بایە، ئەوجێ، گوتی: دوورە

گـوتم: قوربانی تۆ من بم، گوتی: قوربانی تۆ سەگ بێ
گوتم: شیشەی دڵـــم ناتوێ، گـوتی: بۆ چیمە، مەکسورە

خـــەراباتی دڵی (( نالــی )) مە فەرموو: خاڵیە، نـایەم
بــە مەرگی تۆ قەسەم، چاوم! بە زیکرت بەیتی مەعموورە

**هەڵبەستێکی هۆنراوەکانی نالی ....**

تا لە من ئەو زوڵفە ڕێی بۆسە و کەناری گرتـــــــــووە
ناو دەمم بێ شوبهە تامی زەهری ماری گرتـــــــــووە

خۆش لەسەر سینەی سەری هەڵداوە دوو گۆی سەر بە مۆر
مات و حەیرانم کە عەرعەر کەی هەناری گرتـــــــووە!

ئەژدەهای زوڵفی لە دەوری گەنجی حوسنی حارسـە
حەڵقە حەڵقە، چین بە چین، سەر تا بە خواری گرتـووە

ماهی من تەنها مەهێکە صەد نوجوومی مەحو کـــرد
یاری من تەنها گوڵێکە صەد هەزاری گرتـــــــووە

دامەنی پاکی مەداری دائیرەی خامەك نیـــــــە
خوێنی مەقتولانە وا دامێنی یاری گرتـــــــــووە

گەرد و بادی هیجری تۆ وا عالەمی لێ کردمە تـــۆز
نەك دوو چاوم، بەڵکە حەتتا دڵ غوباری گرتـــووە

شەربەتی عوننابی لێوی شەککەر و بادامی چـــاو،
سەروی قەددت ڕاستە ئەنواعی بیماری گرتـــووە

لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە، شەککەر باریـــە
لێوی میحنەتباری من بێ ئاوە، باری گرتـــووە

پڕجەفایە، بێ وەفایە، زود جەنگە، دێر صوڵـــح
صەد دریغ و حەیفە گەبعی ڕۆزگاری گرتـــووە

یادی (کانی دەدم) و سەرچاوەکەی (میکوڕ) دەکا
(بەکرەجۆ)ی چاوم کە شێوەی (سەرچنار)ی گرتووە

بێ مەحابا ئاو دەرێژێ گەه بە فەور و گەه بە دەور
چاوی من موددێکە شێوەی ئابشاری گرتـــووە

شەمعی بەزمی من کەوا سوتاوە، زەرد و ئەشك ڕێژ
قەت نییە فەردێك نەڵێ ڕەنگی مەزاری گرتـــووە

موددەعی زەجرم دەکات و، پێم دەڵێ: صەبرت بێ
کەر بە لەعنەت بێ کە کەی عاشق قەراری گرتووە!

(نالی) وا دائیم کە مەشغوڵی فوغان و ناڵەیـــە
باعیسی هیجرانی یارە دڵ شەراری گرتـــووە

**چەند بەشێك لە هەڵبەست و هۆنراوەکانی نالی ....**

بۆچی نەگریم صەد کەرەتم دڵ دەشکێنـــی
بۆ مەی نەرژێ شوشە لەصەد لاوە شکـــاوە

هەر جۆگە و جۆ باریٚ کە سوور وسوێربـــیٚ
جێی جۆششی گریانی منەو خوێنـــە رژاوە

هەرچەندە کە ڕووتم بەخودا مایلی ڕووتـــم
بیٚ بەرگیە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتـــاوە

نزا ستایش :-

بەقوربانی عولومی ئەوەلین وئاخرینت بـــــم
لەگەڵ نەسراوی قورئانی کەوا ئەڵگافی سوبحانـــە

مورادم زیللەت و پارانەوەی حاڵە نەوەك نەعتـــە
بەچەند بەیتیکی کوردانە کە قورئانت پە ناخوانـــە

ئەگەرچی کوردی دەوری شاررەزووری قەسوەتم ئەما
وەسیلەم گـیە وحیلمی شەفیع و فەچلی مەننانـــە

بەسەر هاتووەمە ئەو خاکە کە هەر میقالە زەررێکـــی
بەمیزانی شەفاعەت کێوی عیلم و بەحری غوفرانـــە
..........

ماهی من تەنها مەهێکە سەد نوجوومی مەحو کـرد
یاری من تەنها گوڵێکە سەد هەزاری گرتـــووە

دامەنی پاکـی مەداری دائیرەی خامەك نیـــە
خوێنی مەقتولانە وا دامێنی یاری گرتـــووە

گەرد و بادی هیجری تۆ وا عالەمی لیٚ کردمە تـۆز
نەك دوو چاوم، بەڵکە حەتتا دڵ غوباری گرتـــووە

شەربەتی عونتابی لێوی شەککەر و بادامی چـــاو
سەروی قەددت ڕاستە ئەنواعی پیماری گرتـــــووە

لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە، شەککەر باریـــــە
لێوی میحنەتباری من بێ ئاوە، باری گرتـــــووە

پڕجەفایە، بێ وەفایە، زود جەنگە، دێر ســـــوڵح
سەد درێغ و حەیفە تەبعی ڕۆزگاری گرتـــــووە

یادی (کانی دمدم) و سەرچاوەکەی (میکوڕ) دەکا
(بەکرەجۆ)ی چاوم کە شێوەی (سەرچنار)ی گرتووە

بێ مەحابا ئاو دەڕێژێ گەه بە فەور و گەه بە دەور
چاوی من موددێکە شێوەی ئابشاری گرتـــــووە

شەمعی بەزمی من کەوا سوتاوە، زەرد و ئەشك ڕێژ
قەت نییە فەردێك نەڵێ ڕەنگی مەزاری گرتـــــووە

موددەعی زەجرم دەکات و، پێم دەڵێ: سەبرت بێ
کەر بە لەعنەت بێ کە کەی عاشق قەراری گرتـووە!

(نالی) وا دائیم کە مەشغوڵی فوغان و ناڵەیـــــە
باعیسی هیجرانی یارە دڵ شەراری گرتـــــووە
.........

یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ لە گریانـــــی دەوێ
ئاری ئاری گوڵ لە باغان ئاوی بارانـــــی دەوێ

هەر کەسێ ڕوی تۆ دەبینێ خۆی بە قوربانت دەکـا
چونکە ئەبرۆی تۆ هیلالی عیدە قوربانـــــی دەوێ

... ئاو لە چاوانم بە خوڕ دێ ئاگری دڵ ناکوژێتەوە
وەك جەهەننەم ئەم تەنورە ئاوی تۆفانـــــی دەوێ

عەشق سوڵگانێکە هەر گا ڕو لە وێرانێ بکـــــات
ئاهی سەرد و ئەشکی گەرم و قەلبی بوریانی دەوێ

دور لە تۆ دڵ هێندە بێ ئارام و بی حاڵ کەوتــووە
ئەی مەسیحای عەصر ! لەو لێوانە دەرمانـــی دەوێ
ڕوم ئەوا زەرد بو وەکو پایز لە هیجران ((نالیـــا))
عەشق ئیستاکەش لە من سەیلی بەهارانـــی دەوێ
.........
دووری لەمن خستەوە بێ سەبەبێ یاری مـــــن
باری خودایا کە تۆ بگری سەبەبکاری مـــــن !
مەستی خەیاڵی ئەوە ، لەحزە ژمێری شـــــەوە
دوژمنی خوێنیی خەوە ، دیدەیی بێداری مـــــن
دیدە نیگەهبانی یار ، تیپی سروشکم هـــــەزار
ناڵەیی دڵ نەی سەوار ، ئاهە عەلەمداری مـــــن
گریە بەخوڕ دێتە خوار، هەروەکو عەینی بەهـــــار
خۆش بووەتە ئابشار مەدمەعی سەرشاری مـــــن
دولبەری عالی دەماغ ، هەم قەدەمی سەروی باغ
بێتە نەزەرگەی قەراغ دیدەیی جۆباری مـــــن
حیکمەتی تۆ مولهەمە ، هەم قەدەمت مەرهەمـــە
موستەحەقی مەرهەمە سینەیی ئەفگاری مـــــن
شاهیدی عەدلە وەفا ، مەعدەنی سیدقە و سـەفا
هاتووە دەرمان بکا قەلبی برینداری مـــــن
ئەی تەلەفی گفتوگۆ ، جامیعی کیـــزب و درۆ
واعیزیە ئیشی تۆ ، عاشقیە کاری مـــــن
مەشرەبی (( نالی )) کەلێ ئابی و ترشە ، بەڵێ
موعتەریفە خۆی دەڵێ : چا نیە ئەتواری مـــــن
..........
بۆچی نەگریم صەد کەرەتم دڵ دەشکێنـــــی

بۆ مەی نەرژێ شوشە لەصەد لاوە شکـــاوە

هەر جۆگە و جۆ بارێ کە سوور وسوێربـــێ

جێی جۆششی گریانی منەو خوێنـــە رژاوە

هەرچەندە کە ڕووتم بەخودا مایلی ڕووتـــم

بێ بەرگیە عیللەت کە مەتیو مەیلی هەتـاوە

..................

**نالی لە چاوەڕێی دیداری مەعشوقەکەی دەڵێ:**

شەوی یەڵدایە، یا دەیجورە ئەمشـــەو

کە دیدەم دور لە تۆ بێ نورە ئەمشـــەو

دڵم وەك حاکمی مەعزولە، قوربـــان

خەڵاتی وەصڵی تۆی مەنقورە ئەمشـــەو

دڵیش مایل بە دیدەی تۆیە، بۆیـــە

لە من وەحشی و رەمیدەو دورە ئەمشـەو

کە تۆی شای کەج کولاهی دیدە مەستان

چ باکم قەیسەر و فەغورە ئەمشـــەو

لەخەو هەڵساوە، یا ئاڵۆزە چـــاوت

هەمیشە وایە، یا مەخمورە، ئەمشـــەو

سورشکم نەقشی چاوی تۆ دەکێشـــێ

جێکەم سەردارەکەی (مەنصور)ە ئەمشەو

موسڵمانان دەپرسن حاڵی نالـــی

لە کونجی بێ کەسی مەهجورە ئەمشـەو

## هەژار

## رۆژهەلاتی کوردستان

## ۱۹۲۱ ۱۹۹۱

هەژار ناوی عەبدولڕەحمانی شەرەفکەندییە و لە ساڵی ۱۹۲۱دا لە دایك بووە لە شاری مەهاباد خوێندوویەتی و بووەتە ڕووناکبیرێکی هوشیار و بەشداری لە دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی مەهاباد بە سەرۆکایەتی پێشەوا قازی محەمەد لە ۱۹٤٦.۰۱.۲۲ کردووە و کە ئەو کۆمارە ساوایەش دوای یازدە مانگ ڕووخێنراوە ، هەژار ڕووی کردۆتە کوردستانی باشوور و دواییش لە شاری بەغدا نیشتەجێ بووە و بۆ پایزی ۱۹٤۷ بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشی کە تووشی سیل بوو، دەچێتە لوبنان و دوای چاکبوونەوەی ماوەیەك لە سوریا دەمێنێتەوە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی ۱۹٦۱دا، مامۆستا هەژار دەچێتە پاڵ شۆڕشەکە بە سەر کردایەتی بارزانی.

کاتێکیش کە ڕێککەوتننامەی ۱۱ی ئاداری ۱۹۷۰ لە نێوانی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و میریع مۆرکرا، ناردرا بۆ بەغدا بۆ ڕێکخستنی کاروباری یەکێتی نووسەرانی کورد کە تازە لە ۱۹۷۰.۰۲.۱۰دا دامەزرا بوو، لە کۆنگرەکەی ئەو یەکێتییە بە سەرۆکی دەستەی بەڕێوبەر هەڵبژێردرا و لە هەمان کاتیشدا کرا بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری کورد و توانی لە ساڵی ۱۹۷۲دا پەرتووکی شەرەفنامەی شەرەفخانی بتلیسی لە فارسییەوە بکاتە کوردی و لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد چاپی بکات.

**پارچەیەك لە هۆنراوەکانی مامۆستا هەژار بە ناوی ( هەر کوردم ) ...**

| | |
|---|---|
| بە دەربەدەری یان لە ماڵی خـــۆم | لە خاکی عەرەب لە ئێـــران و ڕۆم |
| کۆك و پۆشتە بم، ڕووت و ڕەجاڵ بم | کۆشکم دەقات بێ وێرانە ماڵ بـــم |
| ئازا و ڕزگار بم شادان و خەنـــدان | یان زەنجیر لە مل لە سووچی زیندان |
| ساغ بم جحێڵ بم بگرم گوێ سوانان | یان زار و نزار لە نەخۆشخانـــــان |
| دانیشم لە سەر تەختی خونکـــاری | یـان لە کۆڵانان بکـەم هــــەژاری |
| کوردم و لە ڕێی خاکی کوردستـــان | سەرلەپێناوم گیان لە سەر دەستـــان |
| بە کوردی دەژیم بە کوردی دەمـرم | بە کوردی دەدەم وەرامی قـــەبـرم |
| بە کوردی دیسان زیندوو دەبمـــەوە | لەو دونیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە |

**لێرەدا جێی خۆیەتی بزانین بیروڕای مامۆستا هەژار سەبارەت بە خەییام چی بوە:**

مامۆستا له پێشەکی کتێبی((چوارینەکانی خەییام))دەڵێ:(( ئەو کەسانەی که خۆیان به خەییام ناس دەزانن گەرەکیانه چوارینەکانی بەرده شۆرکەن وئەوەی خۆیان به دڵیانه بیدەنەپاڵ خەییام که ئیشێکی باش نییه چونکه پیاوێکی وا گەوره قسەی خۆی ناخواتەوه خۆی له شتێك بۆنی کفری لێ بێ نزیك ناکات ئەو کەسانه سەر له خوێنەر دەشێوێنن که کامیان هین خەییامه وکامەیان نییه باشتر وایه بێن لێکیدەنەوه وه بزانن چی وتوەو مەبەستی چیه؟ با خوێنەر تێ بگا)). به داخەوه مێژونووسان باش پێمان ناڵێن که له رابردودا چ بووه؟چون بووه؟یان له ترسان یان له برسان که بوه به هۆی ئەوەی هەزاران ئەفسانه وشتی عەجایەب سەبارەت به روداوەکانی رابردوو بگەیێت به ئێمه که وەکوو دەڵێن خەییام دژ به خوا بوەو رووی رەش بوەو له دوای تۆبه خودا لێی بوراوه.

خەییام خۆی ناوەته دەریای سەرگەردانی که زانا ونەزان وەك یەکن و ئەو کەسانەی که بوون به مۆمی دۆستان وبۆیان داگیرسان نەیانتوانی رێ دەربڕن و هەر کەسێ لەم دەریایه شتیکی هەڵ داوه جا چ جوانه که سوقرات دەڵێ:(( من دەزانم که نەزانم بەڵام خەڵکی نازانن که نەزانن)). خەییام دەڵێ که نەزانم وبه داخی ئەوه دەژی که خەڵکی تێی ناگەن وادەزانن که دەزانن و هەر ئێشێ بکەن بۆی داناچن وەکوو خواردنیماڵی هەژاران و مەنعی خەییام دەکەن که بۆ مەی شیعر دەڵێ هەر ئەوه که دەڵێ ئاخ خۆزگه دزی ودرۆش مەستی دەکرد ئەمجار پیاوم گەرەك بو بڵێ وشیارم.یان دەڵێ گوناحی خواردنی خوێنی ترێ زیاتره یان خوێنی هەژار

خەییام و مەی: مامۆستا هەژار دەڵێ ئەو خەییامه که خاوەنی ئەم هەمو بیرو عەقڵەیه و فەیلەسوف بوەو زۆر کتێبی زانستی نوسیوه وتەنانەت رۆژ ژمێری دروست کردوه چۆن دەبێ بڵێین ئەونده سەرخۆش بوه که خستویانه ناو سەبەتێك و بردویانه بۆ کۆڕی زانایان بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوه چۆن ئەو ئینسانه له کونجی مەیخانه بوه دەڵێ خەییام یا مەی نەخواردوه یان یەك کەرەت بۆ تاقی کردنەوەی بوه کەبزانێ ئەوەی شاعیران ناوی دەبن و مشایەخ دەڵێن چییه وچۆنه. خەییام سەرخۆشی لەو هوشیاریه پێ باشتره که به شتی پوچەوه خەریك بن و نەزان بن.پیاو مەست بێ وبێ خەبەر بێ نەك به ئەغیاری ئابروی دین و زانین بەرێ.

پۆختەی مەبەستی خەییام ئەوەیه که به زانین وژیرانه بژین و خومان نەکەین به کەڕ وکوێر و ئەم کورته ژیانه به دەرفەت بزانین و کەڵکی لێ وەرگرین به خۆشی نه ڕق ورژدی.

خەییام خوای ناسیوە کە هەموی بەزەیی و جوانیە و چاوی لە نوێژ و ڕۆژو نییەو وازی لە تۆڵەسەندن وکوشتن و برژاندن و کەلاك هەڵ واسین و رشتنی فرمێسکە کە ئەوکەسانەی کە شتیوا دێننە بەرچاو کە خوا جندرمەیەکە بە هەڵەچون.

هەژار بیروبڕوای خەییامی بە جوانی زانیوەو هەر ئەوە بوە بە هۆی ئەوە کە جیا لە شاعیرەکانی‌تری بزانێت ئەو بۆ وەرگێڕان هەڵ بژێرێ کە شیعرەکانی مرۆڤ دوستانەیەو چەقاوە بە دڵی مامۆستای چەوساوە.

لە ساڵەکانی ٤٥ تا ٤٧ کە م کەم دەستی بە وەرگێڕانی کردووە تا دوو سەدوپەنجا دانەی وەرگێڕاوە لە ساڵی ٥١ دا لە چاپی داوە تا ئێستە چەند جار چاپ کراوەتەوە هەر چەند دەڵێن لە وەرگێڕاندا بە تایبەت شیعر لێی هەڵدەوەرێ وجوانییەکەی کەم دەبێت بەڵام وەرگێڕانی مامۆستا هەژار ئەوەندە بەرزە کە پیاو ڕاست بڕوا لە برێ شوینا لە زمانی رەسەنی شیعرەکە خۆش‌ترە .هەر وەها مامۆستا وشە بەوشە هەڵی نەگێڕاوەو مەبەستی خۆی گەیاندووە جا لێرەدا چەندانەی دەڵێم ئێوە کڵاوتان کەن بەقازی.

| | |
|---|---|
| هر چند که رنگ و روی زیباست مـــرا، | چون لاله رخ و چو سرو بالاست مرا |
| معلوم نشد که در گربخانه خــــاك | نقاش ازل بهر چه ئ‌راست مـــرا؟ |
| هەر چەندی بڵێی بە بەژن و باڵا جوانــم | ڕوومەت گوڵ و چاوکەژاڵ و لێو قەیتانم |
| وەستایێ کە وای لە خاك و گڵ دارشــتم | نیازی لەمە چی بووا بۆچی کرد؟نایزانـم |
| پیری دیـدم بخانـــه خمــــــاری، | گفتم: نکنی ز رفتگان اخباری ؟ |
| گفتا، می خور که همچو ما بسیــــاری، | رفتند و کسی باز نیامد بـاری ! |
| دیم پیرێ لە مەیخانە سەری دەخـــولاوە | وتم ناترسی؟کە بەری چت بۆماوە؟! |
| فەرمووی وەرە پێداکە،گەلێ وەك من و تۆ | ڕۆیشتن و کەس نەهاتەوە لـەو لاوە |
| این کوزه چو من عاشق زاری بوده اســت | در بند سر زلف نگاری بوده اســــت |
| این دسته که بر گردن او مـــی بینـــی: | دستی است که بر گردن یاری بوده است! |
| ئەم گۆزە وەکوو من بووە، دڵدار و هـــەژار | جارێکی دڵی خۆش بووە، سەدجار خەمبار |
| ئەو هەنگڵ و دەسگرەی لە ملیا دیوتـــە | دەستێ بووە زۆر خراوەتە سەر ملی یـــار |

بەرهەمە چاپکراوەکانی مامۆستا هەژار

- قورئانى پيروزبه كوردى(ترجمه قران مجيد)
- چيشتى مجيور
- ئاله كوك(برگ سبز)
- روابگ فرهنگى ايران ومصر
- به يتى سه ره مه ر
- ترجمه قانون درگب اپر ابوعلى سينا
- مه‌م وزين(ترجمه از كرمانجى به سورانى)
- ترجمه اپارالبلادواخبارالعبادزكرياقزوينى از عربى به فارسى
- بو كوردستان
- فرهنگ لغت كردى به فارسى(هه نبانه بورينه)
- شه ره فنانه (ترجمه شرفنامه بدليسى ازفارسى به كردى)
- تاريخ سليمانيه
- چارينه خه يام(ترجمه رباعيات خيام)
- هوزى گاوان
- ميژوى ئه رده لان(تاريخ اردلان)
- په يك له په ناى خال وسيفرى بى برانه وه
- دايه ، باوه ، كى خراوه؟
- شه رحى ديوانى مه لاى جزيرى
- بيره وه ريه كانى ژيانى(زندگى نامه

**هۆنراوه بەناوبانگەکەی مامۆستا هەژار بە ناوی ( هەڵۆ)**

پاييزەدار و دەوەن ڕەنـــگ زەردە با تە زو سە ردە بە تۆز و گـــەردە
ديارە لای شەختەيە ناخۆش خـەوەریٚ‌دارە خۆی دەرِنیٚ خەزلٚ هەڵدەوەریٚ
هەورە ڕەش پۆش و بە گريە وناڵـــە سەرەتای شيوەنی مەرگی ســـاڵە
بە گژە ی سەردی هەناسەی کەژو کـۆ ژينی خۆی هاتە وەبير پيرە هــەڵۆ :
داخەکەم بۆ گوڕ و تينی جوانيــــم ئەو دەمەی چوخن وچبووم بۆ وانيـم ؟
هێزو سۆمای نيە بــــاڵ وچـــاوم مامە وە گردە نشيـــن بــیٚ ڕاوم
دووره گۆشت پۆرو کەوم وردە کــەوم گۆشتە نێچيرێ مەگەر بێتە خــەوم
وا هە ڵۆی مـردنە ڕاوی کـــــردم ڕاو بە تا ڵی منە هاکا مــــــــردم

مردنیش هێندە نە سووکە و ســـــانا سە ری لیّ گێژە هـــە زاران زانــا
چم بە سەردیّ کە نەمام ومـــــــردم پە ڕی بەربایەك وخۆڵـــــــی وردم
گیان بەرە وکویّ دە فڕیّ ڕوون نیە بۆم          تۆ بلّێی بچمەوە لای باوە هە ڵـــۆم!
تو بلّێی ڕاویّ هەبیّ لەو بـــــەرزە ! پاش هە موو چەرمەسەری ئەم عـــەرزە
داخم ئەو ڕازە لە بن ســـــــەرپۆشە سەفەری نا بەڵەدی ناخۆشـــــــە
دلّ و د یەمم کـــــە بە دونیا فێرە چەندی پێم بکریّ دەمێنم لێـــــرە
ژین گەلیّ شیرینە فیزی نـــــــاویّ بۆ مەبەست سەردە نەوێنم تــــاویّ
چاری ئەم دەردە لە لای قـــــالاوە گەرچی زۆر پیرە بە لاوی مــــاوە
دەچمە لای و بە وەچم لیّ نـــــایە ڕەشیە وناوی ژیـــانی لایـــە
سەر نەوی دای لە شەقەی شـــابالاّن هاتە وێرانە یەکی جـــــیّ مالاّن
بوو بە میوانــی قە لیکـــــی ڕووڕەش چەپەلّ و ڕژد و لە مەردی بـــیّ بەش
قە ل قڕی لێم مەیە پێـــش زۆرداری خوا شوکر زۆر بە کەنەفتی دیــاری
زوو بە چیت لێم گەرە کـــە پێم بێژەدوور لە من بگرە لەشم بە نــــوێژە
وتی : ئەی لالە قەل ی هــــەر لاوم پیرم و زۆر لە مەرگ ترســـــاوم
هە مە پرسێك و دەبـــــیّ بمبووری هۆی چیە تۆ کە لە مـــردن دووری !
وە ك دە ڵێن ئێوە بە چل ســالّ باڕن تووشی تووش نا یەن وکۆســـپ وبارن
ڕێیەکم پیّ بلّیّ بۆ هەرمانــــــــم تووی لات دەست دەکەویّ دەرمـــانم
سوێند ئەخۆم پاشی هەتا بشمێنـــــم هەرکەویّ ڕاوی بکەم بۆت بێنـــــم
قەل گوتی : هۆزی هەڵۆ زۆر خـــاوین          سەیرە لام چۆنە کە خاوەن نـــاوین
با بو کاکت بە نەزانی مـــــــردن بیری سە ربەرزیە وای لیّ کـــــردن
هەرکەسیّ بەرزە فڕە زوو دەمـــــریّ بای بلّندایی سەرو دلّ دەگـــــریّ
مالّی ئێوە کە لە لووتکـــــەی کێوە لای جـــن و دێوە بەلاّی زۆر پێـــوە
خوێنە پۆڕ پورکی دەخاتە خـــــوێنیّ گۆشتی کەوی تازە گرفتی دێنـــــیّ
جگەر و سی و دلّی مامر ژەهــــــرە تا وەها بی تەقەلات بیّ بەهـــــرە
دەتەویّ زۆر بژی خۆش ڕابوێـــــری خۆ لە پەندم گەرەکە نە بوێـــــری
وەرە وەك ئێمە بژی نزم ونـــــەوی شەولە سەرگەندەڵە دارێك دەخـــەوی
خواردنی باشی کە تۆ نە تـــــدیوە گۆشتی بارگینی گەنی و توێیـــــوە
کردنی چینە لە پەین و شیاکـــــە تاو و تینی لەشە بۆ دلّ چاکـــــە

پەندی با پیرە بە میرات ماوە  خوێنی زامی کەرە، سۆمای چاوە

گفتی من کەوەمەرە بۆت هەڵڕێژم تاقە دوو  ڕێت لە بەرە پێت بێژم

یان لە ناو بۆگەن و نزمایی ژیان یان بە سەربەرزیەوە  بسپێرە گیان

ڕاچەنی لەم وتەیە  پیرە هەڵۆ هاتە بەر چاوی گەلێ کەند وکۆ

کەوتە ناوگێژی خەیالات وخەمان مان ئەگەر  وابێ چ شیرینە نەمان

وتی : پیرۆز بێ لە خۆت ئەم ژینە جە ژنی تۆ بۆ  مەشەپۆڕ و شینە

کێ بە سەربەرزی ژیا بێ  تاوێ ژینی قالاوی بە پووشێک ناوێ

چاوە ڕێی مەرگە گیان با بیبا پەڕو باڵم لە چیا با بیبا

بە هەڵۆیی کە لە ژین بێ بەش بم نەك هەزار ساڵە  قەلی ڕووڕەش بم

بۆ  شتێك ئێستە لە خۆم بێزارم  من هەڵۆ بۆ چی بە تۆ بوو کارم !

مەرد ئەگەر کاری بە نامەردانە دەردی سەر باری هەموو دەردانە

کەوتە خۆ دای لە شەقەی باڵ دیسا ئاگرێکی لە دەروون دا بیسا

ڕاستە خۆ بۆ  سەر هەر  بۆ سەر چوو هەردی بەجی هێشت ولە هەوران دەرچوو

قەل هەزار ساڵ ژیا  بەو تەرزە  سەر نەوی، هێشتا  هەڵۆ هەر بەرزە

## ئەحــمــەدی خــانــی

## باکوری کوردستان

( ١٠٦١ – ١١١٩ کۆچی ) ( ١٦٥١– ١٧٠٧ زاینی ) .

شاعیر و نوسەر و رۆشنبیری گەورەی کورد ، هۆنراوە بێژ و شیعر چری نەتەوەی کورد بووە ، ئەو کەسەیە بوێرانە بۆ خزمەت بە نیشتیمان و زوبانی نیشتیمانەکەی هۆنراوەی بە کوردی خوێندووە ، ئەو زانایە بوو ئاینەکەی توانی رێگەی قەومییەت و نیشتیمانییەتی پێ بدۆزێتەوە و بۆ یەکەم جار بە زوبانی شیرینی کوردی وەك شاعیرێکی کوردی هۆنراوە بنوسێت و خۆی بخاتە نێو شاعیرانی زوبانانی تر .

ئەحمەدی خانی لەیەکەم کەسانێك دادەنێن کە لەسەر کوردایەتی و نەتەوەخوازیی کوردی نووسیویەتی ، بەناوبانگترین بەرهەمی پەرتوکی هۆنراوەی (مەم و زینە) کە چیرۆکێکی دڵدارانە دەگێڕێتەوە لە ساڵی ١٦٩٢ بە شێوەزاری کرمانجی نوسراوە .

### ژیاننامەی

ناوی ئەحمەدی کوری ئەلیاس کوڕی رۆستەم بووە ، لە ساڵی ١٠٦١ کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٦٥٠ یان ١٧٥١ زاینی لە دایك بووە ، نازناوی شیعری لە هۆزی خانیان وەرگرتووە ، بەشێکی ئەم هۆزە لە دەروبەری ناوچەی بۆتان بوون ، بەڵام بنەماڵەی شاعیر باریان کردووە بۆ شاری بایەزید .

لە مەم وزینەوە بۆمان دەردەکەوێت خانی لە جزیرە ژیاوە یەکێ بووە لە مەلا گەورەکانی سەردەمی خۆیی و شارەزاییەکی چاکی لە فەلسەفە و زانستەکانی دیکەدا هەبووە ،لە دێڕێك لە هۆنراوەکانیدا باسی لە دایکبونی خۆی دەکات ودەڵێ :

لەورا کو دەما ژ غەیبێ فەك بوو ....... تەئریخ هەزار و شەست و یەك بوو

ئی ســال کهشتە چل ئو چــاران ....... وی پێشـــرەوی گـــوناهکـــاران

واتە : ئەو ساڵەی کە لە پێوارەوە من بووم مێژووی ١٠٦١ بوو لە ساڵی ١١٠٥ لە چیرۆکی مەم و زین بوومەتەوە ، کەوابوو ئەحمەدی خانی لە ساڵی ١٠٦١ ی کۆچی لە دایك بووە و لە ساڵی ١١٠٥ ی کۆچی لە چیرۆکی مەموزینەکەی بووەتەوە ، بەڵام بۆ ساڵی مردنەکەی دیار خۆی نەیتوانیوە ئاماژەی پێی بکا ، بە پێی قسەی مامۆستا سوجادی لە پاڵ پەڕاوی ( صمدیە) دا لە ساڵی مردنی خانی بە پیتی ئەبجەد نوسراوە کە دەڵێ ( گار خانی الی ربە ) کە

دەکا ١١١٩ ی کۆچی و بەم چەشنە خامی لە ساڵی ١٠٦١ لە دایك بووە لە ساڵی ١١١٩ لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە .

وەك لە سەرچاوەکانی ژیانی و کردەوە ئەدەبییەکانی شاعیر دەردەکەویَ باب و باپیرانی لە رووی داراییەوە ژیانیان ئاسان بووە و بە بەختیاری ژیاون .

ئەحمەدی خانی هەموو ژیانی بۆ خوێندەواری و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری و هۆشیاریی سیاسی خەرج کردووە لە کۆمەڵی کوردەواریدا .ئەمە دوو لایەنی رووناکی بووە ، یەکەمیان بەرهەم هێنانی داهێنانی ئەدەبی ، واتە شیعری ، دووەمیان فێرکردن و پێگەیاندنی منداڵان و لاوی کورد لە رووی خوێندەوارییەوە .

شاعیر لە مەڵبەندی لە دایکبوونی ، شاری بایەزید ، لە ساڵی ١٧٠٧ زاینی و ١١١٩ کۆچی هەر لەو شارەدا کۆچی دوایی کردووە و لەوێیش نێژراوە .

## کوردایەتی و زمانی کوردی

لە پەرتوکی (دیالۆگ – رۆژهەڵاتی ناوەراستدا نوسراوە ئەحمەدی خانی هەر لە سەرەتاوە دەیزانی کە کەلووپەلی کوردی بازاڕیان نییە ، واتە ئەو پەرتوکانەی کە بە کوردی نوسیبوونی نەیاندەتوانی بگەنە ژمارەیەکی زۆر خوێنەر ) ئەمەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە : لەلایەك ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئەحمەدی خانی تێدا دەژیا ، بەشی هەرەزۆریان نەخوێندەوار بوو و لە لایەکی دیکەوە زمانی نوسین و خوێندنی ئەو سەردەمە زیاتر بە زمانی عەرەبی و فارسی بوو ، نوسەرانی رۆژهەڵاتی ناوین بە نوسەرانی کوردیشەوە بەو زمانانە نوسینیان نوسیوە .

ئەحمەدی خانی یەکەم شاعیرە کە گلەیی لە سەرۆك هۆزەکانی کورد دەکات کە یەکناگرن و پشت بەنەیاران دەبەستن دەنا دوژمنانی کورد غولامێتیان بۆ کورد دەکرد و دەڵێت :

گەر دیَ هەبــوا مەئیتیفاقــەك ..... ڤێکــرا بکـرا مـەئینقیـادەك

رۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی ..... هەمیا ژ مە ئا دکر غـولامـــی

تەکمیل دکر مەدین و دەولـەت ..... تەحلیل دکر مە عیلم و حیکمەت

خانی : گرنگییەکی زۆری بە زمانی کوردی داوە و کاتێك بەزمانی کوردی شیعری نوسیوە تەنها هەر بۆ ئەوە نەبووە کە بەو زمانە بنوسێت بەڵکو بە کوردیی نوسیویەتی وەکو هەڵوێستێك لە دژی دەسەڵاتداران و زمانەکەیان بەکارهێناوە ، هاوکات وەکو رەخنەیەکیش لە کوردەکان خۆیان ، چونکە خانی پێی وابووە کە زوو خۆیان نەدەنە دەست ئاغا و دەسەڵاتدارە بێگانەکان ، کوردەکان ئازا و دلێر بوون ،شاسوار ،وەفادار ،جێیمتمانە

بوون ، بەڵام ئەوە بەدەردی چی دەخوات ، کاتێك خۆیان پەرش و بڵاو بن و نەتوانن یەکبگرن تا خۆیان خاوەنی خۆیان بن ، زمانی نوسین دەتوانێت ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی هەست بکەن کە ئەوانیش نەتەوەیەکن هەروەها هانی کوردانی داوە بۆ روو بە رووبوونەوە لە گەڵ داگیرکەران .

دکتۆر مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردی بەرگی دووەمیدا بەم شێوەیە باسی ئەحمەدی خانی دەکات و دەڵێت :

سەیدێ جەنگالا سەرێ زولفا شەها شەهبازم ئـــەز

مەستێ جانا عیشوە یا شەهنازێ نازك نازم ئـــەز

دەردەمەندەك من دڤێتن هەم نەفەس بت(خانــی)یا

گومە هەمدەستەك هەبیتن سازێ خوەش ئاوازم ئەز

*******************

هزری نەتەوایەتی لەلای ئەحمەدی خانی

ئەحمەدی خانی یەکێکە لەشاعیرە دیارەکانی کوردو بەپێشەنگی هزری نەتەوایەتی کوردی دادەنرێت،خانی هەموو تەمەنی تەرخانکردبوو بۆ ڕاژەی ئەدەبی کوردی و وەلەئاکامدا ڕاژەی گەل ونیشتیمانەکەی .

خانی بەشدارییەکی گەورەی هەبووە لەگۆڕەپانی ئەدەبی کوردیدا ،وە توانیویەتی بە ستایلە قەشەنگەکەی لەدانانی شیعردا نازناوی (شانشین)ی شیعری کوردی بۆ خۆی پاوان بکات .

ئەو داهێنانی کردووە لە لەهۆنینەوەی شیعردا ،وە وشەکان لەدەستیدا دانەدەمان وە بەتوانابوو لە بەکارهێنانی ووشەی گونجاو بۆ دەربڕینی مانا هاوکات لەگەڵ تۆنێکی جوانی هاوکوفی واتاکە.

خانی بەو پلە بەرزمیە گەشت لەبەر ئەم هۆیانە :

١- (خانی) زمانی عەرەبی و فارسی بەباشی دەزانی ئەمە سەرەڕای زمانی دایك ، وە زانیاری وەردەگرت لەم زمانانەوە .

٢- (خانی) پەرۆشی زانست و زانیاری بوو ، بۆ ئەو مەبەستە چەند دەوڵەتێك گەڕاوە و لەو میانەیەدا سەردانی دیمەشق و ئەستەنبوڵ و میسری کردووە ، ئەدەب و شیعری خوێندوە

هەروەها تیۆلۆجیا (ئاینناسی) خوێندووە و بەڕێگاکانی بە سۆفی بوون (تصوف) ئاشنا بووە ، لە بەر ئەوە خانی زانست و زانیارییەکی زۆری لە لەناودارانی ئەدەب و فەلسەفەو ئاینەوە وەرگرتووە

٣- (خانی) یەکەم کەسە کەشیعری چیرۆکی هێنایە ناو ئەدەبی کوردیەوە ئەمەش بەچیرۆکی(مەم وزینی)ی بەناوبانگ .

٤- بایەخێکی زۆری بەفێرکردنی منداڵان داوە ئەویش بە هۆنینەوەی شیعری فێرکاری لە فەرهەنگی (نەوبەهار)دا .

٥-یەکەم کەسە بەڕاشکاوی بانگی بۆ خەبات کردووە لە پێناو نیشتیماندا .

**پەیوەندی خانی بەزمانی کوردییەوە:**

هەر لەمنداڵییەوە خانی زمانی کوردی خۆشویستووە،هەرکە تەمەنی گەشتە چواردە ساڵ بەم زمانە شتی نووسی،ئەو بەهەستێکی لێوانلێو لەنیشتیمان پەروەرییەوە بانگەشەی گرنگیدانی دەکرد بۆ زمانی کوردی،ئەم مەسەلەیەش لەلای ئەو بەپلەی یەکەم دەهات لەبەرئەوەی زمان یەکێکە لەکۆڵەکە سەرکیەکانی هەر گەلێك،لەم گۆشە نیگایەوە خانی هەڵسابە کردنەوەی قوتابخانە بۆ منداڵان بۆ فێرکردنی زمانی دایکییان .

**بۆچی خانی بەزمانی کوردی دەستی بەنووسین کرد؟**

خانی لەپێشەکی (مەم وزین)دا باسی ئەمە دەکات ،دەڵێت هۆی نووسین بەزمانی کوردی لابردنی لەکەیە بەسەر ئەم زمانەوەو ،بۆئەوەی بوار بۆ گەلانی تر نەمێنێتەوە کە بڵێن کورد دواکەوتووە وهیچ مەعریفەیەك و پشکێکیان لە ئەدەب وئەڤیندا نییە :

خانی ئەو کەسە نەبوو کە جڵەوی دەستپێشخەری لەگۆڕەپانی ئەدەبدا بەدەست بێت بەڵام گۆڕەپانەکەی بەچۆڵی بینی بەو پەڕی بێفیزییەوە دەڵێت کە ئەزموون ولێهاتووی ئەوەم نییە بێمە ئەم گۆڕەپانەوە بەڵام وا بەدەمارگیری عەشایەرییەوە هاتووم .

خانی بەهەستێکی قوولەوە لە خەمەکانی گەلەکەی دەگەشت ،بەو پێودانگەی کە ئەو خاوەنی عەقڵێکی ڕۆشنگەر بوو لەو کاتەدا کە گەلەکەی بەدەست دواکەوتوویییەوە دەینالاند

ئەمە لەلایەك ،وەلەلایەكی ترەوە بۆ ئەو جەنگانەی كە ڕووبەڕووی كوردستان دەبونەوە لەسەردەستی تورك وفارسەكان وە لەئاكامدا بووبەهۆی دابەشبوونی كوردستان بەسەر هەردوو دەوڵەتەكەدا . تورك وفارسەكان دەستیان نەدەگێرایەوە لە ستەم كردن لەگەڵ كورد بۆئەوەی ئەم گەلە والێبكەن كەویستی ئازادی نەبێت وهەر لەكۆیلەیدا بمێنێتەوە لەبەرئەوە دەنگی خانی تەنها ئاگادارکەرەوەی میری بۆتان بوو لەو سەردەمەدا بۆ ڕەتكردنەوەی ئەم واقیعە:

ئەگەر سەركردەیەكمان هەبووایە كەچاك وبەخشندە بوایە و ڕێزی زانست وهونەرو كایەكانی تری باش هەڵبسەنگاندایە ئەوا منیش ئالأی شیعرم بەرزدەكردەوە بۆ بەرزترین پنتی ئاسمان ،بەناوی گیانی مەلای جزیریەوە حەریریم دەژیاندەوە وخۆشیم دەخستە دڵی فەقێ تەیرانەوە . بەلأم ئەم خەیاڵەی من بێسوودەو كەس نایكاتە واقیع .

كەواتە خانی یەكەم كەس نییە كە گەلەكەی فەرامۆشی دەكات ،هەرخۆشی ناوی ئەو شاعیرانە دەهێنێت كەبەهەمان شێوە فەرامۆش كراون لەوانە .

## جەزیری وعەلی حەریری وفەقێ تەیران

خانی هۆكاری ئەم كەم تەرخەمی وفەرامۆش كردنەی دەزانی ودەیگەڕاندەوە بۆ نەزانی و دواكەوتویی گەڵی كورد ،لەبەرئەوە هەستی بەوەكرد كە دەبێت بەپلەی یەكەم بایخ بە زانست وزانیاری بدات وهەڵسا بەكردنەوەی خوێندنگا بۆ منداڵانی كورد بۆئەوەی كە فێربكرێن ولە گۆڕینی باردۆخی گەلەكەیاندا پشكداربن

خانی لەدوو بەرەوە دەجەنگا:بەرەی یەكەمیان بەرەی نەزانی ودواكەوتویی بوو بەلأم بەرەی دووەمیان بەرەی جەنگی خانی بوو دژی تورك فارس

هەركە خانی چاوی هەڵهێنا جەنگی تورك وفارسی بینی لەسەر خاكی كوردستاندا ،دەیزانی تەنها كورد باجی ئەو جەنگانە دەدەن ،هەمیشە پشكیان لە كوشتن وبڕین و تالأنی بەردەكەوت لەبەرئەوە جاڕی خەباتی دا بۆ ڕزگاربوون لەم واقیعە:

قەدەری كورد ئەوەیە كەببێت بەكۆیلەی ڕۆم و عەجەم ،پاشكۆیەتییان نەنگییە ،ئەم نەنگییە بارێكی زۆر گەورەیە بەسەر شانی فەرمانڕەواو میرنشینەكانەوە،دەبێت ئەوان ڕووبەڕووی ببنەوە ،شاعیرو كەسانی هەژار چییان پێدەكرێت ،لێرەوە ئاستی پەیوەندی خانی بەنیشتیمانەكەیەوە خۆی بەرجەستە دەكات .

خانی له چارەنوسی گەلەکەی ڕادەما ،بۆچی خاوەنی هیچ قەوارەیەك نین ؟بۆچی هەمیشە ئەم گەلە پشکی هەر کۆیلایەتی و زوڵم وسوکایەتی پێکردنە، ئەمە لەکاتێکدا کورد ئەوەندە سیفاتی بەرز و خانەدانییان تێدایە کەببنە سەرداری وڵاتەکەیان:

وەپاش لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی خانی بۆ ئەو واقیعەی کەکوردی تیا دەژی ،دەستی نایە سەر ئەو برینەو بەدەنگێکی بەرز دەیوت:چارەکە ڕێککەوتنە لەسەر سەرکردایەتییەکی بەتوانا کە بتوانێت کورد بگەیەنێت بە ئامانج :

یەکگرتنی کورد تەنها ئامانجی باڵای ئەو بوو ،تەنها یەکگرتن دەتوانێت ڕووبەڕووی ئەم واقیعە بەئازارە ببێتەوە .

بەڵێ ئەمە خانی عاشقی ئازادی گەل ونیشتیمانەکەیەتی ،شتێکی ئاساییە کەسەر دابنەوینین لەهەمبەر هزری خانیدا ،ئەم کەڵە شاعیرە ناوی بە هەڵکۆڵراوی دەمێنێتەوە لە مێشکی نەوەکاندا بۆ چەند سەردەمێك .

لەکۆتاییدا پێم خۆشە ئەو وتەی عەلادین سوجادی بهێنمە بەرباس کە وەسفی خانی دەکات ودەڵێت:خانی لوتکەو تاجی هەموو نوسەرو شاعیرەکانی کوردە .

## زوهد و تەصەوف لای خانی ...

خانی زوهد و تەصەوف جیا دەکاتەوە کە لە فەسڵە بەراییەکاندا داوای شتێك لە خۆپەرستی و زیکری خواکردن داوا دەکات و دەڵێت :

نینن مەد قەلبی فیکر و زیکرەك

ناکەین بە زوبانی حەمد و شوکرەك

خانی کو نەهن ب قەلبی زاکیر

باری بدە وی زوبانی شاکیر

کە خانی ئەم پایەیە دەکات بە زیکر زیکردن بە دڵ و بە زوبان لێرەدا یا لە جێگەی تردا بە پێی ئەوە قارەمانەکانی ئەوە زیکرکردن لای موتەسەوفیەکان جیا دەکاتەوە ، لەو بارەیەوە قوشەیری لە زمانی ئەبوو عەلی ئەلدەقاقەوە دەڵێ ( زیکر بە زوبان سوچێکی بەهێزە لە ڕێگەی حەقدا – سبحانە وتعالی – بەڵکو کۆڵەکەی ئەم ڕێگەیەیە کەسیش ناگاتە خوای مەزن بە بەردەوامی زیکر نەبێت ، زیکر بە زوبان و زیکر بە دڵ بەندە بە زیکری زوبان دەگاتە

بەردەوامی زیکر بە دڵ و کار کردنە زیکری دڵ ، ئەگەر بەندە بە زوبان و دڵ لە زیکردا بوو ئەوە لەوەسف و باری سولوکیدا کامڵە ) .

لەزیکری زمانەوە خانی بەپلەکانی تەسەوفدا سەردەکەوێ وبە تەواوی زاهید وموتەسەوف لەیەك جیادەکاتەوەو لە عەشقدا شەقڵی موتەسەوف دەبینێ و کە خەڵکی تر بە بێ بەری دەزانێ لێی ....

کەس نینە ژ عەشق بێ ئەســەر بێت مومکین کو ژ زەوق بێ خەبەر بێت

هەر کەس بە میقیاس هیممەتا خــووە دی سەرف بکەت ئیرادەتا خوە

لێ ئەکسەری عــامیان نــەزانــــن نەفسا خۆ ژ بۆ خۆرا نەزانن

ئەو جاهیل و ئۆمی و ســـەفلیــــن بێ مورشید و رەهبەر و دەلیلن

ناچار دبن ل عــــەشــــق بـائیع تەقدی خوە دەدەن بەخس زائیع

هەن سەرف دکەن بە عەیشی دونیا هەن پێ دکرن سەرایی عوقبا

ئەڤ هەردوو جەلەب دبن زیــانکار مەحروم دبن ژزەوقی دیدار

پاش ئەم جیاکردنەوەیەی زاهید و موتەسەویف ، خانی : شەقڵی موتەسەویفمان پیشان دەدات ، کە ئەم دێڕانە پیشان ئەدەین دەبێ بچینە مەسەلەیەکی تری عەشقەوە ، پێش ئەوەی باس لەم شەقڵەی موتەسەویف .. خانی لەیرەدا دوو دەستە عاشق دەبینێ : ئەوانەی دەیانەوێ لە جیهاندا بە خۆشەویستەکەیان بگەن . ئەوانە بە لای ئەوەوە لە هەموو داستانەکەدا لە بەیەك گەیشتنی ئەو دونیا بێ بەری دەبن ، یان ئەوانەی دەیانەوێ لەو دونیا بەیەك بگەن و لە بەیەککەیشتنی دونیا بێ بەری دەبن ... هەر دوو دەستە بەڕای ئەو تووشی بێ بەری بوون ، دەبن هەریەکە بە پێی توانست و هەڵبژاردنی خۆی ، هەرچەندە بە یەك گەیشتنی دونیادا نەمانی خۆشەویستی دەبینێ و ئامۆژگاری ئەوەیە کە لە خۆشەویستی دونیا دوور بکەینەوە و دەڵێ :

قــەدا تە حـــــوبــاندی بۆ تــەدارە زوڵفا تە جڤاندی ئەو قەنارە

جەزبا تو رەڤاندی جــان ل بالــە سرا تو ڤ دای ئەو خوە مەئالە

باوەرش تە نەبێ ل زوڵف و خــالان مالی مەدە هیندویان ب تالان

پابەند مە بە ب تاری گێســــــوو سەر گەشتە مەبەب قەوسی ئەبروو

هەرچەند خەلیلی ئەی بەلاکــــەش گولزارل تە دەبێتە ئاتەش

یا بە زمانی (مەم) موە دەڵی کە بە یەکتر گەیشتنی ئەو دونیای لە بەیەکتر گەیشتنی دونیا لاباشترە :

ئەو میر حــەکــیمە زولجــەلالــە بێ عەزل و تەغەیوور و زەوالە

تەزویج کرن ب عالەما غەیـــــب تەئیرد کرن بە ئەمری لارەیب

باگورەیی باغی عیز و نازیـــــــن سەد شوکر کو بیکر و سەرفرازین

حاشاکو دەڤی سەرایی فانـــــی بێ جەننەتی عەدنی جاویدانی

حەیوان سیفەت بکەین زینائـــی بێ هودە دەمەسکەنی فەنائی

تەڕدامەن و سەرنگوون و مردوود شەرمندە بچینە پێش مەعبود

خانی کەسێکی خواناس بووە و عەشقێکی زۆری دەربڕیوە لە شیعرەکانیدا بۆ خوای پەروەردگار و پاڕانەوە و نزای زۆری کردووە ، وە هەروەها عەشقی زۆری بووە بۆ پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی (محمد ) درودی خوای لەسەر بێت ، وە عەشقیکی زۆری بۆ خاك و نیشتمان و زوبانەکەی کە کوردە ، وە زۆر بە ئەسەفەوە ئاخ و ناڵەی بردە نێو گلەوە کە زوبان و نیشتمانەکەی بە سەر بەخۆیی نەبینی لە گەڵ ئەوەشدا کە چەندەها سرود و نەشیدی بۆ جوڵاندنی غیرەتی کوردی خوێندەوە .

خانی مەبەستی لە دانان و هۆنینەوەی چیرۆکی مەم و زین دەربڕینی دەردی دڵی بووە و چونکە هەستی بە ئێش و ئۆف و داخ و پەژارەی نەتەوەکەی خۆی کردوە ، هەستی بە ئاوات و ئارەزووی گەلەکەی کردووە و چیرۆکی مەم و زینی کردووەتە بەهانە بۆ ئەوەی دەردەدڵی خۆی تێیدا دەربڕێ و ویستی خۆی تێیدا بخوازێ و دەڵێ : ئەگەر کورد بە فەرهەنگ و زمان و وێژەی گەلانی ترەوە و هەروەها سەبارەت بە دواکەوتن و سەرلێشێواوی گەلەکەیەوە دەڵێ : نازانم ئەم کوردی ئێمە بۆچی لە هەموو شتێ بێ بەری بوون ، ئەگەر ئێمە دڵسۆزێکمان بوایە ، دیارە هەموو شتێکمان برەوی ئەسەند و برواشمان پتەوتر دەبوو وەك خۆی دەڵێ :

ساقی تو ژ بۆ خودێ کەرەم کــە
یەك جورعەی مەی دجام جەم کە

دا جام بەمەی جیهان نما بـــت
هەرچی مە ئیرادەیە خویا بـــت

بەختی مە ژبو مەرا بیت یـــــار
جارگ بیتن ژ خواب هوشیـــــار

ئەسمامە دحكمەتا خـــــودێ دا
كرمانج ددەولەتا دنێـــــــدا

ئایا ب چ وەجە مانە مەحـــروم
بیلجوملە ژ بووچ بوونە مەحكـوم

گەر دێ هەبوایا مە سەرفـــرازەك
ساحب كەرەمەك سوخەن نەوازەك

نەنەقدێ مە دبوو ب سكە مەسكووك
نەدما وەهبێ رەواج و مەشكـــووك

مەمخۆری دكر ل مەینەتیمـــــــان
تینانە دەرێ ژ دەست لە ئیمـــــان

خانی زۆر داخ و ئاخ دەخوا كە گەلەكەی لە زانین و زانیاری و وێژەدا بەهرەیەكی نەبردووە و دەڵێ چ بكەم بازاڕی زمان و وێژەی كوردی كەسادە و پارەپەرستی و نەزانین وای لێكردووین كە زانست لە ناو ئێمەدا باو نییە و بۆ پولێك كەسێك نایان كڕێ جامی و نزامی رێزێكی لە لای خەڵكدا نییە ... وەك دەڵێ ....

چ بكم كو قەوی كەسادە بازار
نینن ژ قوماش را خەریـــــدار
یەعنی ژ تەمەع دراڤ و دینـــار
هەریەك ژ مەرا وەبوونە دلدار
گەر عیلم تەمام بدەی بە پولێـــــك
بفرووشی تو حیكمەتی بە سولێـك
كەس ناكەتە مەیتەرێ خوە جامی
را ناگرەتن كەسەك نزامـــــــی

خانی لە پاش ئەوەی دەربەردەری و سەرگەردانی و بێچارەیی گەلەكەی هەڵدەدا دەگاتە ئەو ئەنجامە كە دوایین دەرمانی دەردی ئاوارەیی و لێقەوماویی گەلەكەی تەنیا یەكیەتی و

برایەتیە ، چونکە ناکۆکی و ناتەبایی مایەی دواکەوتنە و یەکێتی مایەی سەرکەوتن و بەختەوەرییە ... لە م هۆنراوەدا خانی دەڵێ :

لەو پیک ڤە هەمیشە بی تفاقـــن
دایکم بە تەمەرد و شقاقـــــن

گەردێ هەبوایا مە ئیتفاقـــەك
ڤیك را بکرا مە ئینقیـــــادك

تەکمیل دکر مە دین و دەولـــەت
تەحسیل دکر مە عیلم و حیکمەت

تەمیز دبوون ژ هەڤ مەقـــالات
مومتاز دبوون خودان کەمـــالات

خانی چیرۆکی مەم و زینی لە دوو پەردەدا پیشان داوە ، یەکەم پەردەی کۆمەڵایەتی و لەوەدا دەرد و پەژارە و نەزانین و دواکەوتنی گەلەکەی پیشان داوە .

دووەم پەردەی دڵدارییەتی کە لەوەدا باسی ئەوینی دوو دڵداری کوردی کردووە ، بەڵام خانی وەکو خۆی دەڵێ : چیرۆکەکەی کردووەتە بەهانە و نزیکەی سێ سەد ساڵ لەمەو پێش بیری ئازادی خوازی خستووەتە بیرمانەوە و لەو سەردەمەدا داوای ئازادی بۆ گەلەکەی کردووە و هەستی بە زۆر بێژی و زەبر و زەنگی پاشایەتی کردووە .

ناوەرۆکی چیرۆکەکەی خانی سەرچاوەی چیرۆکەکەش ڕووداوێکی کوردەواری خۆمانەیە کە بە پێی چیرۆکەکە میر زەینەدین ناوێکی کورد لە بۆتاندا هەبوو کە دوو کچی شۆخ و شەنگی بە ناوی ستی و زین هەبووە ، کە زۆر شۆخ و شەنگ و نەشمیل بوون ، یەکێ لە سەرۆکەکانی میر نازی ئەسکەندەر بووە کە ئەم ئەسکەندەرە سێ کوردی هەبوو بەناوی ( تاژدین و چەکۆ و حیفۆ) ، هەرکام لەمانە شێری مەیدان ، تاژین هاوەڵێکی دەبێ بەناوی (مەم) کە خەڵکی ئالان بوو .

مەم و تاژدین هەموو ڕۆژێ بەیەکەوە دەچوونە ڕاو و شکار و لە گەڵ یەکدا ڕایان دەبوارد ، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە مانگی خاکە لێوەو لە یەکێ لە ڕۆژەکانی نەورۆزدا کە دەشت و کێو و بە گوڵ و شیناوەردی ڕاوابوونەوە و خەڵك لە هەندەراندا بوون و میر زەینەدینیش لە گەڵ خاو و خێزانەکەیدا چوونە دەرەوە و مەم و تاژدین لەم کاتەدا چاویان کەوت بە (ستی و زین )

تاژدین دڵی لە ستی چوو ، مەم یش دڵی لە زین چوو ، ماوەیەك ئەو دوانە لە ئاگری ئەویندا سوتان و پاشان کەس و کارەکەیان چوونە ماڵی میر بۆ خوازبێنی ئەو دوو کچە و سەرەنجام ستیان بۆ تاژدین مارە بڕی و بوو بە خێزانی ، بەڵام بە (بەکری) مەرگەوەڕ کە دەرکەوانی ماڵی میر بوو نەیهێشت زین بدەن بە مەم و دڵی میری لە مەم خراپ کرد و ئەوسا مەم و زین لە ناو ئاگری ئەویندا سوتان و لە پاشا بە هۆی دوو زمانی بەکری مەرگەوەڕ مەم گیرا و خرایە زیندانەوە ، ستی و تاژدین و چەکۆ و حیفۆش هەرچەندە تێکۆشان کە مەم لە زیندان ئازاد بکەن بۆیان نەکرا ، وە سەرەنجام مەم لە زینداندا گیانی سپارد و مرد ، ئەوسا لە گۆڕستاندا ناشتیان ، کاتێ زین ئەمە دەبیستێ دەڕواتە سەر گڵکۆی مەم و لە داخدا دیق دەکات و گیانی دەردەچێت و دەمرێت بەم جۆرە ئەویش لە پاڵ مەمدا دەنێژن و تاژدین لە داخی ئەو دوانە بەکری مەرگەوەڕ لە نێوان گۆڕی ئەو دوو نەمامە سەردەبڕێ و ئەوسا خوێنەکەی دەبێتە دڕك ولە نێوانیاندا سەر دەردەکا ولە گۆڕەکەشدا دەبێتە میمڵیان.

خانی لە بەندی بیست و نۆی چیرۆکەکەی دا جۆرە بیر و ئەندیشەیەکی تازە و نوێ دێنێتە ناوەوە و لەم بەندەدا مەم لە گەڵ شەم دا ڕاز و نیاز دەکا و بە شەم دەڵێ : ئەی شەم ! هەرچەندە وەکو دەسوتێت بەڵام بە وتن لە من ناچیت ئەگەر تۆیش وەکو من راوێژت بکردایە ، ئیتر دڵم بۆ خۆم نەدەسوتا ، ئێمە هەردووکمان هەموو دەم دەسوتێن و لەگەڵ سوتانەکەماندا ڕشتەی گیانیشمان دەسوتێ و باش کە هەڵدەکا بە سوتانەکەمان گەشە دەدا ، تۆ هەر لە شەودا دەسوتیت ، بەڵام من بە شەو و ڕۆژ خۆ برینەکانیشم بەدەم ئەو سوتانەوە دێنە سۆو پتر ئازارم دەدەن بە جۆرێ کە لە گیانی خۆم بێزار دەبم ...خانی لە هۆنراوەکەدا دەڵێ :

مەم شەم دکر ژ بۆ خۆ دەمساز
کەی هەمسەر و هەمنشین و هەمراز

هەرچەند ب سوهتنێ وەکی من
ئەما نە بە گوهتنی وەکی مـن

گەر شبهەتی من تە ژی بگوهتـا
دی من بە خو دل قەوی نەسوتا

دایم دسۆت مە رشتەی جـــان

تە ناسژتن ب غەیر ئەزمـــــان

هەرچەند ب شەڤ دمینی بیـــدار
سوبحان دنقی حەتا قەتیفــــار

ئیڤار و سەحەر بروژ ئەگەر شەڤ
ئەز هەر دسژم و مسا لەسەر هەڤ

گەهگا ژ دەست دل بریـنـــدار
ناچار دبوو ژ جـــان بیـــزار
*************

کۆپلەیەك لە شیعرەکانی ئەحمەدی خانی ...

میرێ مەجلیس نەکەنت موتریبێ گوویا چ بکـت
غونچەی خەندان نەبتن بولبولێ شەیدا چ بکـت
نەینکا حوسنێ بتان لازمە ســـاحێب نـەزەرەك
کەســـێ بینا کو نەبت دلبەرێ زیبا چ بکــت
تالیبێ عیلم و کەمال نەبتن عالیمێ دانا چ بکـت
تەبعێ ( خانی) سەدەفا، گەوهەرێ عیرفانە وەلێ
مەتن خوانەك نەبتن ساحێبێ مەعنا چ بکـــت

بەرهەمەکانی

– عەقیدەیا ئێمانێ : پەخشان و هۆنراوە سەبارەت بە پێنج کۆڵەکەی ئیمان لە ئیسلامدا ساڵی ٢٠٠٠ زاینی لە سوید لە چاپ دراوە .

– نووبەهارا بچووکان : ١٦٨٣ فەرهەنگی عەرەبی – کوردی کە بەشیعر بۆ منداڵانی کوردی داناوە کە فێری زمانی عەەبی بن کە ئەو سەردەمە زمان دین و زانست بووە ، یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٦ لە رەواندز چاپکراوە .

– مەم و زین : ١٦٩٢ یەکەم جار لە ١٩١٩ لە ئەستەمبول چاپکراوە .

# فایق بێکەس

## باشوری کوردستان

( ١٣٢٥ – ١٣٦٨ کۆچی ) ( ١٩٠٥ – ١٩٤٨ زاینی )

ناوی فایق کوڕی عبدالله بەگی کوڕی کاکە حەمەی کوڕی ئەلیاسە قۆجەیە . بنچینەی بنەماڵەیان لە قەڵاچوالانەوە هاتووەتە سلێمانی و خۆی لە ١٩٠٥دا لە سیتەك هاتووەتە ژیانەوە ، ئەو دێیەش بیست کیلۆمەترێك لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی‌یەوە دوورە و ئەو ئەوساتەش سیتەك سەنتەری "شارباژێر" بووە . عبدوڵڵا بەگی باوکی لەوێ "تابوور ئاغاسی" بووە . لە دایکیشیەوە لە بنەماڵەی ئاغەلەرەکانی سلێمانییە .

ساڵی یەکەم و دووهەمی تەمەنی لە سیتەك بەسەربردووەو، پاشان ماڵیان هاتووەتەوە سلێمانی و لە تەمەنی سێ ساڵیدا ئاوەڵەی دەرداوە . هەر بە منالی باوکی لە حوجرەی فەقێ خستوویەتیە بەر خوێندن.

لە ١٩١١دا باوکی بە ئیشی میری نێرراوە بۆ خانەقین و لەوێوە بۆ بەغدا. لە بەغداوە ئەنێرێ بە دوای ماڵ و منالەکەیدا و ئەیانباتە ئەوێ. پاش ساڵێك خۆی چووە بۆ تورکیا و ئەوانی لە بەغدا بەجێهێشتووە . ئیتر فائق باوکی نەدیوەتەوە . هەر لەو ماوەیەدا حەمە سەعیدی برا گەورەی لە ئاوی دیجلەدا ئەخنکێ و دوابەدوای ئەو دایکیشی کۆچی دوایی دەکات و فایق ئەکەوێتە لای خاڵی. ئەویش پاش چەند مانگێك ئەمرێ و فایق و تاهیری برای بچووکی بە بێکەسی ئەمێننەوە .

ئەو ساتەی شەڕی یەکەمی جیهان هەڵدەگیرسێت، ڕێی هاتوچۆی نێوان بەغدا و سلێمانی دەگیرێت. "حاجی ئەمینی کاکە حەمە"ی مامی لە سلێمانییەوە ئەنێرێتە لای "حاجی عەلی ئاغا"، ئەوەی لە بەغدا بووە ، کە چاودێری فایق و براکەی بکات و هەر میراتێکیان لە باوك و دایکیانەوە بۆ مابێتەوە بۆیان خەرج بکا. ئەویش ئەیانداتە دەستی "حەبەخان" ناوێك، ئەوەی خێزانی ئەفسەرێکی خەڵکی سلێمانی بووە و لە بەغدا دانیشتووە .

ژنەکەش مەردانە ئەیانخاتە ژێر باڵی بەزەیی خۆی و وردە وردە پێیشیان ئەخوێنێ. دوو سێ ساڵێك بەم جۆرە ژیان بەسەردەبەن. لە ١٩١٧دا کەساسییەکی زۆریان تووش دەبێ. لە ١٩١٨دا حەبە خان ئەیانباتەوە بۆ سلێمانی بۆ لای "حاجی ئەمین"ی مامیان.

فایق لە سلێمانی ئەخرێتە قوتابخانە و لە پۆلی سێیەمدا وەرئەگیرێ و تا ساڵی ١٩٢٣ لەسەر خوێندن بەردەوام دەبێت. هەموو ساڵێ بە یەکەم دەرئەچێ. لەو ساڵەدا لەسەر

ئارەزووی مامی ئەچێتە قوتابخانەی "علمیە" لە کەرکووك. بەڵام بۆی ڕێناکەوێ لەوێ بخوێنێ، ئەچێتە بەغدا و ساڵی ١٩٢٤ - ١٩٢٥ لە "دار العلوم" بەسەرئەبا. لەوێش لەبەردەم بژێوی بژی و لە ساڵی ١٩٢٦ - ١٩٢٧دا ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی. لەوکاتەدا سلێمانی تەنها پۆلی یەکەمی ناوەندیی تیا بووە ، ناچار تێی ئەچێ.

لەو ساڵانەدا تەنگوچەڵەمەی ژیان ناچاری ئەکا دوکانێکی جگەرە بکاتەوە ، بەڵام ئەمەش سەرناگرێ و دەستدەکات بە جگەرە و شقارتە فرۆشتنی دەستگێڕی و پاشان پەنا ئەباتە بەر "ئەشغال" و بە ڕۆژانە لە ڕێگای عەربەت ئیش ئەکاو چەند مانگێك لەسەر ئەم ئیشە دەبێت.

لە ١٩٢٨دا بۆ ماوەی چەند مانگێك لە هەولێر ژیاوە . لەو سەردەمەدا خوالێخۆشبوو "قالەی ئایشە خان" ئەندازیاری ئەشغاڵ بووە و سەرپەرشتی کردنەوەی ڕێگای هەولێر - ڕەواندز - ڕایاتی کردووە . بێکەس دۆستی لە ئەشغاڵ دامەزراندووە. هەر لەو ساڵەدا بێکەس ئەبێ بە مامۆستای "زانستی" و لە ١٩٢٩دا ئەبیستێ باوکی لە مەرعەش لە تورکیا مردووە . لە ساڵی ١٩٣٠دا بە هەر دەردی سەریەك بووە بەدوای میراتی باوکیا ئەچێ بۆ تورکیا، هەر لەو ساڵەدا بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە . هەر لەو ساڵەدا بوو ڕاپەڕینەکەی شەشی ئەیلوول لە دژی هەڵبژاردنە ساختەکەی دەزگای پادشایەتی ڕوویدا. بێکەس یەکێك بوو لەو نیشتمان پەروەرانەی سەرکردەی ئەو ڕاپەڕینەیان کرد و تێیدا برینداریش بوو.

لەئەنجامی ئەو ڕۆڵەدا ئەیگرن و ئەیخەنە بەندیخانەوە. هەر لەسەر ئەم بەشداربوون و سەرکردەییەی لەسەر کاریش لایئەبەن. هۆنراوە بەناوبانگەکەی "ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم..."ی لە ناو بەندینخانەدا نووسیوەتەوە .

**ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم...**

**ئەی وەتەن مەفتوونی تۆمو شێوەتم بیـــرکـــەوتـــــەوە**

**وەختی بەندییو ئەسارەت، پێ بە تەوق و کـــــۆتـــــەوە**

**من لە زیکرو فیکی تۆ غافڵ نەبووم، وا تێنـــەگـــــەی**

**حەپس و تێهەڵدان و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتــــــەوە**

**بەو خودایەی بێ شەریك و لامەکـــان و واحیـــــــدە**

**عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کـــــردۆتـــــــەوە**

**ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوێ بڕژێنیتــــە ســــــــەر**

قەت گرو کڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد نەکــــوژێتـــــەوە

باسی مەحزوونی و کەساسیی خۆت نەکەی توخوا وەتەن

چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکــــولێتـــــەو

ماتەمینی تا بە کەی، دەی پێکەنەو سەر هـــەڵبـــڕە

موفتەخیر بە، شوهرەتت وا عالەمی گـــرتۆتـــــەوە

نەگبەتی لاچوو، سەعادەت بۆتە پشتیوانـــــی تـــــۆ

کەوکەبی بەختو فریشتەت بەرزە، ئەدرەوشـــێتـــــەوە

گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵـــمـــــــی

نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحـــەزت لێکنێتـــــــەوە

لافی میللییەت بە دەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییــــــە

ڕۆژی هەوڵە، هەر بە هیممەت گۆی هونەر ئەبرێتـــــەوە

بێقوسوورە، چەند جەسوورە صەد شوکر ئەولادەکـــــەت

وا لە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتـــــــەوە

بەسیە، تەعنەم لێ مەدە، هەر ڕۆڵەکەی جاراتــــــــم

هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەستو پێم ئەکرێتـــــــەوە

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بـــــــدا

دوژمنت پەتکەم وەکوو سەگ بیخەمە زۆر پێتـــــــەوە

شاعیر خۆشەویستی بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی بە هۆنراوە لە لاوانەوەی نەکەوتووە پڕ بەدڵ هەمیشە گەلەکەی وشیار کردووەتەوە بۆ هۆنراوەکانی ... ئەمەش یەکێکی ترە لە هۆنراوەکانی کە زۆر لە ڕۆڵەکانی گەلی کورد وەک هاوڕێیەک لەبەریان کردووە و بەتایبەت لە قوتابخانەکاندا بووە بە سرودێکی ڕۆژانەی قوتابیان چ لە پۆل یان لە ڕۆژانی کۆبوونەوەی قوتابخانە و بیگرە لە زۆربەی بۆنەکانی قوتابخانەشدا ئەم هۆنراوەیە دەوترێتەوە ....

خوایە وەتەن ئاواکەی ... چەند دڵگیر و شیرینە

دەشتی خۆش و ڕەنگینە ... ئاوی کەوسەرە خاکی گەوهەرە

پڕ لە گوڵ و نەسرینە ..

سەیرانگای بەهارانی ... سەوزەگیای نەرم و جوانی
سەد دڵ ئەبێت حەیرانی ... ئاوی کەوسەرە خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە ..

شاخی بەفرین و بەرزە ... بۆ رابواردومان رەمزە
چیمەنی جوان و سەوزە ... ئاوی کەوسەرە خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە ..

ئەم شوێنە شوێنی کوردە ... جێی قارەگان و مەردە
لانەی شێری نەبەردە ... ئاوی کەوسەرە خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە ..

وەتەن چاوی لێمانە ... دەریکەین لە تەنگانە
حەیفە بێتە وێرانە ... ئاوی کەوسەرە خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە ..

ئەوەتا بێکەس هاوار ئەلای خوای گەورە دەکات کە کوردستان ئاوەدان و جوان کەی ، هەر لەو سەردەمەوە وەك شاعیرەکانی پێشی خۆی گەلی کوردی وشیار کردووەتەوە کە ئەم نیشتیمانە لە چنگی بێگانە و ناحەز بپارێزین ، لە پەژارە و تەنگانەیە رزگاری بکەین و وەك وڵاتانی دونیا بەرەو پێشەوەی بەرین .. چونکە نیشتیمانی کوردستان لانەی شێرانە و جێگای پیاوانی قارەمانە و هەر شوێن و دیمەنێکی ئەم نیشتیمانە سەیر بکەی ئەڵێی بەهەشتی سەرزەوییە ...

ئەو ساتەی لە بەندینخانە دێتە دەرەوە، قوتابخانەیەك ئەکاتەوە بۆ ئەوەی وانەی تێدا بڵێتەوە و پێی بژی. لە ١٩٣٣دا میری وەرئەگرێ بە مامۆستا و ئەینێرێتە مۆرتکەی بازیان و پاشان ئەینێرێتە تەوێڵە. لە هاوینی ١٩٣٥دا لەگەڵ کۆمەڵە مامۆستایەك، لەوانەش یەکێکیان مامۆستا گۆرانی شاعیری بەناوبانگ بووە، بەشداری لە کۆرسێکدا کردووە لە بەغدا بۆ

**ماموستایان ئامادە کراوە. بێکەس لەو سەردەمەدا ماموستای قوتابخانەی سەرەتایی بازیان بووە .**

**لە ساڵی ١٩٣٧دا لە وزەی میریدا نامێنێت. ماموستایەکی نەترسی وەها لە سلێمانیدا هەبێ گیانی خەبات و کوردایەتی بڵاوبکاتەوە ، دووری ئەخاتەوە بۆ حیللە و پاش ساڵێك ئەینێرێ بۆ عەمارە . بەڵام بێکەس ڕازی نابێت بچێ و دەست لە ئیشەکەی هەڵئەگرێ و دێتەوە سلێمانی ، لەوێش قوتابخانەیەك ئەکاتەوە تا ١٩٤١ وانەی تێدا ئەڵێتەوە .ئەنجا ئەیکەنەوە بە ماموستای قوتابخانەکانی میری و تا دوایی ساڵی ١٩٤٨دا لە قەرەداغ و سلێمانی وسورداش وهەڵەبجە ماموستا ئەبێ.**

**بێ کەس هەروەها لە هۆنراوەکانیدا دەردەکەوێ لە هۆنراوە هۆنینەوەدا شێوەیەکی تایبەتی بووە و زۆربەی هۆنراوەکانی جوان و شیرین و سادە و رەوانن داوای لە خەڵك کردووە کە خۆیان لە پڕوپوچی لادەن و بیری چاك بکەنەوە و خەریکی کار بن و لە تێکۆشیندا بن ، تا لە ژیاندا سەرکەون ... ئەوەتا هۆنراوەیەك بۆ گەلەکەی دەنوسێت :**

**ڕۆژ و ئەرز و مانگ وایە لە گەڕایە　　تۆش تێبکۆشە تا ئێزت تیایە**
**ئینسانی ئیشکەر حەبیبی خوایە　　بەکەم رازی بیت زۆر لە ڕێدایە**
**سەری بێ ڕۆزی لە ژێر خاکایە**

**کاکە دانیشتن ! ماڵ وێران ئەکا !　　بێ ئیشی ئینسان پەرێشان ئەکا**
**نەفرەت لەخۆیی و لە ژیان ئەکا　　نان و مافی تۆ هەر لە کارایە**
**سەری بێ ڕۆزی لە ژێر خاکایە**

**مێروولە دەعبای بچوك و ووردە　　سەریکە چەندە بەدەست و بردە**
**دایکم خەریکە بە کۆش و کردە　　پیاوی بێ کارە وەك مردوو وایە**
**سەری بێ ڕۆزی لە ژێر خاکایە**

**بە پێی فەرموودەی ئایەتی قورئان　　لە سەعی زیاتر نیە بۆ ئینسان**
**هەوڵ و تێکۆشین فەرزە بۆ ژیـان　　نابێ مەئیوس بیت لەم دونیایە**
**سەری بێ ڕۆزی لە ژێر خاکایە**

**مەڵێ فەقیرم ، کوفری نیعمەتە　　لەشی ساغ بۆ تۆ موڵك و سەروەتە**

| | |
|---|---|
| پیاوی تەوەزل لات و نەگبەتــە | قوڵی لێهەڵکە بچۆرە کایە |

سەری بێ ڕۆژی لە ژێر خاکایە

بێ کەس ئارەزووی ئەوەیە کە خەڵك وەکو خوشك و برا بە یەکەوە ژیان بەرنە سەر و لە فیز و هەواو خۆپەسەندی خۆیان بپارێزن ، لە پارچە هەڵبەستێکیدا دەڵی :

بنیادەم هەرچەندە لەم جیهانەدا باتە سەر و هەر چەندە دارا و دەوڵەمەند بێ یان هەژار و دەست کورت بێ ، سەر ئەنجان دەمرێ و دەچێتە ناو گۆڕێکی تەنگ و تاریکەوە کەواتە هانایە بەم جیهانە فریو مەخۆن و پێوەبایی مەبن ، هەروەها چەند بنەماڵە و چەند نازەنینێ و خۆش روو لە ناو چوون و بوونە خۆراکی مار و مێروو ، دەسا با ئەوەشت پێ بڵێم و هانات لێبکەم کە هەرکاتێك پێت نایە زەوی ، هۆشت بە خۆتەوە بێت کە بە ئەسپایی هەنگاو هەڵگری ، چونکە لە ژێر پێتدا هەزاران نازەنین خەوتوون و هەر تۆزقاڵێك لە خاکی ئەم زەوییە لە لەشی نازەنینێکا ...

| | |
|---|---|
| عومرێکی تورە هاتــــە | بێ کەڵك و بێ سەباتــە |
| ئاخری قەبری تەنگــــە | ئەوی کە لوت و لاتــە |
| دونیایەکی بــەلایــــە | پڕ دەرد و پڕ جـــەفایە |
| هانیایە پێوە بایـــــی | مەبـــن ، بەخـوا خەتیایە |
| خەونکی کورت و تاڵـــە | بێ فائیدە و بەتاڵـــــە |
| شریتی سینەمایـــــــە | کاکــە هەروەك خــەیاڵە |
| چەند خانەدان بەسەر چوو | چەند نازەنینی خـۆش روو |
| لە ژێر ئەم خاکە بوونـــە | خۆراکی مار و مێـــــروو |
| بۆ وا بەلار و لەنجـــــە | ئەرۆی بە نووکی پەنجـــە |
| تێ بفکرە لە ژێر پێـــت | هەر گۆڕی پێی گەنجـــە |
| زۆر عەیبە دەعیە لێـدان | بەسەر ئێسقانی ئینســـان |
| گەر ئەتوانی بە دەعیــە | بفرە بچۆرە ئاسمـــــان |

بێ کەس لە ١٩٤٨.١٢.١٨دا بۆ یەکجاری سەر ئەنێتەوە . بێ کەس جگە لە زمانی کوردی، عەرەبی و فارسی و تاڕادەیەك ئینگلیزیشی زانیوە. بەتایبەتی لە عەرەبیدا دەسێکی باڵای هەبووە . هۆنراوەیەکی زۆری عەرەبی لەبەربووە . هەروەها بڵاوە کە معلقاتی سبعە بە تەواوەتی لە بەر بووە .

بێکەس دووژنی هێناوە: یەکەمیان لە ساڵی ١٩٣٥دا، بەڵام پاش ساڵێك بە نەخۆشی دەردەباریکە کۆچی دواییکردووە و مردنەکەی کارێکی زۆری کردۆتە سەر دەروونی بێکەس و وای لێکردووە ماوەیەك گۆشەگیری ببێت. لەم ژنەی کچێك و لە ژنی دووهەمی دوو کچ و کوڕێکی بووە. کوڕەکەشی (شێرکۆ)یە .

## جگـەر خـوێـن
## باکوری کوردستان
**( ١٣٢٣ – ١٤٠٥ کۆچی ) ( ١٩٠٣ – ١٩٨٤ زاینی )**

مووسا کوری حەسەن کوری محمد ، ناسراو بە جگەر خوێن ، شاعیرێکی کوردە لە ساڵی ١٩٠٣ لە باکوری کوردستان لە گوندی حەسار نزیك بە شاری ماردین چاوی بە دونیا هەڵهێناوە ، بەمنداڵی شوانی و گاوانی کردووە ، لە بەر ئەوەی نەداری و هەژاری لە ناچاری گوندی حەسار جێدەهێڵن و لە ساڵی ١٩١٤ بۆ گوندی عاموودە دەگوێزنەوە . جگەر خوێن هەر لەمنداڵییەوە زیرەکی و هۆشیاری و توندوتۆڵی پێوە دیار بووە و حەزی لە خوێندن کردووە لە یەکێ لە قوتابخانەکانی حەسار خەریکی خوێندن بووە پاشان بۆ خوێندن چووەتە ماردین و لە خزمەت مەلا عبداللە ی ماردینیدا وانە شەرعییەکان دەخوێنێ و زۆر بە زیرەکانە قۆناغەکانی خوێندنی بەرێ کردووە وەك خوێندنی زمانی عەرەبی و زانستەکانی ئاینی ئیسلام ، بۆیە بە ئومێدی تەواو کردنی مۆڵەتی وەرگرتنی هەر دوانزە زانستەکە باکور و هەرچوار پارچەکەی کوردستان گەڕاوە دواتر لە سەر دەستی مامۆستا مەلا عبێد بروانامەی وەرگرتووە . بە رۆژئاوای کوردستان و ماوەیەکیش لە باشوری کوردستان و رۆژهەڵاتی کوردستان مەلایەتی کردووە . جگەرخوێن خوی، لە ساڵی ١٩٤٦ ی زاینی روودەکاتە شاری قامیشلی و دەست بەکاری رامیاری دەکات و دەبێت ئەندامی پارتی جڤاتا ئازادی و یەکیەتییا کورد لە ساڵا ١٩٤٨ ی زاینی دا دەبێتە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی سوری و لە ساڵی ١٩٥٤ ی زاینی بۆ ئەندامییەتی پەرلەمانی سوریا دەپاڵێورێت ، لە ساڵی ١٩٥٧ ی زاینی واز لە پارتی کۆمۆنیست دەهێنێت و رێکخراوی ئازادی دادەمەزرێنێت ، ئەو رێکخراوەش پاشتر دەچێتە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی سوریاوە ، لە ساڵی ١٩٥٩ ی زاینی جگەر خوێن روودەکاتە باشوری کوردستان و تا ساڵی ١٩٦٣ ی زاینی لە زانکۆی بەغدا دەبێتە مامۆستای وانەبێژ لە بەشی زمانی کوردی ، دواتر دەگەرێتەوە بۆ قامیشلی سەرقاڵی نوسین و کاری رامیاری دەبێت ، لەو ساڵەدا و لە شاری دیمەشق دەخرێتە نێو گرتووخانەوە . بۆ بەشداری کردن لە شۆرشەکەی مامۆستا مەلا مستەفای بارزانیدا جگەر خوێن لە ساڵی ١٩٦٩ روو دەکاتە کوردستانی باشور و چالاکی کوردایەتی خۆی پێشکەش بە شوۆرشی کورد دەکات . لە ساڵی ١٩٧٣دا بەرەو لوبنان دەچێت و لەوێش هۆنراوەی کیمە ئەز دەنوسێت . جگەرخوێن لە ساڵی ١٩٧٦ دەگەرێتە بۆ سوریا و لە ساڵی ١٩٧٩ ناچار دەبێت روو بکاتە وڵاتی سوید و لەوێ وەك پەناهەندەیەك دەگیرسێتەوە

و بەنوسینەوە خۆی سەرقاڵ دەکات و لە ٢٢/١٠/ ١٩٨٤ کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی بۆ قامیشلۆ دەگوێزرێتەوەو لەوێ بە خاکی کوردستان شوێن باوباپیرانی دەسپێدرێت ،کە لەسەر وەسیەتی خۆی پێش مردنی داوا کردبوو بیگەرێننەوە بۆ قامیشلۆ .

### شیعری گڵفرۆش لە جگەر خوێن

دواتر بەهۆکاری بینینی زۆرداری ئەوەی دوژمنان دژی کورد ئەنجامی دەدەن ، جگەر خوێن بەباشی دەزانی لە پیشەی مەلایەتی دووربکەوێتەوە و بەرۆحەیەتییەکی گەورە و بە بڕوایەکی هێندە بەتین بچیتە جیهانی کاری رامیاری و باوەڕەکەی و خۆشەویستی کوردستان بخزێنێتەوە جیهانی وێژە و بەوشەی ناسك دایبڕێژێ بۆ ئەوەی خوێنەران هەست بە ستەمی زۆرداران بکەن کە چۆن دژی گەلی کوردن بەکاریی گەری هۆنراوە نەتەوەییەکانی ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و شۆڕشە نەتەوەییەکەی شێخ سەعیدی پیران لە باکوری کوردستان لە ساڵی ١٩٢٥ ی زاینیدا ، بووە شاعیرێکی لێهاتووە هۆنراوەی نەتەوەیی و کەوتە سەر باسکردنی کوردستانی نیشتیمانی خۆشەویستی و هاندانی ئافرەتی کورد بۆ خوێندن و خەباتی نیشتمانی و بڵاوکردنەوەی بیر و باوەڕی کوردایەتی لە سەرەتادا هۆنراوەیەکی نەتەوەیی لە باسی کوردستاندا بە ناو نیشانی شام شەکرە ، وڵات شیرینترە دایناوە و نیشتیمانەکەی خۆی بە بووکی جیهانی دادەنێ و باخ و بەهەشت مێرگ و سەرچاوەی ئاوی سازگاری دەچوێنێ و بە کچێکی شۆخ و شەنگی جوان و رازاوەی دادەنێ و ئەندامەکانی ئەو بووکەی کوردستان بە تاجی سەلاحەدینی ئەیووبی و بە رۆژ و دەریا و ئەلماس و دیوانەکانی هۆنراوەی حاجی قادر و ئەحمەدی خانی دەچوێنێ و دەڵێت

وەڵامی من تووی بووکا جیـــهـــانـــی
هەمی باغ و بەهشت و مێرگ و کـــانـــی

شەپل و شەنگ و شۆخ و ناز و گول و روو
گەلەك شیرین و رند و پر جـــوانـــی

سەری تاجا سەلاحەدینـــی کـــوردی
ئەنی رۆژە دەبور جا ئاســـمـــانـــی

دوو برهێن تە کە دەڤانێ روستەمێ زاڵ

دوو زولفێن ته ژ تیرێن قەهرەمانـــــی

دوو چاڤێن تەوەکی دەریایی هورمـــز

کەپوو ئەلماسە کاری کووش و وانـــــی

دوو زولفین تەکتێبا حاجـــی قـــادر

زمانێ تە ژ بەندا شێخی خـــانـــــی

جگەر خوێنە کورێ تە هەردنـــالـــــی

ژ بـــەرژانـــا نـــەزانـــی و نەزانـــــی

واتە : ئەی وڵاتی من تۆ بووکی جیهانی

هەموو جێگایەکی تۆ باغ و مێرگ و کانییە و وەکو بەهەشتی

بەراستی تۆ وەکو بوکێکی شۆخ و شەنگ و روومەت گوڵی

گەلێ شیرین و رەند و جوانی

تۆ تاجی سەری سەلاحەدینی کوردی

تەوێڵت وەکو رۆژ لە کەلووی ئاسماندا دەدرەوشێتەوە

برۆکانت کەوانی رۆستەمی زاڵە

زوڵفەکانت وەکو تیری قارەمانە

چاوەکانت وەکو دەریای هۆرمزن

وە لوتت وەکو ئەلماسی شارەکانی مووش و وانن

لێوانت وەکو دیوانی حاجی قادری کۆیی شیرینن

وە زمانت چیرۆکی شێخ ئەحمەدی خانیە

جگەر خوێن کوڕی تۆ هەموو دەم هەر دەناڵێنێ

وە لە ئێش و دەرد شتێ هەست ناکا

دوای ئەم باسە جوانەی کوردستانی نیشتیمانی خۆشەویست داوا لە کچانی کورد دەکات ، راپەرن و بکەونە سە رخوێن و لە خەزی بێهۆشیدا هۆشیار بنەوە و پێیان دەڵێت : گەر بخوێنن پێشدەکەون و گەر نەشخوێنن کەس ئیش و دەردمان لێ دوور ناخاتەوە .جگەر خوێن توانی ئەو باوەڕەی هەیبوو بیگەیەنێتە ئەو ئاستەی بە نەمری بمێنێتەوە و نەوەی

ئەوسا و ئەمڕۆ و سبەی لە خوێندنەوەی هۆنراوە و پەخشان و فەرهەنگ و ڕێزکانی کوردی سوودمەندبن .

جگەر خوێن بە یەکێ لە گەورەترین هۆنەرانی کورد دێتە ئەژمار و ئەو لەبەر ئەوەی رۆژگارێکی بە هەژاری و برسێیتی و ڕەش و رووتی و بێچارەیی و دەربەدەری بردە سەر و بەرگەی هەموو چەشنە ئەشکەنجە و ئازارێکی گرت و هۆنراوەکانی نوێنگەی هەژاری و بەدبەختی و رۆژە ڕەشی و بەربەرەکانی بێ وچانی کوردەکانە ، لە بەرامبەری رژێمی دیکتاتۆری ئەتاتورکدا ، هۆنراوەکانی رازی ئەبەزی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە ، رازی خەم و شادی کۆمەڵی کوردەواریمان بۆ دەردەخەن ، هۆنراوەکانی لەسەرچاوەی ژیانی کوردەوارییەوە هەڵیقوڵیون ، بریتییە لە ژیان و ئەوین و بەربەرەکانی گەلی کورد و لەوانەدا مزگێنی پیرۆزی و سەرکەوتنی داوەتە خەڵك .

ئەو لە هۆنییەوەی هۆنراو و نوسینی پەخشاندا مامۆستا بووە ، جگەر خوێن هۆنراوەکانی لەسەر سنووری هۆنەرانی کۆن و نوێ دا هۆنیوەتەوە و لە راستەقینەدا ناتوانین ئەو هۆنەرێکی لاسایی کەر دانێین بەڵکو زۆربەی هۆنراوەکانی لەسەر شێوەی نوێ هۆنیوەتەوە ، وەکو لەم پارچە هەڵبەستەدا ئامۆژگاری کۆمەڵەکەی خۆی دەکات و دەڵێ :

کردنۆ مەردن و پڕ خوەشە سەرخوەبـــــوون
ئەو دەمێ تار و تەنگ مەدین ڤــانە چـــوون
دەست بدەن هەڤ هەمی پیش کـەڤــن هەمی
دابچن بۆ وەلات یان مــرن یـــان فـــەلات
رۆژ لەمە هاتە سەر زوو هشیــار بــن ژ خـــەو
ئەو دەما جەنگ و شەڕ پڕ پاش کەتن تینی هەڤ
دەست بدن هەڤ هەمی پێش کەڤن ئەم هەمــی
دابچن بۆ وەلات یــان مــرن یــان خــەلات
مە دڤێن ئول و بەخت مە دڤێن سەرخوەبــوون
مە دڤێن تاج و تەخت ، مە دڤێن پێشڤە چــوون
دەست بدن هەڤ هەمی پێش کەڤن ئەم هەمی
دەربچن بۆ وەلات رزگـــار کــەن فــەلاك

واته : ئەی کوردی نەبەز ! چەندە خۆشە ئازادی / ئەو ڕۆژگارە تاریکەی کە دیمان خەریکە لە ناو دەچێ / دەست بدەینە دەستی یەکتر و ڕێی پێشکەوتن بگرینە بەر

تا بەرەو ولات بڕۆین یان مەرگ ، یان ئازادی

هەتاو هەلهاتووە و هەمووان دەبێ لە خەو ڕاپەڕین

ئێستا کاتی شەڕ لە گەڵ دوژمندایە و هەمووان دەبێ پاشەکشێ بە دوژمن بکەین

دەست بدەین دەستی یەکتر و ڕێی پێشکەوتن بگرینە بەر

تا بەرەو ولات بڕۆین یان مەرگ یان ئازادی

من بەختەوەری و پێشڕەوتی خەلکم دەوێ

دەست بە دەستی یەکتر دەین و لەگەڵ یەکدا ڕێی پێکەوتن بگرینە بەر

هەموو بۆ نیشتیمانی خۆمان تێکۆشین و لەدەستی بێگانە ڕزگاری کەین

جگەر خوێن بە هەستی پڕ سۆزی نەتەوایەتی ، هەڵویستی شاعیری نەتەوەیی کورد ئەسیری پەسەند دەکات و ستایشێکی جوانی بەهۆنراوە کردووە لە هۆنراوەیەکیدا بە نازی بەر دیلك واتا خۆشەویستی لە ژمارەی ١٠ ی ساڵی ١٩٣٢ ی گۆڤاری هاوار لە شامدا بلاوکردووەتەوە و بەم جۆرە دەست بە ستایشەکەی دەکات :

ئەی برای شەهبازی ئەو جی فەن و هەم عیرفانی توو

سەد وەکی ابن الاسیر ی گووری و قوربانی توو !

جگەر خوێن و ئافرەت

ئەی کچێ رابەرە بخوێنە تو سەربەست هەر بژی

زوو ژ خەو توو سەرهەلێنە بەس بمێنە بێ مەژی

گەر بخوێنی دێ بدی خواندن تۆ ئێ هونەرتەڤا

گەر نەخوێنی کەس ژ بوومە ئێی و دەردان ئاکوژی

دابیژن هەر بژی کورد هەر بژی کورد هەر بژی

بەهەرمەکانی

دیوانی ئاڤیستای جگەر خوێن

دیوانی یەکەم : پریسك و پەتی ساڵی ١٩٤٥ ی زاینی دیمەشق .

دیوانی دووەم : سەورا ئازادی ساڵی ١٩٥٤ ی زاینی دیمەشق .

دیوانی سێهەم : کیمە ئەز ساڵی ١٩٧٣ ی زاینی دیمەشق .

دیوانی چوارەم : رۆناك ساڵی ١٩٨٠ ی زاینی ستۆکهۆڵم .

دیوانی پێنجەم : زەند ئاڤستا ساڵی ١٩٨٢ ی زاینی ستۆکهۆڵم .

دیوانی شەشەم : شەفەق ساڵی ١٩٨٢ ی زاینی ستۆکهۆڵم .

دیوانی حەوتەم : هێڤی ساڵی ١٩٨٣ ی زاینی ستۆکهۆڵم .

دیوانی هەشتەم : ئاستی ساڵی ١٩٨٥ ی زاینی ستۆکهۆڵم .

دەستورا زمانێ کوردی ساڵی ١٩٦١ ی زاینی بەغداد .

فەرهەنگی ( پەرچێ یەکەم) ساڵی ١٩٦٢ ی زاینی بەغداد .

فەرهەنگی ( پەرچێ دووەم) ساڵی ١٩٦٢ ی زاینی بەغداد .

## دڵـــــزار

### دڵــزار ( ١٩٢٠ – ٠٠٠٠ ) باشوری کوردستان

ئاوازی ئاشتی و ئازادیە، جوانی یە ، پێشمەرگەیە ،جەنگاوەرە ، ڕەنجبەرە ، تێکۆشەرە ، قارەمانە ، ڕۆژنامەنووسە ، کێوی سەرسەختی ، خەبات و ژیان و بەرخۆدانە دڵزار ........

شاعیری گەورەی گەلەکەمان ئەحمەدی کوڕی مستەفای حەوێزی یە نازناوی شیعریی دڵزارە ، لەساڵی ١٩٢٠ لەشاری کۆیە( کۆیسنجاق) ، شاری حاجی قادر و دڵداری مەزن لەدایکبووە ، برای شاعیرانی کورد خاتوو فریشتە و کەریم شارەزایە و چاوەگەشەکانی بە دیمەنی چیاکانی باواجی و هەیبەت سوڵتان و ئاوەگرد و سەیرانگاکانی ئەم شارە کراونەتەوە ، هەرلە کۆیە خوێندنی سوختەخانەی و سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردووە . پاشان کتێبخانەیەکی داناوە بە ناوی کتێبخانەی کۆیە ، وە ماوەیەکیش لە ڕۆژنامە گەری کوردیدا کاری کردووە .

شاعیر لە ساڵی (١٩٤٦) ەوە تا ئەمرۆ کە دەکاتە ٦٤ ساڵ ،جگە لە چەند ساڵێک ،هەرهەموو ژیانی لە بەندیخانەکان و پێشمەرگایەتی و دەربەدەری و غوربەت و پتر لە١٥ ساڵیش لەماڵ و منداڵەکانی دابڕاوە . دڵزار لە تەمەنی بیست ساڵی دەستی بەشیعر دانان کردوە ، بەچاکی فێری زمانەکانی ( کوردی ، عەرەبی وفارسی) بووە .

وە چەند وڵاتێك گەڕاوە وەکو ( فەلەستین و سووریە و لوبنان و قوبرس. وە هەموو چەشنە کارێکی کردووە وەکو باخەوانی و کرێکاری ، بەڵام لە هەرکوێ ببوایە هەر خەریکی خوێندنەوەی پەڕاوی کوردی بووە . هۆنراوەکانی گەلێ سادە و جوان و رەوانن و تەنانەت هەڵبەستەکانی لە لایەن گۆرانیبێژانەوە کراون بە گۆرانی ، بەڵام زۆربەی هەڵبەستەکانی نیشتیمانین ، چونکە ئەو نیشتیمان پەروەرێکی هەرە بەرزە و تا ئێستا سێ کۆمەڵە هۆنراوەی بە ناوی ( ئاوازی ئاشتی و ئازادی ، خەبات و ژیان ، شیعرە بەناوبانگەکەی مایکۆفسکی ) .

زۆربەی هۆنراوەکانی دڵزار لە لە ژیانی کوردەوارییەوە سەرچاوەی گرتووە و پتر پەیوەندییان بە هەڵسوکەوتی کوردەوارییەوەیە وە ئەو حەز لە ڕێ و ڕەوشتەکانی گەلی کورد دەکا کە یەکێ لەو ڕێ و ڕەوشتانە ساڵی نوێی نەورۆزە و ئەو نەورۆزەی کە گەلی تێیدا سەرکەوت ، وەکو لەم پارچە هۆنراوەدا ئەوەمان بۆ دەردەخات و دەڵێ :

مژدە لەم گەل و هــۆزە زەمین بووەتـــە پیـرۆزە

ڕۆژێکی زۆر پیرۆزە | جەژنی نەورۆزە
---|---

جەژنی قومری و هەوزارە | کزی گوڵ و گوڵزارە
---|---
دەشت و دمر مێر غوزارە | تازە بەهارە

چەمەن جوان و ڕەنگینە | هەوا پاک و عەترینە
---|---
مێرغوزار گەش و شینە | هەموێنی ژینە

گەڵ لە گەڵشەن خەملیوە | بەرگی داخی دڕیوە
---|---
بۆ بولبول پێکەنیوە | شادی کڕیوە

لە بن چڵی چناران | لە ژێر سایەی هەناران
---|---
لە دەم باخ و ڕووباران | پۆلی نیگاران

وەک گوڵاڵە پەخشانم | بزوێنەری دڵاتم
---|---
گوڵی چڵی ژیانم | ئارامی گیانم

لە ناو گوڵان وەکو هەنگ | یان پەپولەی ڕەنگا و ڕەنگ
---|---
نمونەهاڵانی قەشەنگ | جوان و شۆخ و شەنگ

هاتووجۆیانە شادن | واتێەگەن ئازادن
---|---
لە ناوچە و جەرگی دادن | کاوە نەژادن

*****************

دڵزار حەز لە ئازادی دەکات ، ئازادییەک کە گەل بتوانێ قسەکانی خۆی دەربڕێ و ئەوەی کە لە گەڵیدایە بیدرکێنێ بە بێ ئەوەی ترسی لە کەس بێ ، ئازادییەک کە ببێتە هۆی ئاشتی گەلان تا هەموو بەیەکەوە وەکو برا ژیان بەرنە سەر ...

ئازادییەک کە ببێتە هۆی شادی و سەربەستی خەڵک وەکو دەڵێ :

ئازادی تۆ گوڵاوی   گوڵی گەشی بەهەشتی

تۆ عەتری نێرگز جاڕو   سومبول زارانی دەستی

پرشنگی ڕۆژو ورشەی   ئەستێرانی درشتی

ئاوازی بولبولانی   گەش و وڵی گوڵانی

سەربەرزی و کامـــەرانـی  ئاسایشو هەرزانــــی
پرشنگی چاوی کـــالـی  بریقەی کولمی ئالـــی
زەردەخەنەی منــــالی  شنەشنی شەمالـــــی
دەنگی کــەمانـی دووری  رەنگی شەفەقی سووری
بەراستی ئـــەی ئـــازادی  چرای شەقامی شـــادی
بێ تۆ بێ سوودی جوانـی          بێ نەشەیە گۆرانــــی
تاریکیە روونـــــاکـی  تەیری عەنقایە چاکـــی
ناخۆشە دەنـگی بولبـــول          گرانە بۆنی سومبـــوول
جوانی گەرمان و کوێستان          بێ ئازاد بوونی ئینسان
وەك جوانی کۆشکی زۆردار          بێ بەهایە بۆ هـــەژار

دلزار کۆمەلە دوو بەیتییەکانی بابە تایەری هەمەدانی لە زاراوەی لورییەوە کردووە بە شێوەی سۆرانی و ناوی ناوە گەنجینە و بلاوی کردوونەوە و بەراستی هونەری تیا نواندوون و گەلێ خۆی پێیانەوە ماندوو کردووە و دیاریەکی نایابی پێشکەش بە نەتەوەکەی کردووە و بابە تایەری باشتر ناسیوە بە خوێندەواری کوردی ناساندووە ، چونکە لوڕیش یەکێ لە زاراوەکانی کوردیە ، بەلام هەموو سۆرانی زمانێك ، لێی تێناگات و ئەمەش کارێکی گرنگە.

ئەمەش چەند دووبەیتییەکە کە دلزار کردوونیتە سۆرانی و دەلێ :

غەیری تۆ نیمە لـــەســەر ســەودایـــەك          لە دلدا نیمە هیچ تەمـــــانایـــــەك
خودا دەیزانێ لــــە بــــازاری عیـــشــق          غەیری گیان هەرگیز نیمە کـــالایـــەك

هەر باغێ سەولی کـــەســـەر بەدەر بێ          مادام باخەوان خوێنین جـــگــــەر بێ
ئەبێ هەلکەنرێ لە بێـــخ و لـــە بـــن          گەر بەری هەمووی لەعل و گەوهەر بێـــ

من بە بی سەر و سامان خـــولقــــاوم          پەرت و پەرێشان گـــیان خـــولقـــاوم
دلێ پەرێشانان رەویشتنە ژێـــر خـــــاك          من لە خاکەکەی ئـــەوا خــــولقـــاوم

ئەی لالە چێنان ، لالـــە مـــــەچێنـــن          باخەوانان واز لە گـــولێ بێنـــــــن
پەیمانی گولان ئەوەی بـــێ کـــە دیـــم          گول ریشە کێش کـــەن درك بچێنـــن

من کە سەرمەستی شەرابی ســـوور بـــم          بۆچی لە یاری نـــازدار بە دوور بـــم
گـــەر لـــە ئاکـــرت گـــەرمـــی نەبینــم          بۆ بە دۆکەلت دیـــــدە بێ نوور بــــم

وای لەو ڕۆژەی کە گۆڕی من دەکەن تەنگ　　بەسەرما دادەکەن خاك و چەو و سەنــــگ
نە پێی ڕاکردنم هــــەس مــــن لە مــاران　　نەدەستم هەس لە گەڵ کرمان بکەم جەنگ

وەرە ئەی دڵ ســووتــاو پێکــڕا بناڵیــن　　وەرە پەروانـــــە توخــــوا بـــا بناڵین
لە عەشقــــی شــــاکوڵی ڕەعنــا بناڵین　　لە دەستی یاری بێــــــ پــــەروا بناڵین

جگەر پڕ دەرد هەتا کەی هاتوچــۆ کـــەم　　بەتەنیا فەرد هەتا کــــەی هاتوچۆ کــــەم
ئیتر بۆچــــی دەڵێــی نایــــەتــە مــاڵــم　　لە ڕوویە زەرد هەتا کــــەی هاتوچۆ کـەم

هەموو بەند و جومگەی لەشم وەك نـەیــــە　　مادام دەردی دووریـــــت لـــە دوما هەیە
ئەمەی تا قیامەت دەســوتێم بــە تــــاو　　خودا خۆی دەزانێ قیــــامــــەت کـــەیە

بە بێ تۆ لێم حەرام بێ لالــــــە و گــــوڵ　　بە بێ تۆ لێم حەرام بێ دەنگی بولبـــــول
حەرام بێ لێم بە بــــــێ تـــــۆ دابنێــم　　لە پای گوڵ بوون بنۆشم پیاڵەی مــــــوڵ

لەم بارەیەوە لە بەشێکی هۆنراوەی (٧٢ ساڵی تەمەنم ڕۆیی) ، کە لە وڵاتی سوید نووسیویەتی و دەڵێ :-

هەشتی یەکی هەزارو نۆسەدونــــــــــەوەت و دوو
حەفتاودووساڵی ڕەبەق لە تەمەنم تــــــەواوبـــوو

وەك کەسانێکی ئازاد ، ژینی ئاسایی نەژیایـــــن
دوای بەندی و پارتیزانی ئێستاش واڵەغوربەتایــن

بەڵام ئەوەی کە مایەی سەبەرزی و شانـــازیــــە
سەرشۆڕنەکردنمان و خەبات و گیانبـــازی یــــە

هەشتی جەنوەری ساڵی هەزارو نۆسەدوبیست بــوو
لەدایك بوونی دڵزار لەشاری کۆی خۆشەویست بوو

دڵزار لەساڵی( ١٩٤٦ ) دا لە کۆیە هۆنراوەیەکی بەناونیشانی( داری ئازادی) داناوە کەدواتر بووە بەیەکێك لەگۆرانی یەکانی هونەرمەندی نەمر مامۆستا( تایەر تۆفیق) و بەم جۆرە دەست پێدەکات:-

ئەگەر لە گەڵ یەك راست و دڵپاك بین

بۆ یەکتر باب و برازاو کاك بیـــن

بۆسەر قەڵاتی خوێنمژ ئاو ئەدەیـــن

بەختیار ئەبین دوژمن قاو ئەدەیـن

داری ئازادی بەخوێن ئاوئەدەیـــن

دڵزار لەساڵی ( ١٩٥٠) دا لە بەندیخانەی کووت هۆنراوەیەکی بەهێزو پێزی بەناونیشانی ( شاگردانی فەهدین) داناوە و کەچەند دێڕێکی لێ دەخەینە ڕوو:-

کەشاگردانی فەهدی قارەمانیـــن   لەتیکۆشانی خوێنین بێ وچانـــین

لەبۆ لەتکردنی جەرگی ستەمکـــار   بەوێنەی خەنجەری تیژی دەبانیـــن

بەرامبەر دوژمنی خوێنرێژی زۆردار   لەمەیدانی شەڕا شێری ژیانیـــن

لەفاشیزم نەمان و مانی میللـــەت   هەموو باوەڕ بەهێزو بێ گومانین.

هەروەها شاعیری نەتەوەییمان لەساڵی( ١٩٤٩ ) لەگەڵ بیستنی هەواڵی جەرگبڕی لەسێدارەدانی دامەزرێنەرانی پارتی کومۆنیستی عێراق ، هاوڕێیانی نەمر (فەهد ، سارم و حازم )، هۆنراوەیەکی بەناونیشانی (بۆ هاوڕێیانی نەمر) داناوەو بەم جۆرە دەست پێدەکات -:

ئەوا باڵی رەشی شوومی شەوی ئیرهابی ئیستعمـــــار

بەسەر خاکی عێراقا راکشا دایپۆشی شـــــارەوشـــار

لەپاش پەکخستنی گشت جۆرە ئازادی دیموکراتـــــی

بەهۆی عورفی هەزاران گەنجی ئازاد پەروەرو و هوشـــیار

رەتێنران دەربەدەربوون، لێدران ،مەحکوم کران گیـــران

لەبەندیخانەکان پەسران بەبێ ئیسپات و بێ پرسیـــار

بەمەش دوژمن ، لەدڵ ترسی نەچۆ دەر زانی بێ سوودە

لەگەڵ ئازادی خوازانی بەکار، بێ کارە گشت ئـــازار

ئیتر هەستا پەنای خۆی بردە بەر ئاخر چەکی پیســـی

لە بۆ سێ قوتبەکەی حزبی شیوعی جا لە سێ ئاقـــار

چەقاندی داری سێدارە لە چواردەی دووی چل و نــۆدا

وەکو( بیری)ە نەمر هاوڕێ شەبیبی و فەهدی جەوهەردار
بەسەر کەوتن بەسەر بەرزی لەبۆ سەرداری سێـــــدارە
هوتافیان کرد بەگیانی میللەت و فەوتانی ئیستعمـــــار
لەبۆ ڕۆژی دووەم هاوڕێ زەکی بوو بەقــــــوربانــی
وڵات و میللەت و حزبی شیوعی کارگـــەرو جوتیـــار

شاعیر لە ساڵی (١٩٥٥)لە گەڵ کاکەی فەلاح کە ئەوکاتە ئەندامی لێژنەی ناوەندی و لێپرسراوی( لقی کوردی حیزبی شیوعی عیراق) بوو ڕۆژنامەی( ئازادی) نهێنیان دەردەکرد ، لەدوای شۆڕشی ١٤ تەممووز بوو بە نووسەرێکی هەفتەنامەی ( ئازادی) ئازاد و ئاشکرا لەگەل ( گۆرانی شاعیر و کاکە حەمەی مەلا کەریم و حەمەکەریم فتح الله و حسین عارف) ی هاورێی ، خاوەن ئیمتیازی حەفتەنامەی (ئازادی) شەهیدی نەمر (نافع مەلا یونس) ، ی پارێزەرو ڕۆژنامەنووس بوو .

وە هەروەها دڵزاری شاعیر بۆ زانست و زانیاری گەلەکەی ئەدوێ و دەڵێ ...

هێزی یەکێتی و چرای زانســــتــــی
کورد رزگار دەکا لە ژێنی پەســـتــــی
خوێندنە خوێنی دڵی میللـــەتـــان
زانینە دەوای دەرد و عیللـــەتـــان
میللەتی نەزان ســـــووك و رسوایـــە
گەنجی بۆ خەڵکە و رەنجی بە بایـــە
بەخوێنە ئەی کورد ، چونکە بە خوێندن
تۆ رزگار دەبی ، لە چنگی دوژمــــن
چەند هەزار ساڵە ، بەندە و هـــەژاری
چونکە نەزان و نەخـــوێنـــدەواری
هێزی تاریکی و جەهــــل و بێ داری
لە پێش لەشکری ، عیلم و ئـــازادی
ئەگەر زەمین و زەریاش داگـــــرێ

بێ شك شكاوه ، هیچ خۆی ناگـــرێ

له هۆنراوه‌كانی ئه‌م شاعیره وا ده‌رده‌كه‌وێ زۆر په‌رۆش بووه بۆ گه‌له‌كه‌ی كه دوورن له خوێندن و به خوێندنه‌وه و زانسته‌وه خۆیان خه‌ریك ناكه‌ن ، بۆیه ئاماژه ده‌كات تا دوور بكه‌وینه‌وه له زانست و خوێندن ئه‌وا زیاتر دوور ده‌كه‌وینه‌وه له ئازادی و سه‌ربه‌ستی و رزگاربوون له ژێر ده‌ستی بێگانه ، بۆیه به هۆنراوه چڕی خۆی هاوار ده‌كاته گه‌له‌كه‌ی كه خوێندن و چراو هێز و سوپا و ده‌وڵه‌ت و ژیانی خۆش و ئارامی ده‌سته‌به‌ر ده‌كرێت ، ئه‌گه‌ر خوێندن نه‌بێت و نه‌خوێنده‌واری باڵ بكێشێت به‌سه‌ر گه‌له‌كه‌ماندا ته‌نها نۆكه‌ری و نه‌زانین و جه‌هل و دواكه‌وتووی نه‌بێت به‌ده‌ست دێ هیچی باش به‌ده‌ست نایه‌ت .

## دڵدار

### باشوری کوردستان

( ۱۳۲۷ – ۱۳٦۸ ك ) ( ۱۹۱۸ – ۱۹٤۸ ز )

دڵدار، ناوی یونسی کوڕی مەلا ڕەئوفی کوڕی مەحمودی کوڕی مەلا سەعدی خادم ئەلسجادەیە لە ڕۆژی ۲۰ی شوباتی ساڵی ۱۹۱۸دا لە شاری کۆیە هاتۆتە ژیانەوە .

لەبەرئەوەی ئەم وڵاتە لە ژێردەستی تورکەکاندا دەیناڵاند و میری نەخۆشەکەی تورکیاش، بەهۆی ئەوەوە لە شەڕی یەکەمدا شکابوو و تەواو پەرێشان و کەنەفت بوو، گرانی و قاتوقڕی و نەخۆشی و بێدەرەتانی، وەك هەموو وڵاتێکی گیرۆدەی دەستی شەڕ و وێرانی، ئەم کوردستانەشی ئابلۆقە دابوو.

ئێستەش چیرۆکی سامناکی شەڕی سەفەربەرلگ و ئاوارەیی و کوشتن و تاڵان و بڕۆ و بێگار و سەرانە و لافاوی نەخۆشی و کارەساتی ڕۆژانەی ژەندرمەکان و لە برسانا بە کۆمەڵ مردن و نرکە و ناڵەی منداڵ و ئافرەت و پیری لێقەوماو و بێدەرەتان بەسەر دەمی هەموو ئەو پیرانەوەیە کە دڵ و زمانیان بە ئاگری ئەو شەڕە برژاوە و خۆیشیان نازانن چۆن ماون و بۆچی لەو کاروانی مردن و کۆچکردنە دابڕاون و ڕێگایان هەڵەکردوە ... هتد.

لەو گێژاوە سەختەدا "دڵدار" سەری هەڵداوە و هاتۆتە جیهانەوە . باوکی فەرمانبەرێکی بچووك بوە و لە ناو هەژاری و نەبوونی و گەڕان بە شوێن پاروە نانێکی ژیان و گوزەریدا، خێزانەکەیان زۆر تاڵ و سوێری و سارد و گەرمی چەشتوە ، پاش ماوەیەك باوکی دەکەن بە فەرمانبەری سەرژمێری ڕانیە و لە تەمەنی دە ساڵیدا "دڵدار" دەخرێتە قوتابخانەوە و پۆلی یەك و دووی سەرەتایی لە ڕانیە تەواوکردوە .

دڵدار لە بارەی ژیانی ڕانیەوە دەڵێت: "هەرچەند ڕۆژێکی چاك و چوار ڕۆژانیش نەخۆش بووم، سەرەڕای ئەوەش ڕانیەم هەر لەلا خۆش بوو، بە تایبەتی سەوداسەری قولـلە بووم. هەر کاتێ چاك بووبامایەوە ، مەلەم لە ڕووبارەکە و لە بن دار بییەکان ڕاوەچۆلەکەم دەکرد."

دوای ماوەیەکی کەم باوکی لەسەر فەرمانەکەی لادەبەن و ناچار بەماڵەوە دەگەڕێنەوە بۆ کۆیە و خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە تەواو دەکات. لە بارەی خولیای هۆنراوەی و چێژ لێ وەرگرتنی خۆیەوە دەڵێت: "هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم، کە دیوانی حاجی قادری کۆییم زۆرتری لەبەر کردبوو، هەمیشە بە وردی سەرنجم لە هەڵبەستەکانی عەونی و

راجی و عاسی و حسێنی و هیرانی دەدا و لەبەریشم دەکردن، بەوانەش دابین نەبووم هەڵبەستی هەرکەسێکم دەستبکەوتایە دەمنووسیەوە و لەبەریشم دەکردن.

بەتایبەتی هەڵبەستی وەفایی، کوردی، بێکەس، پیرەمێردم زۆر لەبەرکردن و هەر لەو ساڵەدا هەستم بەوە دەکرد، کە چێژ لە هەڵبەست وەرگرم و زۆر گیرۆدەی بووم." هەروەها لە بارەی سەرەتای خۆ تاقی کردنەوە بە شیعر دەڵێت:

"لە ١٩٣٥دا لە پۆلی یەکی ناوەندیدا بووم، کە دیوانی 'نالی'م زۆر بەوردی خوێندەوە ، هەڵبەستە جوانەکانی 'نالی' لەگەڵ هەڵبەستە ئاگرینەکانی حاجی قادری لەسەر پێشەوایەتی وێژەی لە مێشکمدا شەڕیان بوو. ئەو کێشەکێشە دەرگای هونەری شاعیری لێکردمەوە ، زۆر کەڵکەڵەی وام لە کەلەدا بوو حەزم دەکرد لە بۆتەی هەڵبەستەدا دایڕیژم. ئەوجا بەناو خەڵکیاندا بڵاوبکەمەوە و ئیتر هەر خۆم تاقیکردەوە ."

دڵدار، یەکەمین هۆنراوەی لە ساڵی ١٩٣٥دا داناوە و لە ژمارەی ٢ی ساڵی ١٩٣٥دا لە گۆڤاری "ڕووناکی"دا بڵاوکردۆتەوە .لە ساڵی ١٩٤٠دا لە شاری کەرکوک قۆناغی دواناوەندی تەواو دەکات و ئینجا ڕوو دەکات بەغدا و چۆتە کۆلێژی یاسا و ساڵی ١٩٤٥ بڕوانامەی کۆلێژی یاسایی وەردەگرێت و دەبێتە پارێزەر. دڵدار لە هۆنەرانی هەرەبەرزی کورد دێتە ئەژمار ، گەرچی تەمەنی کەم بووە و هۆنراوەی کەمی لە شوێن بەجێ ماوە ، بەڵام ئەو هۆنراوانەی وا لە شوێنی بەجێ ماون پلەوپایەی هونەریەتی ئەومان بۆ دەردەخەن .

لە پارچە هەڵبەستێکیدا لاوان هاندەدات کە فێری زانست بن لەبەرابەری نەزانیدا ڕاوەستن و بەچاك و خۆشی لەگەڵ یەکدا ژیان بەرنە سەر و دڵیان پڕ بێ لە خوا پەرەستی ، وەکو دەڵێ :

ئەرێ ئەو لاو لە هیچ وەختێ نەك مەئیوسی ژینــت بـــــێ
ئەبێ هەردەم عەزمەدار و دەوای دەرد و بـــرینت بـــــێ
لە مەیدانی تەقەدومدا تەلاش ئەسپی نەجـــاتت بـــــێ
لەغاوی ئەسپەکەت فیکر و عیلم و ئـــاو زینگ و زینت بــێ
بەڵێ دائیم هونەرمەند بە لە مـــەیدانـــی نـــەبــەردیــدا
بەهۆی عەقڵ و هونەرمەندیت دەبێ تیشکـــی زەمینـــت بــێ
لە نێو گەلدا ئەبێ ئیعلانی جەنگی وەتەن جێگای کەمینت بێ
لە ڕێگای شان و بەرزیدا دوور ئەندێشیکــــــی وریا بـــــە

مەنافع پەروەری میللەت ئەبێ ئامانجی ژنــــت بـــــێ
نەکەی بۆ بەرزی ئەنجامت برای خوێنیت لە بەنـدی کـــەی
بە بەرزی شاد و مەسرور بە نزمی ژنی شینــــت بـــێ
لەوەختی گەنجی گەنجیدا ئەبێ رەنجێکی گـــەنجیـــدەی
نەوەك وەختێ برەنجێنی لە نێو جێگا و نوێنــــت بــــێ
لە دونیادا حەقی ژنت هەیە تاکو نەفـــەس دانێــــــی
بەلاّم چاکە و رەوشتی چاك ئەبێ ئاین و دینـت بــــێ
ئەگەر لاونکی کوردی تۆ دەبێ دڵپاك و بـــالا بــــــێ
نەوەك ( دڵدار ) ی دڵ پەروەر دڵت قورئانی دینـت بـــێ

گەرچی هۆنراوەکانی دڵدار لە هەموو بارێکەوە بەرز و قوڵ نین ، بەلاّم دەتوانین ئەو هۆنراوانە بە وێنەیەکی هۆنراوی نوێی دابنێن ، دڵدار لە هۆنینەوەی هۆنراودا کەمتر وشەی رەق و بێگانەی بەکار هێناوە ، وە بە وشەی رەنگاورەنگ و رەسەنی کوردی رازاندوویەتیەوە

دڵدار لە زێد و مەڵبەندی حاجی قادردا هاتووەتە جیهانەوە ، بۆیە دڵدار لە هەندێ هۆنراوەکانیدا پەیڕەوی لەو کردووە و لەسەر ڕێی و شوێنی ئەو ڕۆیشتووە و لە پارچە هەڵبەستێکیدا باسی هەندێ دەرد و رەنجی کۆمەلاّیەتی دەکا و چارەسەرکردنی ئەم دەردەش پیشاندەدا ، وەکو دەڵێ :

دڵ بەدوی ئەفسانە کەوتوو وای ئەزانی وا ئەبـــێ
ئیشی دونیا رەنجی پێ ناوێ بەخۆی کوتا ئەبـــێ

نەی ئەزانی ئەو رە عارەقداری هیوا ئاو بــــــدا
گەر بە خوێن پەینی بکا ئەوجا سەمەر پەیدا ئەکـــا

لەفزی نابێ ، نابێ بیزانی کە لاوی کوردی تـــۆ
هەر بە کۆشش دێتە بەر باغی ئەمەل ئەحیا ئەبـــێ

تالع و ئیقباڵە وەهمی پای بەندی بـــێ هونــــەر
کاری چاکی ڕێ بخەی ، عەزمت هەبێ خۆی چا ئەبێ

ئەی برا ! لادە لە فیکری کۆن و زوو ســـا راپـــەڕە

عەزمی مەردانەت ببێ هەرچیت نیاز بێ وا ئەبـــــێ

مردنە ژینت بە بێ کاری لە ســـتـــی لابـــدە

هەر بە ڕەنجی لاوی وەك تۆ نیشتمان ئـــاوا ئەبـــێ

دڵداریش وەك شاعیرانی تر لە هۆنینەوەی هۆنراوەی دڵداریشدا دەستێکی بالای بووە و لەم بارەیەوە هۆنراوەکانی سوارە و پتر لاسایی هۆنەرانی هەورامی بێژی کردووەتەوە و هەر لە سەر ڕەوشتی بە دەهیجایی هۆنیویەتەوە ، کە کێشێکی خۆماڵیە ، وەك لەم هۆنراوانەیدا دەڵێ :

| | |
|---|---|
| ئەی بادی شەماڵ ، ئەی بادی شەمـــاڵ | ئارامی گیان و دڵەی وەك زوحاو |
| پۆستەی هەوایی ، پەیکی مژدەبـــەر | ئەگەر هاتو ڕێت کەوتە کۆی دولبەر |
| وەك عارەب دەخیل کە چوتە ئـــەولا | مەوەستە تاکو خێوەتی لەیلا |

مەوەستە تاوکو لای شۆخێ کـــــەوا  تیری نیو نیگای لە دڵما ڕووا

پێی بڵێ گیانە لەم ڕنگە و بانـــــــە  لەم چەن و پێشە و هەر دەو کێوانە

| | |
|---|---|
| شتێکی شەیدا و ڕووت و قووتـــم دی | فرمێسکی ئاڵی وەك یاقوتم دی |
| ڕووی لە خوێن خاڵی وەك زەعفەرانـــە | چاوەکەی لێڵ پڕ لە گریانە |
| بڵێ هەیکەلی وەك ئیسقانـــــم دی | قەدی چەماوەی وەك کەوانم دی |
| بڵێ خەیاڵی بەژن و بـــــالاکـــەت | شتێکی ڕووناکی شەوقی لالاکەت |
| نەرگسی شەهلای چاوی بەخومـــارت | خەرمانەی زوڵفی لەسەر ڕوخسارت |

فریشتە ئاسا ساتێ هەزار جـــــــار  خۆی نیشان ئەدا خۆی ئەدا حەشار

بڵێ ئێستاکەش ئەو ماڵ وێرانـــــــە  ئەو کەژ مەسکەنەی وێڵی شارانە

هەر بە ئومێدی جەژنـــــی ویصاڵـــە  نازانێ تۆ نیت وێنەی خەیاڵە

| | |
|---|---|
| جار جاریش لە دوای ناڵەی دڵـــی زار | فرمێك ئەرژێنێ وەك هەوری بەهار |

دەست درێژ ئەکا بەناکـــــامـــــەوە  بەجەرگی سوتا و دڵ بە زامەوە

| | |
|---|---|
| کە لێی وون ئەبێ بانگ ئەکا هەی یار | هەر بە کوڵ ئەگری هاوار هەی هاوار |

دڵدار لە هۆنراوەکانیدا گەڵێ پەندی منداڵان و لاوانی داداوە ویستوویەتی منداڵان هەر لە دەوری منداڵییەوە بە خوو و ئاکاری باش بێنە بار و لە مەیدانی ژیاندا خەریکی تێکۆشین و هەوڵدان بن و عارەق برژێنن تا بە هیوای خۆیان بگەن وەکو دەڵێ ...

منداڵی هیوا کــــولەکــــەی دڵان  تازە خونچەکەی نێو باغی گوڵان

هەرچەندە سەیری نیچو چاوت ئەکـەم  نابینم گەردیێ نە زۆر و نەکەم

روونیت چەهرەی تۆ وەك ئاسمانی ساو  وەختێ لێیدابێ پرشنگی هەتاو

تیشکی ئومێدی سەر دڵـــی تـــاری  لە ئاسمانی رووت ئەدا دیاری

سیوەیلی چـــاوی بریقـــەدارت  روونا کی پاکی وێنەی روخسارت

خەندەی بێ فێڵی لێوە ئاڵەکـــەت  نەشئەی دووچاوی مەست و کاڵەکەت

بێ شك پێشەنگی مژدەی دڵشادیـن  یان نەغمە خوانی باغی ئازادین

ئومێدی دوارۆژ رۆڵەی هیوا تـــۆی  خاوەنی فیکر و بیکری باڵا تۆی

هیوام بە تۆیە ئەی تازە منـــداڵ  بەیانی ببیە نمونەی میساڵ

ئەم قسانەی من کەوا بۆت ئەکـەم  بزرنگێتەوە لە گوێ تا هەردەم

راستگۆ بە دائیم قەد درۆ نەکـــەی  وەختت بە بێ سوود تۆ لە دەست نەدەی

تێکۆشە دائیم هەر وەکو هەنگ بـــە  لە مەیدانی ژین ئامادەی جەنگ بە

ئەوا پێت ئەڵێم چاکی بـــزانـــە  ژیانی مەردی باری گرانە

نەك وابزانین وەك ژینی دوێنـــێ  دەخۆیی و دەنوی لە ناو نوێنێ

رۆژێك هاتوو تۆ پێگەیشتـــــی  چاوت کردەوە لە ژین گەیشتی .....

دڵدار زێدو مەڵبەندەکەی زۆر خۆش ویستووە و دیمەنی جوانی شاخ و بەندەنەکان و دەشت و دۆڵ و شێو و تاڤگە و باخەکانی مەڵبەندەکەی هەستی ئەویان بزواندوە و بۆیە دڵی هاتووە تە جۆش و خرۆش بۆ نیشتیمان و خاکەکەی و دەڵێ .....:

کوردستانی خۆش نیشتمانی جوان

تۆ قیبلە گاهی منی بێ گومـــان

چاوم پشکوتوی شاخەکانتـــــە

فێری ژیانی باخەکانـتـــــــە

دەنگی شمشاڵی شووانەکانـــت

زریق و باقی جوانەکـــانـــت

قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانـت

خوورەی ئاوەکەی نشێوەکانـــت

ئەمانە هەموو گوێیان کردمـــەوە

هەوێنی شیعری دڵیان کرتمـــەوە

نەونەمامێ بووم لەم خاکە رووام

بە خۆشەویستی ولات ئــاو درام ....... تا کۆتا هۆنراوەکە

لە تەمەنی سی ساڵیدا بە "ژەهراوی"بوون لە ١٩٤٨.١١.١٢دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایيکرد و سەری جوانەمەرگی نایەوە .

وەك دیارە زۆر خولیای زانین و بەتایبەتی فەلسەفە بووە ، ئەم یادگارانەشی بۆ بەجێهێشتووین:

١- في طريقي الى معرفة الحقائق . انتقادات الى قلب البهائيين

٢- وتارێك دەربارەی عومەری خەییام

٣- زمانی کوردی و ئەدەبیات

٤- نارکۆزی کۆمەڵایەتیمان

٥- اقتصادنا الوطني

٦- بیرەوەریەکانی یونس رەئوف دڵدار

تابلۆی ئەم ژیانە پڕ لە ناسۆر و تەمەن کورتەی شاعیرمان چەند ڕاستییەکی ئاشکرامان نەداتە دەست:

١- تینوێتی شاعیر و خۆشارەزاکردن لە سەرچاوەی وێژەی کلاسیکیمان

٢- خۆخەریك کردن بە باسی بەراوردی پێشەوایەتی لە نێوان نالی و حاجی قادری کۆییدا، کە دوو پێنووسی پێشەوای شیعری تەواو دیار و سەرکەوتووی سەردەمی خۆیانن، ئەویان لە گۆڕەپانی دڵداری و ئەمیان لە نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی

٣- خۆخەریککردن بە کاروباری بەرهەمدانان دەربارەی فەلسەفە و زمان و وێژەی کوردی و باس و خواستی کۆمەڵایەتی و ئابووری و نووسینەوەی یادداشتی بەسەرهاتی خۆی و بنەماڵەکەی، بە کوردی و عەرەبی، لەو تەمەنە کەمەدا و بەو لاوێتییە و بەدەم ئەو هەموو ناتەواوی ژیان و نەخۆشیانەوە . نیشانەی بە خۆدا ڕاپەڕموون و توانا و زیرەکی و هەستێکی دڵسۆزانەی قوڵ و دیارە .

٤- دانانی کۆمەڵێك شیعری بە سۆزی نەتەوایەتی و زانست پەروەری و کۆمەڵایەتی و دڵداری و فەلسەفی و بابەتی ڕیالیزمی نیشانەیەکی دیکەی ئەو بەهرە و توانایەی شاعیرن .

یەکێك لە شیعرەکانی دڵداری شاعیر سرودی نیشتمانی ئەی رەقیبە

## ئەی ڕەقیب

ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان | نای مڕێنێ دانەیی تۆپی زەمـــان
ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشیـــن | سەیریکە خوێناویە ڕابووردومـــان
ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەی خوسرەویـــن | ژینمـــانە ژیانمـــان هەر نیشتمـــان
کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زینـدووە | زیندووە هیچ نانەوێ ئالآکـــەمـــان
چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕڕەشێـــر | بوون بە قوربانی و هەموویـــان نێژران
لاوی ئێستاش حازر و ئامـــادەیـــــە | جـــانفیدانە جـــانفیدانە جـــانفیدان
لاوی کورد هەڵسانە سەرپێ وەك دلـــێر | سا بە خوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیـــان
کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زینـــدووە | زیندووە هیچ نـــانەوێ ئالآکـــەمـــان

*******************************************

**ئەحمەد موختار بەگی جاف**

**باشوری کوردستان**

**( ١٣١٦ – ١٣٥٤ ك ) ( ١٨٩٨ – ١٩٣٥ ز )**

ئەم شاعیرە ناودارە ساڵی ١٨٩٨ لە هەڵەبجە لەدایك بووە و، بە شێوەی تایەر بەگی برای، لە سایەی وەسمان پاشای باوکی و عادیلە خانمی دایکیدا، بەناز و نیعمەت بەخێو و پەروەردە کراوە و، هەلی خوێندنی بۆ ڕەخساوە.

هەم دیسان بە وێنەی کاکی تاهیر بەگ ژیانێکی خۆشی لە قۆناغی لاوێتییدا بەسەر بردووە و لە تەمەنی بیست ساڵیدا ژنی هێناوە، هەر لەو سەروبەندەدا پتر لە جارێك بووەتە قایمقامی هەڵەبجە و، لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا هەر بە لاوێتی بووە بەفەرمانڕەوای هەڵەبجە واتە قایمقامیەتی هەڵەبجە ، کە گەنجێکی شاری هەڵەبجە بوو لەکارەکانیشیدا سەرکەوتوو بوو ، لە ساڵانی ١٩١٩– ١٩٢٤دا نائیبی پەرلەمانی عێراقی بووە.

لە ساڵی ١٣٥٤کۆچی و ساڵی ١٩٣٥ لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا بە گوللەی تفەنگی دەستێکی ڕەشی نامەردی بە کرێی گیراوی ناحەز لە سەر خاڵی سنوور لە ئاوی سیروان لە نزیك هەڵەبجە کوژرا و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ شاری هەڵەبجە و لە گوندی عەبابەیلێ لە تەنیشت گۆڕی براکەی (تایەر بەگ) بە خاك سپێردرا .

بەڵام لەبەر ئەوەی کەسێکی نەتەوەپەروەر و خەباتگێڕ و هاوسۆز و هاوغەمی میللەتەکەی بووە و، حەزی بە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە نەکردووە، لە قۆناغی دووهەمی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموودی حەفیددا سەنگەری خەباتی هەڵبژاردووە و لەو پێناوەدا وازی لە گشت سامان و پلەوپایە و فەرمی و کۆمەڵایەتییەکانی هێناوە و لەو پێناوەدا تووشی گەلێك گرفت و نەهامەتی هاتووە.

بەگشتی ئەحمەد موختار بەگ نموونەی میرێکی کوردپەروەر، بەخشندە، دلۆڤان، هەژار دۆست، خۆشمەعشەر بووە. لە بواری ئەدەبی کوردیشدا وەك شاعیرێکی بلیمەت و بەهرەمەند ناسراوە، زیاتریش لە مەیدانی شیعری نیشتمانی و نەتەوەیی و سیاسیدا ناوبانگی دەرکردووە.

ئەحمەد موختار جاف بە یەکێك لە هۆنەرانی کورد دێتە ژمار و هۆنراوەکانی گەلێك شیرین و پاراو و ناسکن ، ئەم هۆنەرە لە گەڵ ئەوەی کە زۆری نەخوێندووە کەچی هۆنراوەکانی لەو

پەڕی بەرزییەوەن و هەر لە تافی جانیدا خەریکی خوێندنی دیوانی هۆنەرانی کورد بووە ، گەلێك حەزی لە هۆنراوەکانی نالی و حاجی قادر و کەیفی کردووە .

هەر لەو کاتەوە بە لاوێتی دەستی کردووە بە هۆنینەوەی هۆنراوە .

لە کۆپلەیەك لە شیعرەکانی دەڵێ :

گڕە و گرشەی تەنوورە ، بڵێسەی هەناوەکـــــەم
سیروان و تانجەڕۆیە خوورەی ئاوی چاوەکـــــەم

شێواوی زوڵفی خاوی کەسێکم منی هـــــەژار
بۆیە پەشێوە ئێستەکە بیــــــری بڵاوەکـــــەم

ڕۆژێ بە پێکەنینەوە یار پێـــــی وتــــــم وەرە
بۆ پاسی نیوە شەو ، سەگی قول هەڵگراوەکـــــەم

ئەم کۆمەڵی گوڵاڵە کە سوورن لە دەشت و کـــێو
ئاویان دراوە گشتی بە خوێنی ڕژاوەکـــــــەم

تۆبە خودا دەسا وەرە ئەی نووری چاوەکـــــــەم
سارێژ کە زامی لەت لەتی جەرگی بڕاوەکـــــــەم

باوەڕ مەکەن ببن بە عەرەب و کوردی شـــارەزوور
بێ ترس ئەڵێم ، لە لای ڕاسی درشاوە کڵاوەکـــەم

ئەی گیانەکەم بە چاوی ڕەشت سوێند ئەخۆم کە من
بۆ دینی چاوی تۆیە کە هەر چاوە چاو ئەکـــــەم

واتە : هەناوم وەکو ئاوری تەنوور بڵێسەی بەرو بووەتەوە کەچی چاویشم وەکو ئاوی سیروان و تانجە ڕۆ بە خورش فرمێسکی لێ دێتە خوار ، منی هەژار پەشێوا و شێواوی زوڵفی خاوی دلبەرێکم بۆیە ئێستاکە بیرم بڵاوە ، ڕۆژێکیان یار بە پێکەنینەوە پێی وتم : بۆ پاسی نیوە شەو بە دەورما گەڕێ ، ئەم گوڵاڵانە لە دەشت و کێوا ڕشواون و سوورن ، هەموویان بە خوێنی ڕژاوی من ئاو دراون ، دەسا ئەی خۆشەویستەکەم بۆ خوا وەرە برینەکانی لەتلەتی جەرگم بۆ سارێژ بکە ، چونکە من هەر تۆم خۆش دەوێ و لە ڕێی تۆوە

دەڕۆم ، بڕوا مەکەن کە کوردی شارەزوور ببنە عەرەب ، منیش هەر لە ڕێی تۆم و بە چاوانی ڕەشت سوێند دەخۆم کە هەموو دەم بۆ دیتنی تۆ لە چاوەڕوانیدام .

ئەحمەد موختار جاف بەراستی لە هۆنینەوەی هۆنراوەی دڵداریدا لاسایی هۆنراوە و شاعیرانی فارسی کردووە و بەتایبەت زۆر حەزی لە هۆنراوەکانی سەعدی شیرازی کردووە ، لە پارچە هەڵبەستێکی تریدا ڕوودەکاتە دڵدارەکەی و دەڵێ :

به بەردی فیرقەتت شیشەی دڵی ئاوارە مەشکێنـــــە
لە ناو زومرەی ڕەقیبان عاشق بێچارە مەشکێنـــــە
ئەگەر ڕۆح و دڵ و ئیمان تەڵەب کا بیدەرێ عاشـــق
کە تفڵ و خورد ساڵە قد دڵی ئەو یارە مەشکێنـــــە
دەخیلم ئەی نەسیمی سوبحگاهی ، مەسکەنی دڵمـــە
پەرێشانی مەکە تۆ زوڵفی ئەو نازدارە مەشـــکێنـــە
کە من پەروانەی شەمعی سەرید و کوڵمی تۆم جانـــا
دڵی ( ئەحمەد ) بە فیتنەی ئەو سەگی بەتیارە مەشکێنە

واتە : ئەی خۆشەویستەکەم بەبەردی دووریت دڵی منی ئاوارە و دەربەدەر مەشکێنە و لە ناو ناحەزاندا بێ چارەم مەکە ، چونکە من گراو و سەودا سەری تۆم و هەر تۆم خۆش دەوێ ، ئەگەر دڵدار دڵ و بڕواتی بوێ ، خێرا بیدەرێ و درێخی لێ مەکە ، چونکە گراو و دڵ براو وەکو منداڵ وایە و نابێ دڵی بشکێنی ، دڵم بووەتە کانگای پەژارە و خەفەت ، دەسا پەرێشانی مەکە ، من وەکو پەپولە بە دەوری ڕوومەتی شەمعی تۆ دەسوڕێمەوە ، تۆش دڵی ئەحمەدی بێچارە مەشکێنە و بەدیتنی خۆت ئەو دڵ خۆش بکە .

ئەحمەد موختار جاف ڕەخنە لە هۆنەرانی دەوری خۆی دەگرێ و دەڵێ :: ئەی هۆنەران و ئەی هەستیارانی کورد ! ئیتر کەم باسی زوڵف و خەت و خاڵ و چاو و برۆ بکەن و کەم بیر لە پەرچەم و کاکۆڵی یار بکەنەوە و خۆتان لەم باسانە لادەن و بیرێك لە گەلی لێقەوماوی کورد بکەنەوە و دەردی نەزانی و نەخوێندەواری ئەم گەلە چارەسەر بکەن ...

وەکو دەڵێ :

شاعیرانی کورد بەسە بە باسی زوڵف و چاو بـکـــــەن
کەم خەیاڵی پەرچەم و کاکۆڵی ئاڵۆزاو بـکـــــــەن
لابدەن کەم باسی سومبولی ، یا لقی لاولاو بکـــــەن

ئێوە تەتبرێکی خاڵی قەومی دڵ سوتاو بـــکــــــەن
زوو بە زوو تا ئیش لە دەست دەرنەچووە سا هـــەوڵ بدەن

ئەحمەد موختار جاف دیسان لەم بارەوە پەندی هۆنەران دادەدا و دەڵێ :

ئەی هۆنەران لەباسی دڵداری خۆتان لادەن و کەمێك بیر بکەنەوە و بزانن ، کە چۆن هەندێکی خوانەناس خەریکی وێران کردنی وڵاتن و نەزانەکان بۆ بەهرە و سوودی خۆیان بە رۆژ و بەشەو خەریکی تولانەوە و خراپەن و خەڵك لە رێی زانین و پیشەسازی لادەدەن و دەبنە بەرهەڵستی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ زانین پەرە پێبدەن .

ئەو کەسانەی کە گەل و نەتەوەی خۆیان بۆ پوڵ و پارە دادەشۆرن رووڕەشی لای خوا دەبن ، دونیا بە جۆرێکی لێهاتووە کە نەزان بەسەر خەڵکدا زاڵ بووە و کەچی پشیلە و رێوی دەیەوێ جێی شێران بگرنەوە و وەکو دەڵێ :

لادە شاعیر تۆ لە باسی عیشق بازی و سەیرکـــــــە
چۆن خەریکن چەند کەسێ ئێستا وەتەن ویران ئەکەن
جاهیلان بۆ ئیسفادەی زاتی خۆیان رۆژ و شـــــــەو
لەم موحیتە مەنعی عیلم و سەنعەت و عیرفان ئەکــەن
روو رەشی دونیا و قیامەت ئەو نەفامانەن کـــــــەوا
هەجووی قەوم و میللەتی خۆیان بە پارە و نان ئەکەن
ئاسمان ئێستا وەها چەرخاوە جـاهیــــل غاڵبـــــە
گوربە و رێوی خەیاڵی مەرتەبەی شێران ئەکـــــــەن

هەم دیسان بەهۆی چیرۆکە نایابەکەیەوە (مەسەلەی ویژدان) بە یەکێك لە پێشەنگەکانی چیرۆك و ڕۆمانی کوردی دادەنرێت. ساڵی ١٩٣٥ ئەحمەد موختار جاف لە نزیك ڕووباری سیروان بە گوللەیەکی نامەرد شەهید دەکرێت.

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرێکی:

بەخۆڕایی لە دەستی مەدەن ئەم خاکە مەحبووبـــە
کە تۆزی وەك جەواهیر سوورمە و کوحلی بەسەرتانە

بەسەر خاکا ئەگەر نازیش بکەن حەقتانە کوردینـــە
تەماشای سێبەری ئەو شاخ و کێوە وا لە سەرتانـــە

بەبیٚ قەدری بەسەریا ڕامەبوورن حورمەتی بگــرن
گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێنی جگەرتانــە

لە پارچە هۆنراوەیەکی تردا دەڵێت :

دوو چاوم خوێن ئەبارێنیٚ لە عەشقی ڕوومەتی ئاڵـــت
گرفتارە لە ناو زوڵفت دڵم بۆ دانەیی خــاڵـــت

خوا کەی بێت کە من پەشتانی باڵاو قامەتی تۆ بـــم
چ وەختیٚ پڕ بە چنگ بگرم دوو لیمۆی نەورەسی کاڵـت

نەخۆشی خۆشترە لای من لە ساغی و سیحەت ئەی جانا
ئەگەر یەک هەفتە جارێک بێی بپرسی چۆنە ئەحواڵـــت

بە شاهی عالەمی ناگۆڕمەوە ئەمڕۆ لـــە دنیـادا
جنێو و توندیی و قەهر و قسەی نالایەق و تــاڵـــت

نیگارا لێم ئەپرسی بۆچی وا دێوانەیە ئەحـــمـــەد
لە عەشقی چاوی تۆیە چاوەکەم وا بووم بە عــەوداڵت

## گۆران

## باشوری كوردستان

(١٣٢٤ -١٣٨٢ ك) (١٩٠٤یا ١٩٠٥ – ١٩٦٢ ز)

گۆران، یاخود عەبدوڵلا بەگ كوڕی سلێمان بەگی كوڕی عەبدوڵلا بەگە. باوكیشی و باپیریشی لە هۆنراوە و وێژەدا بەهرەیان هەبووە و بە كوردی و بە فارسی نووسیویانە و هۆنراوەیان وتووە ، بەتایبەتی عەبدوڵلا بەگی باپیری لە زمان و وێژەی فارسیدا دەستێكی باڵای هەبووە و هەر بۆیە بە "كاتبی فارسی" ناوبراوە.

گۆران لە ساڵی ١٩٠٤ یان لە ١٩٠٥دا لە هەڵەبجە لەدایكبووە . بنەماڵەی باپیری لە بەگزادەی "میران بەگی" بوون لە ناوچەی "مەریوان" و عینایەتوڵلا بەگی كوڕی ئەمانوڵلا بەگیان بە خۆی و خێزانیەوە دێتە سلێمانی و لە ناوچەی قەرەداخ ماوەیەك دائەنیشێ. زۆری پێ ناچێ كۆچی دوایی دەكات.عەبدوڵلا بەگی كوڕی (باپیری گۆران) لەگەڵ هەموو خێزانەكەیاندا، ئەوەی لە برایەكی بچووكی و دایكی و ژنەكەی و منداڵەكانی خۆی پێكهاتوە ڕوودەكەنە هەڵەبجە چونكە خۆیان بە جاف زانیوە و لەوێ جێگر ئەبن. لەو گەشتەدا دایكی عەبدوڵلا بەگ و براكەی بە نەخۆشی "سێبەڕۆ" دەمرن و ئەمێننەوە عەبدوڵلا بەگ و مناڵەكانی خۆی ئەمانە بوون: مستەفا بەگ، نووری بەگ، نەق خان، سلێمان بەگ و حەبیبە خان. لەمانە نەق خان شوو دەكات بە مەجید بەگی عوسمان پاشا. حەبیبە خانیش شوو دەكات بە یەكێ لە شێخانی خانەگای لای پاوە. مستەفا بەگ و نووری بەگیش كەسیان لەپاش بەجێنامێنێت. بەڵام سلێمان بەگ ئەم مناڵانەی ئەبێ: عەلی. شەمسە ، موحەممەد، عەبدوڵلا. عەلی و شەمسە بە لاوی مردوون. موحەممەدیش كە ناوبانگی بوو بە "حەمە بەگە ڕووشە" پاش مردنی باوكی بە دوو ساڵ ئەكوژرێ. بەم چەشنە لەم بنەماڵەیە هەر عەبدوڵلا (گۆرانی دواڕۆژ) دەمێنێتەوە . گۆران لای باوكی قورئان و سەرەتای خوێندنی خوێندووە. پاشانیش لە "مزگەوتی پاشا"ی هەڵەبجە بووە بە فەقێ و تەنانەت ماوەیەكێش بە "فەقێ عەبدوڵلا" ناسراوە.

لە دوا ساڵەكانی جەنگی یەكەم و سەرەتای هاتنی ئینگلیزدا، بۆ ماوەیەك هەڵەبجە چۆڵ ئەبێت و خەڵك ڕوودەكەنە لادێكانی دەوروپشت. ماڵی باوكی گۆرانیش لە بەهاری ١٩١٩ وە تا پاییزی ئەو ڕوودەكەن چەمی بیارە و لەوێ لە باخێكدا هەوار ئەخەن وبۆ پاییز ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە .

گۆران خۆی بۆ مامۆستا ڕەفیق حلمی گێڕاوەتەوە و وتوویە: "لەبیرمە ، کە یەکەم قوتابخانەی زمانی تورك لە هەڵەبجە دانرا، بۆ پۆلی یەکەم وەرگیرام، بۆ پۆلێك وەرگیرام، ئەوەی بەڕێوبەرەکەمان بەرەحمەت بێت تاهیر ئەفەندیی مەلا ئەمینی جەعفار پێی ئەوت پۆلی ئیحتیات".

وەك گۆران خۆی گێڕاوێتیەوە چوونی بۆ قوتابخانەی فەرمییشدا پچڕ پچڕ بووە . پۆلی چوارەمی لە سەردەمی داگیرکرانی هەڵەبجەدا لەلایەن ئینگلیزەوە تەواو کردووە .

هەر لە ١٩١٩دا سلێمان بەگی باوکی گۆران کۆچی دوایی دەکات. پاشان لە ١٩٢١دا موحەممەد بەگی برای، بە هاندانی مستەفا سائیب، لەگەڵ عەبولواحید نووریی خاڵۆزایدا ئەیاننێرێت بۆ قوتابخانەی "عیلمی"یەی کەرکووك بۆ خوێندن. بەڵام هەر لەوساڵەدا موحەممەد بەگی برایشی دەکوژرێ. ئیتر گۆران کەسی وەهای نامێنێ گوزەرانی خوێندنی خۆی و ژیانی دایکی ببات بەڕێوە، لەبەرئەوە دەست لە خوێندن هەڵئەگرێت و لە ساڵی ١٩٢٢ەوە تا ساڵی ١٩٢٥ گەلێ دەست تەنگی ئەچێژێ.

گۆران بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٥دا بە مامۆستایی لە قوتابخانەی هەڵەبجە دامەزراوە و تا ١٩٣٧ لە قوتابخانەکانی ئەو ناوچەیەدا ماوەتەوە . پاشان گوێزراوەتەوە بۆ ئەشغالْ – بەشی کاروباری ڕێگاوبان و تا گیرانی یەکەمی لە ١٩٥١دا، جگە لەو چەند ساڵەی، ئەوەی لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی تری کوردا ئەچێ بۆ یافا و لە ئێستگەی ڕادیۆی ڕۆژهەڵات نزیك بە مەبەستی بەشداری لە خەباتدا لەدژی فاشیزم بەشی کوردستان ئەکەنەوە ، لە ئەشغاڵدا ئەمێنێتەوە .

لە تەشرینی دووەمی ١٩٥٢دا لە بەندیخانەی یەکەمی دێتەدەر و ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و ئەبێ بە بەرپرسی ڕۆژنامەی "ژین". تا ئەیلوولی ١٩٥٤ لەسەر ئەم کارە ئەمێنێتەوە . لە ١٩٥٤.١٠.١٧دا بۆ جاری دووهەم لەگەڵ کۆمەڵێ لە ئاشتی خوازانی سلێمانی ئەگیرێ و فەرمانی ساڵێ بەندو ساڵێ خستنە ژێر چاودێریی پۆلیسی بەسەردا ئەدرێ. ماوەی بەندکردنەکەی لە سلێمانی، کەرکووك، کوت، بەعقووبە و نوگرە سەلمان و ماوەی چاودێرییەکەشی لە بەدرە بەسەردەبا.

لە ١٩٥٦.٠٩.١٢دا ئەم فەرمانی بەندکردنەی تەواو دەکات و ئازاد دەکرێت و دەچێتە بەغدا و چەند ڕۆژێك لەوێ لەیەکێك لە پرۆژە میرییەکانی خانوودا ئەبێت بە چاوەشی کرێکار. زۆری پێناچێت دیسانەوە لە هێرشی میریدا بۆ سەر نیشتمان پەروەران بەبۆنەی دەستدرێژییە سێ

قوڵییەکەی سەر میسرەوە ، ئەگێڕێتەوە لە ١٩٥٦.١١.١٧دا دادگای عورفی لەکەرکوک فەرمانی سێ ساڵ بەندی بە بارمتە دانانی هەزار دیناری کاتی دەسپێنێت بەسەریدا، ئەویش بەوەی کە تا سێ ساڵ وتەی لە دەم دەرنەیەت و کردەوەی وای لێ نەوەشێتەوە میری پێی دڵگران بێ.

گۆران نە هەزار دینارەکەی ئەبێ و نە ئەشیەوێ گفتی وەها بە میری بدات، بۆیە ئەخرێتەوە بەندیخانە و تا ١٩٥٨.٠٨.١٠ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ لە زینداندا ئازاد دەکرێت. گۆران ئەم ماوەیەی بەندیخانەی کەرکووک و بەعقووبە بەسەربردووە .

پاش بەربوونی لە زیندان ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و پاش ئەوە بە ماوەیەك لەگەڵ شاندێکی میللی سەر لە یەکێتیی سۆڤیەت ئەوسا و چینی میللی و کۆریای دیموکراتی (باکووری) ئەدا.

لە سەرەتای ١٩٥٩دا سەرپەرشتیی گۆڤاری "شەفەق" ئەگرێتە دەست و بە ناوی "بەیان" دەریدەکات. لە ئیسکانی سلێمانیش دایدەمەزرێنێت و تا ناوەڕاستی ١٩٦٠ کاری تێدا دەکات. ئەنجا بەبیانووی ئەوەوە کە گوایە بێپرس کاری بەجێهێشتووە – کار بەجێهێشتنەکەی بۆ چوون بوە بۆ شەقڵاوە بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی دووهەمی مامۆستایانی کورددا – لەسەر کار لای دەبەن.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٠دا دێتە بەغدا و ئەبێ بە یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا و بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی ئازادی.

لە سەرەتای ١٩٦٢دا ژانەسك زۆری پێ ئەهێنێ. دەرئەکەوێ کە گەدەی تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە بووە . نەشتەرگەرێکی سەرکەوتووی لە بەغدا بۆ دەکرێ بەڵام بەداخەوە پاش وادە. پاش ئەو نەشتەرگەرییە لە نیساندا ئەچێ بۆ مۆسکۆ و سێ مانگێك لە نەخۆشخانەی "کرێملین" و سەنەتۆری "بەرڤیخە" بەسەرئەبا و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق. پاش گەڕانەوەی بەماوەیەکی کەم نەخۆشییەکەی سەرهەڵئەداتەوە و تەنگی پێ هەڵئەچنێ. لەبەرئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و لەوێ لە جێدا ئەکەوێ. لە کاتژمێر نۆ و نیوی بەیانی ١٩٦٢.١١.١٨ چاوی یەکجاری ئەنێتەوە .

گۆران هەر لە سەدەمی منداڵیدا دەستی کردووە بە هۆنراوە هۆنینەوە ، وەکو خۆی دەیگێڕێتەوە یەکەم پارچە هەڵبەست کە هۆنیویەتەوە ، چوار پێنج هۆنراوەیەکە ، کە ئێستا

هەرچەند دەکا دوانیان نەبێ نایەتەوە بیری ، کە هۆنراوەی یەکەمی ئەو پارچە هەڵبەستە ئەمەیە کە دەڵی :

لە تاوی فرقەتی یارم دڵم دایم پـــەرێشـــانە
وەکو مەجنونی حەی وێڵی کەژو دەشت و بیاوانم

گۆران ئەم پارچە هەڵبەستە بۆ مامۆستا بێخود دەنێرێ ، مامۆستا بێخودیش پەسەندی دەکات و وشەی یارم دەگۆڕێ بە لەیلا ، وادیارە گۆران لەو دەمە نەیزانیوە کە بە لای مەجنونەوە یار هەر دەبێ لەیلا بێ ، گۆران سەرەتا وەکو هۆنەرە پێشوەکان لەسەر شێوەی کۆن هۆنراوەی هۆنیوەتەوە ، وە لەو چەشنە هۆنراوانەش لە دیوانەکەیدا زۆرن ، بەڵام پاشان ئەم شێوە لە ناو دەبا و بیری ئەم کۆشکە کۆنە لەدڵیدا دەروخێنێ و دەکەوێتە سەر بیرێکی ، وە شۆڕشێ لە هۆنراو و وێژەی کوردیدا دەگێڕێ و هۆنەرانی سەردەمی خۆیشی دەکەونە سەر ئەو شێوە کە گرتوویەتی ، گۆران بەم کارە گرنگە توانی وێژەی کوردی هەڵبگێڕێتەوە ، رووپەڕەی بیری کۆن بداتە لاوە و بیکا بە بیرێکی نوێی و ئەو لە ڕاستیدا زۆرتر لە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەواری و سروشتە جوانەکانی کوردستان دواوە ، لە بیر و کەڵکەڵەیش بەشی وەرگرتووە ، پارچە هەڵبەستی ( گوڵی خوێناوی ) گۆران تابلۆیەکی کۆمەڵایەتییە ، کە لەوەدا باسی کوروکچێك لە زەماوەندا دەکات کە هەردووکیان لە کۆڕی بەزم و شایی دا راوەستاون و کوڕەکە داوا لە کچەکە دەکا بە یەکەوە دەست بگرن و هەڵپەڕن ، بەڵام کچەکە دەڵێ : ( گوڵ نەبێ بۆ سەرم ، ئاڵ چەپکێ ، زەرد چەپکێ ، نایەم بۆ زەماوەند ، نایەم بۆ هەڵپەرکێ ) ئەویش دەڕوا کە گوڵ بێنێ ، خێڵی دوژمن دەورەی باخچەکە دەدەن ، بەهەرجۆرێك بێ چەپکێ گوڵی زەردی بۆ دەچنێ و پێی دەدا و دەڵێ : ئەمجا لەگەڵمدا دێیت بۆ شایی و هەڵپەرکێ ؟ کچە دەڵێ : نایەم دەبێ چەپکێ گوڵی سوریشم بۆ بێنێ ، کوڕ دەڵێ ناتەوێ ئەم زامی سەردەڵەم لە باتی ؟ ئەویش دەڵێ : نا هەر گوڵی سوورم دەوێ ، ئەوسا کوڕەکە دەڕوا کە چەپکێ گوڵی سوور بێنێ ، کەچی بە گوللەی دوژمن دەپێکرێ و پاشان کچەکە دڵخوازەکەی دەلاوێنێتەوە دەڵێ ( هەی هاوار تفەنگی دوژمنیش پێکاتی ؟ راکشێ تاوێ سەر بنێرە سەر ڕانم ، بۆ بگریم بۆ دڵێ بۆ گوڵێ دۆڕانم ) وەکو گۆران بەهۆنراوە دەڵێ

کوڕ : بڕوانە : شایە ، چۆپیە ، لەو مـــاڵـــە
گوێ بگرە ! زوڕنایە دەهۆڵـــە شـــەمشـــاڵـــە
زەرد و سوور تێکەڵ بوون ژن و پیاو هـــەرایـــە

له ناوه هەر هاڕەی هەیاسەی تـــــۆ نایـــــە
سا توخوا خێراکە بابڕۆین دەست بگـــــریـــن
بەکامی دڵداری پێکەوە هــــــەڵپەڕیـــــن
کچ گوڵ نەبێ بۆ سەرم ئاڵ چەپکێ زەرد چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەند نایەم بۆ هـــــەڵپەڕکـــــێ
کوڕ کچ لە ڕێی جوانیتا کچ لە ڕێچی جوانیتــــا
کچ لە ڕێی نیو نیگای هاتوچۆی کــــانیتـــا
پایزە گـــــەڵای دار ڕژاوە بــــاغ ڕووتـــە
گوڵ کوانێ گوڵ لیچوی بە بزە پشکـــوتــــە
کچ گوڵ نەبێ بۆ سەرم زەرد چەپکێ ئاڵ چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەند نایەم بۆ هەڵپـــــەرکـــــێ .... تا کۆتای شیعرەکە

گۆران هونەرێکی هونەرمەند ڕیالیستە کە هەوێنی هۆنراوەکانی لە ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەوارییەوە وەرگرتووە ، بەڵی گۆران بوێژێکی هونەر مەندە و لە بیر و کەڵکەڵەی خوایی کەڵکی وەرگرتووە ، چونکە نەکەوتووتە شوێن بیر و کەڵکەڵەی بوێژە کۆنەکان و لاسایی ئەوانی تری نەکردووەتەوە ، هەرچەندە لە سەرەتای منداڵییەوە دەستی کردووە بە هۆنراوە هۆنینەوە و چەند پارچە هەڵبەستێکی لە سەر شێوە و ڕەوشتی ئەوان داناوە ، بەڵام ئەمە ماوەیەکی زۆر کورتی لە ژیانی ئەو گرتووە ، پاشان وازی لە هۆنینەوەی هۆنراوەی کۆن هێناوە و هۆنراوەی نوێی بە بیرێکی نوێ هۆنیوەتەوە .

گۆران بەراستی یەکێکە لە بوێژە هەرە بەرزەکانی کورد کە تەوقی لاساییکردنەوەی شکاندووە و خۆی پێ بەندی کێش و پاشل نەرکدووە ، وە ڕێچکەیەکی تازەی لە هۆنراوەی کوردیدا داناوە ، وە هۆنەرانی هاوچەرخی خۆی هان داوە کە بکەونە سەر ئەو ڕێگەیە .

گۆران لە سروشتی جوانی کوردستان کەڵکی وەرگرتووە ، وە لە بەر ئەوەی لە قوتابخانەی سروشتی هەرێمەکەیدا پێگەیشتووە ، ئیتر نەهاتووە بەم و بەودا هەڵبدا ، بەڵکو لە دیمەنە جوانەکانی کوردستان لە کێوە بەرز و سەختەکان و قەڵبەزە و کەف پەخشانەکان ، دۆڵچە ئاودارەکان ، لە دەشتی پان و پڕ گوڵ و نەسرین ، لە باڵندە جوان و ڕازاوە و نەخشینەکان ، لە گیانەوەرە جۆراوجۆرەکان کە لە داوێنی شاخەکانەوە بەرەو لوتکە بەرزەکان دەڕۆن ، لە مەل و قاز و مراوییە ڕەنگاورەنگەکانی ئەم کوردستانە لە گوێ چەم و ڕووبارەکان لە

ناوچۆدا و بە ئاسمانی کوردستاندا گەشت دەکەن و گەرمیان و کوێستان دەکەن ، لە بەزمی شایی و خۆشی و شادومانی گوند و لادیکانی کوردستان .....

هۆنراوەکانی گۆران پڕە لە هونەری جوان و لە ناخی دڵەوە هەست و دەروونی خۆی دەربڕیوە و کردوویەتە هەڵبەستی دەروون و دەڵێ :

هەر چەند ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستـــم !

لێکدانەوەی دروون قسەی زمـــانـــــم
بۆچی وەها دەروون ل یەك ! نازانـــــم

ئەمویست دەروون بکراوەیە وەك تۆمــــار
دەرکەوتایە دونیای جوانتر لە بەهــــــار

دەرکەوتایە ، ئاوات ، هیوا ، خەوبینیــــن
پرشنگدارتر لە ئەستێرەی قوبەی شیــــن

دەرکەوتایە : مانای مەنگی دەریایـــی
کە نەرمە با لە رووی ئەدا ئەسپایـــــی

دەرکەوتایە ئەو دونیایە کە شیعــــــری
بێ فرمێسکە و زۆرتر لە فرمێسك ئەگری

زەردەخەنەی بێ ئاوێنەی دەم و چـــاو
تیشکێك ئەدا رووناکترە لە هەتـــــاو

بەڵام ئەفسوس کە ئەو شیعرە جـوانانـە
باڵدارێکن جێ ناهێڵـــن هێلانـــە

لە ناوەوە ئەجریوێجنن ئەخوێنــــــن
هەرگیز قەڵەم بەکاغەدا ناهێنــــــن

لەم هۆنراوانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە گۆرانی شاعیر وەکو هۆنراوەکانی تری بەدووی (ە)قی ووشەی عەرەبیدا نەچووە و نەیویستووە خۆی بە کێش و پاشڵەوە ماندوو بکا ، وە

شتی نەدیویشی نەکردووە بە هۆنراوە بەڵکو ئەو شتانەی کە خۆی دیونی و بەرچاوی کەوتوون بە هۆنراوە هۆنیویەتییەوە .

گۆران لە گەشت نامەی هەورامان و قەرەداغدا تابلۆیەکی جوانی لە دیمەنە جوانەکانی ئەو دوو شوێنە کە بەشێکن لە خاکی کوردستان کێشاوە و چۆنییەتی ژیان و رابواردنی خەڵکی ئەو ناوچانەی دەرخستووە و پیشانی داوە ، وە لە سەرەتای گەشتەکەیەوە هەر لە دیمەنی رێگاو باون و تا گۆرانیی لاوەکان بەرێز باس کردووەوە و لە مەبەستەکەی دوور نەکەوتووەتەوە ، بە جۆرێ کە لە باسەکەیدا هیچ چەشنە ناتەواویەکی تێیدا نابینرێ و بە رێکوپێکی لەسەری دەڕوا ئەمەش دوو بەند لە گەشتی هەورامانی ئەو کە دەڵێ :

دیمەنی رێگاوبان

کۆمەڵە شاخێک سەخت و گەردن کەش
ئاسمانی شینی گرتووەتە بـــاوەش

سەرپۆشی لوتکەی بەفری زۆر سپـــی
بەدارستان رەش ناو دۆڵی کپـــــی

جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیس مـــاو
هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تـــەواو

هاوار و هاژەی کەف چڕێنی چـــەم
بۆ تەنایی شەو لایەلایەی خـــــەم

تووڵە رێی باریك توونا توون پشکـــن
رێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێ بـــــن

ناو رێگا تەق تەق لارێ بـــەردی زل
کە هێشتا گەردوون پێی نەداوە تــل

گا سەرە و ژوورە گا سەرەو خـــوارە
تاڵی و شیرینی دنیـــــای رێـــوارە

گۆران لە شەوەزەنگی ژیانی پڕ لە خەم و پەژارەدا ، نائومێد و گۆشەگیری نەبووە کە بچێتە خەو و ئاگای لە کەس و گەلەکەی نەبێ ، ئەو وریا بووە مەشخەڵێکی روونی زانستی بۆ

نەتەوەکەی هەڵگرتووە و چاوەڕوانی بەیانییەکی وریای بووە و لە راستیدا هۆنەری رئالیست ئەو کەسەیە کە لە هەر هەلومەرجێکدا ئاڵای خەبات و بەربەرەکانی بخاتە سەر شان و لە بەرانبەر ستەمکاران و ملهوڕان و دەست درێکاران سەر دانەنەوێنێ و هەموو پەیامهێنەری هیوا و ئومێد بێ ، گۆران هونەرێکی وا بوو لە بەرانبەر نامۆکان راوەستاوە و خەڵکی هان داوە کە بەربەرەکانی لە بەرامبەر ئینگلیزەکاندا دەست پێی بکەن و راپەڕن و سستی نەکەن و بە سستی نەژین و نەهێڵن کەس نیشتیمان و خاکمان داگیر بکات بۆیە دەڵێ :

دەمی ڕاپەڕینە .. دەمی ڕاپەڕینـــە !

هەتا کەی بەسستی و بەپەستی بژین

پەلاماردە ، ئەی کورد عەرەق ڕشتنێ

لە دڵێ کرمی ئاکۆکی دەرکردنـــێ

بەیەکبوونە گشت : پتەو بوونی پشـــت

بەیەکبوون ئەبێ : گەلت پێش کـەوێ

دەمی ڕاپەڕینە .. دەمی ڕاپەڕینـــە !

هەتا کەی بەسستی و بەپەستی بژین

بەلادا بکە چاکی مەردایەتـــــــی

درێغی مەکە گیان لە کوردایەتـــی

بگرمێنە وەك شێو بچۆ ناوی بـــەرد

بڵێ کوا حەقی ژینی ئینسانی مەرد ؟

درشت تاکو ورد : نەکەین دەست و برد

بەحەق چۆن ئەکەین ؟ پشوو چۆن ئەدەین ؟

دەمی ڕاپەڕینە .. دەمی ڕاپەڕینە

هەتا کەی بە سستی و بە پەستی بژین

*************

شاعیر گۆران زۆربەرهەمی جوان و هەمەرەنگی هەبوو کەشیعری (دڵداری و ، کۆمەلأیەتی ،نیشتمان پەروەری )هەبوو کۆی بەرهەمەکانی گۆران لەساڵی (١٩٨٠) لە دیوانی گۆران لەچاپی یەکەم دا هەیە گۆران چەند پەخشانی لە زمانی ترەوە وەرگێراوە بۆ زمانی کوردی

گۆران لە گۆڤاری (هاوار) لە سوریا و رۆژنامەی (ژیانەوە) (ژین) (ئازادی) وگۆڤاری (گەلاوێژ) (دەنگی گێتیی تازە) (هیوا) (شەفەق) (بەیان) (بڵێسە) (رووناهی) ونامیلکە (دیار یلاوان) (یادگاریلاوان)ی عێراق شیعری بلاوکردۆتەوە دیوانەکەی لە ١٣ کۆمەڵە پێك دێت ئەمانەن :

(١) : (بەهەشت و یادگار)ئەمە لە سێ جۆر شیعر پێك دێت .

(٢) : (فرمێسك وهونەر) ئەمەشیان لە سێ جۆر شیعر پێك دێت .

(٣) : (سروشت و دەروون) ئەمەیان لە دوو جۆر شیعر پێکدێت

(٤) : لاوك و پەیام .

(٥) : لە کۆری خەبات .

(٦) : ئۆپەرێت .

(٧) : پیەس لەیەك پەردەی کورتا .

(٨) : شیعری گەپ .

(٩) : سروود .

(١٠) : شیعر بۆ منالاَن .

(١١) : وەرگێراو .

(١٢) : بۆ زاخاوی مێشك .

(١٣) : هەمەجۆر .

(بەهەشت و یادگار) (فرمێسك و هونەر لەگەڵ دوو هاوێنە گەش)جارێکی تریش پاش مردنی گۆران لە ١٩٧١دا لە سلێمانی لەسەر ئەرکی کاك عومەر عبدورەحمان خاوەنی( کتێبخانەی سلێمانی)لە بەرگێك لەچاپخانەی کامەران چاپ کراوە.

قەسیدە درێژەکەیشی کەمەر لەسەردەمی خۆیدا بلاَوی کردۆتەوە ، (پەیامی کورد بۆ میهرەجانی چوارەمی گەنجان و قوتابیان) کە لە ١٩٥٤دا لە چاپخانەی ژین لە سلێمانی لەچاپ دراوە ،پاش مەرگی گۆران لەلایەن هۆگری کوری و برراکانیوە لە١٩٦٨دا کۆمەڵە شیعرێکی تری بەناوی (سروشت و دەروون لەگەڵ ئۆپەرێتی ئەنجامی یاران)لەچاپ دراوە.

**کۆمەڵەی (١) (بەهەشت و یادگار ) :**

کۆمەڵە شیعرێکە لەدیوانەکەی کە بابەتەکانی جوانی ودڵداری خەریکە ، هەڵبەستی وای تێدایە کە ٢٥ساڵ یان زیاتر دانراوە شێوەی ئەم هۆنراوانە کۆنە . یان وەك شیعرەکانی

(سالم ، نالی ) لەسەر پێ و شوێنی (غەزەل ) نوسیویانە یان ئەو جۆرە ئوسلوبەی تیا کراوە بە سەر مەشق کە مامۆستا (نوری ) و هاوڕێکانی لە ئەدەبیاتی تورکی عوسمانیان وەرگرت . لە سەردەمی سنورداردا (١٩٢٠-١٩٣٠) شیعری کوردی لەشای سلێمانی تازە کردوە.

ئەم کۆنانە زۆبەیان ،بە ناوی یادگاری کۆنەوە کراون بە بەشێکی جیاواز ، بەلاّم کەمێکیان لە باری سەرنجی نرخی ئەدەبی یانەوە - دیارە بەپێی چەند بۆچونێك لەگەلّ تازەکان تێکەلّ کراون.

شیعرە تازەکان بە وەزنی پەنجە (هیجا) هەلّبەستاون کە هەرچەند شیعر دۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی رانەهاتون ، بەلاّم لەبەر ئەوەی وەزنی تایبەتی نەتەوەیمانە وە بەتایبەت لەگەلّ زمانەکەمان چاکتر رێك دەکەوێ .

ئەم نوسراوانە کۆمەلّێك لقی لێ کردبوو وەك:

- بەهەشتی دلّ کەتێیدا چەند شیعرێکی تیا نوسیوە وەك ئافرەت وجوانی.گولّی خوێناوی . سکالاّ. بۆ گەورە کچێك ، وهەندێ شیعری تر .

- یادگاری کۆن وەك هەرچەن . ئەی شەوقی گەلاوێژ . لەبەختی تارا ، وهەندێ شیعری تر .

- لاسای ئەدەبی عوسمانی شیعرەکانی ئەم بەشە وەك کەنیشکە جوانەکە . مەدەنیەت . سێبەری هیوا .

ئەمەش کۆپلەیەك لە هۆنراوەی ئەم کۆمەلّەیە.

**ئافرەت وجوانی**

بە ئاسمانەوەئەستێرەم دیــــــوە
لە باغچەی بەهار گولّم چنیــــــوە

شەونمی دەرەخت لەروم پـــــژاوە
لەزەردەی زۆر کەل سەرنجـــم داوە

پەلکە زێڕینەی پاش بارانـــــی زۆر
چەماوەتەوە بەرامبەر بە خــــــۆر

هەتاوی نەورۆز ،مانگی جـــۆ دەرە
زۆر هاتون و چۆن بە رۆژ و بە شـــەو

خورەی قەڵبەزی کەف زیوینی چــەم
لە هەزار چەشنە پرشنگی ناو تـــــەم

میوەی گەیشتوی زەردو سوری ناو باخ
جریوەو جووکەی دارستانی شـــــاخ

**کۆمەڵەی (٢) : (فرمێسك و هونەر ) :**

گۆران ئەم کۆمەڵەیە پێشکەش دەکات ( بە ئەو گیانە پیرۆزانەی لە پێناوی هونەری جوانا فرمێسك و ئارەقی زۆریان ڕشتووە .

ئەمەشیان چەند شێوەیەك شیعری نوسیوە وەك.

– شێوەن و فرمێسك : کە تیایدا چەند شیعرێکی نوسیوە وەك(هاورێم بێکەس .لەسەرمەرگی هیوادا.گوڵی کەم خایەند) .

– هونەرە جوانەکان : تیایدا چەند شیعرێکی نوسیوە وەك( بۆ بلبل. بۆ سالم. هەڵبەستی دەروون) .

– دووهاوینە گەشت : ئەمەشیان تیایدا چەند شیعرێکی نوسیوە وەك (گەشت بۆ هەورامان.گەشت بۆ قەرەداغ ) . ئەمەش کۆپلەیەك لە شیعری ئەم کۆمەڵەیە کە بۆ شاعیری گەورەی کورد بێکەسی نوسییوە و دەڵێ .

**هاورێم بێکەس**

ئەی فریشتەی شیعری جــوان
کۆستی کەوتوی هردوکمــان
بۆ ئەم جارە بێ کەســـــــە
کە وتمان بێکەس . بەســـــە
شاعیرێك بوو فەننان بـــــوو
ئەدای خۆی ،خرۆشان بـــوو
بۆ باغچەی کزی کــــــورد
بلبل بو نەغـــــمـــــەی وردی
سرمرای بەهرەی فــەنـــــی
دڵسۆز بو بۆ وەتەنـــــــــــی
نرکەی شیعری رزگـــــاری

بێکەس شتێکەدیـــــاری

لە هەموو کوردستانـــــــا

لەناو بیر ئازادانـــــــا

کۆمەڵەی(٣) (سروشت و دەروون) ..

گۆران ئەم کۆمەڵەیە پێشکە ش دەکات (بە خاوەندی ئەو دەروونە روونانە کە درسی لە سروشت و جوان وەردەگرن . بۆ گیانی رابەرەکان و سەربازە نەبەزەکانی راپەرین . چ مردوو ، چ زیندوو .

ئەمەشیان چەند شێوەیەك شیعری نوسیوە وەك.

- (سروشتی جوان)چەند شیعرێکی تیا نوسیوە وەك(پایز .سەوزە گیای پایز. دیمەنی بەهر.بەهاری پاش باران

- (دەنگی دەروون) چەند شیعرێکی تیا نوسیوە وەك ( کوردستان . جەژنی نەورۆز . گیان . یارا . لەبەندین خانە) .

ئەمەش کۆپلەیەك لە هۆنراوەی ئەم کۆمەڵەیە..

کوردستان

کوردستان:جێگامی،جێی هەزار ســــەلام

پەروەردەی ئەم دۆڵ سەرلوتکەو یاڵـــــەم

هەناسەم تێربونی بای کـــوردســـتانــە

دوو لێوەم پاراوی بـــــەفـــراوانتــــە

سرنجم ڕاهاتووی زیوی زەرکـــەفتـــــە

بە زەردەی سەر بەفر ەی ئێوارە وەختــــە

گوێم فێرە بیستنی خوڕەی قـــەڵبـــــەزە

لەو هاستەی زوور بەفرە،داوێن گیای سەوزە

کۆمەڵەی (٤) (لاوك و پەیام) :

لەم کۆمەڵەیەدا دوو هۆنراوەی نوسیوە وەك.

- لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا .

- پەیامی کورد بۆ میهرەجانی چوارەمی گەنجان و قوتابیان لە بوخارس .

## کۆمەڵەی (٥) (لە کۆڕی خەباتا) :

ئەمەشیان چەند شێوەیەک هۆنراوەی نوسیوە وەک:

- (لەکۆڕی خەباتا)چەند هۆنراوەیەکی نوسیوە(شەهید ، نەورۆز ، بەرەو کۆنفرانس ، بۆلاوان) .
- (دڵۆپی مرواری) چەند هۆنراوەیەکی نوسیوە(یادی بێکەس ، ئاوابونێک ، یادی پیرەمێرد)

## کۆمەڵەی (٦) (ئۆپەرێت)

لەم کۆمەڵەیە دوو هۆنراوەی نوسیوە ...

- ئەنجامی یاران .
- ئەنجامی ئەزدەهاک .

## کۆمەڵەی (٧) (پیەس لەیەک پردەی کورتا ):

چەند شیعرێکی تیا نوسیوە وەک (شێوەنی دارستان ، ولأتی ئاوا ، دوشمنمان مێشولە ، خۆزگەی هەزار .

## کۆمەڵەی (٨) (شیعری گەپ) :

چەند هۆنراوەیەکی تیا نوسیوە وەک(چەقەڵ ، جاسوس ، دەنگی مردوو ، (ڕازی..ناڕازی) (دانە.. دانە .

## کۆمەڵەی(٩) (سروود) :

لەمەشیان چەند هۆنراوەیەکی تیا نوسیوە وەک (کوردستان ، دەمی ڕاپەڕین ، نەورۆزئەکەم ، یادی لەنین ، جەژنی ئایار ، گۆرانی قوتابیان .

## کۆمەڵەی(١٠) (شیعر بۆ منالأن) :

ئەمەشیان چەند هۆنراوەیەکی تیا نوسیوە وەک (گۆرانی دەنکە گەنم ، بەرخەکەم ، کەروێشك ، بەفر ، ساوای ئاشتی خواز ، پشیلەکەم ،

**کۆمەڵەی(١١) (وەرگێڕراو) :**

ئەمەشیان چەند هۆنراوەیەکی تیا نوسیوە وەك :

- (گەرانەوە لەزیندان ،گۆران ، قەیسی شەهید ، دڵەکەم ، هەروەك کەرەم ، گۆرانی لاوانی جیهان ، دوێنێ ، راست بنەوە ، داخی دڵ شێوەنبۆ نامیقکەمال ) .

- (خەیام بە کوردی) .

یەك شیعرێکی تیا نوسیومکە هەربەناوی کۆمەڵکەیەوەیە(خەیام بە کوردی ) .

- (هۆنراوە بە پەخشان وەرگێڕراو) کە چەند هۆنراوەیەکی تیا نوسیوە وەك(پییەر لۆتی ، هورەکان تێ دەپەڕن ، ئینسانی گەورە ، باوەڕەکەمان ) .

**کۆمەڵەی(١٢) (بۆزاخاوی مێشك) :**

- ئەمەیان یەك شیعری تێدایە ( بۆزاخاوی مێشك ) .

**کۆمەڵەی(١٣) (هەمەجۆرە ) :**

- ئەمەشیان یەك هۆنراوەی تێدایە (هەمەجۆرە ) .

کۆپلەیەکی تر لە هۆنراوەکانی گۆران کە بە خۆزگە و ئاواتەوە ئەیلاوێنێتەوە و خۆزگە بۆ ساڵی پێشوو دەخوازێت و دەڵێ :

خۆزگەم بە پار

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نـــــازدار

سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژارا

خۆزگەم بە پارا

خۆزگەم بە ساڵی رابـووردوو

عومری کوتری دڵداریم بـوو

لە پڕ هاتـو، لەناکاو چـــوو

یەك: پڕ بە دنیا ئـــارەزوو

دەریایەك تاسە .. ئەمە دوو

جێمابووم لە یاری مردوو !

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نـــــازدار

سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار

خۆزگەم بە پارا

ڕۆژ نەبوو چاوم بە دیـــــدار
شاد نەبیّ، نەسرەویّ ئـــازار
ڕۆژ نەبوو یار بە لـــەنجەو لار
چەشنی ئاسکی هەردەی بەهار
بە بەردەمما نەکـــا گـــوزار
نەمپێکیّ نیو نیگای خومـــار !

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نـــازدار
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار
خۆزگەم بە پار!

هەر ڕۆژە عیشـوەیەك، نازیّ
هەر خەڵوەتە چەشـــنە ڕازیّ
لەو توانج، لە من نیـــازیّ !
بۆ ماچیّ، نوقورچیّ، گازیّ
هەر بەزمە دەنگیّ، ئاوازیّ
بە چاو بینینی دڵخــوازیّ

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نـــازدار
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار
خۆزگەم بە پار!

بڵێن بە یار بیّ ئاوچـــاویّ
دیمان لەتاو دووری، تـــاویّ
ئەبڕشت لە فرمێسك لافـاویّ
ئاخی هەڵئەکێشا تـــاویّ
بـــە یـــادی بـــاڵا لاولاویّ
چاوڕەشیّ، ئەگریجە خاویّ !

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نـــازدار
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار

خۆزگەم بە پار!

پرسی کێ؟ بڵێن دامـــاوێ

هێلانەی دڵ لێ شێـــواوێ

دوانزە مانگ لە یار بـــڕاوێ

دوانزە مانگ! بۆ یار گریـاوێ

بەئاستەم نووزە تیا مـــاوێ

ئەیوەت: ناونیشانی نـــاوێ

ئەزانێ یار خۆی، کام هەژار، ڕۆژی سەد جار

ئەکا هاوار: خۆزگەم بە پار، خۆزگەم بە پار!

******************************

********************

*************

********

*******

**

*

## قانيع

## رۆژهەڵاتی کوردستان

(١٣١٨ – ١٣٨٥ ك) (١٨٩٨ – ١٩٦٥ز)

ناوی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ سەعیدی دۆڵاشیە و لەنەوەی (کابل)ی مەریوانن. لە ١٥ئەیلولی ١٨٩٨ لەگوندی (ریشێن)ی بناری شارەزوور لەدایک بووە.

لەتەمەنی (٤٠) رۆژیردا بوو کە باوکی کۆچی دوایی کردووەو لەتەمەنی دوو ساڵیشدا دایکی کۆچی دوایی کردووە.

ژیانی قانع لەزەمینەیەکی دەربەدەری و پڕ لە کوێرەوەرییەوە دەستی پێکرد.

بەهەتیوی لەلای خزمێکیان کەناوی (ئاغا سەید حوسێنی چۆپ)ی بووە لەناوچەی مەریوان گەورە بووە و هەر ئەویش خستوویەتیە بەر خوێندن.

پاشان بە فەقێیەتی چووە بۆ سلێمانی و چەند ساڵێك لەوێ ماوەتەوە.

هەر بەمەبەستی گەڕان بەشارەکانی کوردستان دا بۆ خوێندن چۆتە (سنە و مەریوان و سابلاغ و بۆکان و شنۆ و هەولێر و کۆیەو کەرکوك و سلێمانی و بیارە) و دوا قۆناغی خوێندنیشی لەمەریوان تەواو کردووە.

قانع بەر لەوەی بەتەواوی فێری خوێندن و نووسین ببێت توانای شاعیرێتی تیا دەرکەوتووە و لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا خوی داوەتەوە شیعری ئایینی.

دواتر بەهۆی بارودۆخی کوردستانەوە خولیای شیعری نیشتمانپەروەری بووە، خوێندنەوەی کتێبێکی دەستنووسی فارسی بەناوی (وقایع ال اردەلان) کەباسی راپەرینەکانی تیرەی ئەردەڵانییەکان ئەکات بەرامبەر داگیر کەران، هێندەی تر کار ئەکاتە سەر دەروونی شاعیر و بەرهەمە شیعرییەکانی و ئیتر ئەبێتە شاعیرێکی نەتەوایەتی ونیشتمانپەرەوەر.

لایەنە لەیەك نەچووەکانی شیعرەکانی شاعیر ئەوە ئەگەیەنێ کەزادەی فیکری یەك سەردەم و پێویستی یەك قۆناغ و بەرهەمی یەك ئێش و ئازار نین، بەردەوام باوەڕی بەیەکگرتنی جەماوەرو یەکسانی کۆمەڵایەتی هەبووە و لەسەرەتای چلەکانەوە بەتایبەتی لەرۆژگاری دووەمین جەنگی جیهانیدا رێبازی سۆشیالیستی وەکو دیاردەیەکی سیاسی زیندوو لەناو شیعرەکانیدا رەنگی دایەوەو لەسەنگەری شیعری شۆڕشگێرانەدا دژی دەرەبەگی چەوسێنەرو ئیمپریالیزم بووە و هەمیشە دڵی لەگەڵ ئازار و ئاواتی مرۆڤی جوتیاری

چەوساوەی کورددا بووە و وەك شاعیرێکی دڵسۆز و خەم خۆری کورد شیعری بۆ نەتەوەی کورد هۆنیتەوە و لەگەڵ بەسەرهات و کارەسات و راپەرین و شۆرش و دەستکەوتەکانی کورددا ژیاوە.

لەشیعرەکانیدا داوای مافەکانی ژنانی کردووە لەبوارەکانی رۆشنبیری وکۆمەڵایەتی و ئابووریدا.

قانع لەسەرەتای پەنجاکاندا بەهاوکاری مامۆستایان (عەلادین سەجادی و شوکر مستەفا) توانی پێنج بەش لە شیعرەکانی بەشێوەی دیوانی جیاجیا و قەوارەی تایبەتی چاپ بکات، کە ئەم بەرهەمانەن(گوڵاڵەی مەریوان، باخچەی کوردستان، چوارباخی پێنجوێن، شاخی هەورامان، دەشتی گەرمیان). بۆ خوێندن چووەتە شاری سنە لە مزگەوتی رەشیدی قەلا بەگیدا . چووتە گوندی بالك لە شاری مەریوان .چووەتە شاری کۆیە لە مزگەوتی پەلك لە لای مەلا تۆفیق خویندنی فیقی تەواو کردووە .چووەتە شاری سلیمانی لای مامۆستا شیخ عومەری قەرەداغی خوێندنەکەی تەواو کردووە و ئیجازەی مەلایەتی و زانستی وەردەگرێت .. ئیتر دەست دەکات بە خزمەتکردن گوند بە گوند و شار بەشار .لەژیانیدا گەلێ کارو پیشەی کردووە لەوانە مامۆستای قوتابخانەو کرێکاری و مامۆستای مزگەوت و جوتیاری و ئاشەوانی و فەرمانبەرێتی.

لەکۆتایی پەنجاکاندا چەند جارێك خراوەتە بەندیخانە. لەساڵی (١٩٦٠)دا لەبەندیخانەی سلێمانی چۆنیەتی نووسینی زمانی کوردی فێری زیندانییەکان کردووە.لە (١٩٦٣)دا لەگەڵ وریای کوڕیدا لەبەندیخانەی (قەجەر)ی تاراندا زیندانی ئەکرێ و هەر لەو بەندیخانەیەدا هۆنراوە بەناوبانگەکەی نووسیوە کەدەڵێ:

ئاخرین ماڵی ژیانم کــــونجی بەندیخانــــەیــــە
ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانــــەیــــە
زۆر دەمێکە چاوەروانی زیرزەی زنجیر ئەکــــــەم
سەیری ئەم زنجیرە کە وەك زێوەری شاهانــــەیــــە
بووکی ئازادیم ئەویٚ خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی
حەلقە حەلقەی پێوەنم بۆ پێڵەو لەرزانــــــەیــــە
گەرچی دوژمن وا ئەزانێت من بە دیلی لاڵ ئەبــم
باش بزانێ کونجی زیندام قوتابیخانــــــەیــــە

گرتن و لیّ دان و کوشتن عاملی ئازادیـــــــــه

تۆپ و شەستیر و کەلەپچە، لام وەکوو ئەفسانەیـــه

بیری ئازادیم لە زیندان فراوانتر ئـــــــەبێـــــت

قوڕبەسر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانـــەیـــه

چاومروانی شۆرشێکم عالەمیّ رزگـــــار بکـــــا

میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانـــەیـــه

چەکی شۆرشگێری من نووسین و بیـرو بـــاوەرە

راپەرینە هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانـــەیـــه

گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەلاتە بۆ لـــەشـــم

نۆکەری و سەر دانەوەاندن کاری نا مەردانـەیـه

قانعم ئەمرۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیــــــــم

سەد هەزار لە عنەت لەوەی نۆکەری بێگانـــەیـه

قانیع لە وێژە و زمانی کوردی و فارسی و عەرەبیدا دەستێکی باڵای هەبووە و بە هەرسیّ زوبان هۆنراوەی هۆنیوەتەوە . هەروەها شارەزای مێژوو و لێکدانەوەی قورئان و رێزمانی عەرەبی بووە و پتر حەزی لە مێژووی گەل و نیشتیمانەکەی خۆی کردوە و کاتی بیّ کاریی خۆی بەو چەشنە پەڕاوانە رابواردووە و لە هۆنینەوەی هۆنراوەیشدا دەستێکی بەرزی هەبووە و هەموو جۆرە هۆنراوێکی هۆنیوەتەوە کە زۆربەیان لە چاپ دراون .

قانیع وەکو زۆربەی هۆنەرانی تری کورد شەیدای دیمەن و جوانی نیشتیمانەکەی بووە ، هەر بە منداڵی دەرگای هۆنراوەی بۆ کراوەتەوە بە منداڵی هۆنراوەی هۆنییوەتەوە ...

قانیع ئەم پارچە هەڵبەستەی بۆ خۆشەویستەکەی نوسیوە کە گوایە خۆشەویستەکەی ئاوڕی لێنەداوەتەوە و ئەویش لە ئەنجامدا بە شیعری ناخی خۆی بۆ دەربڕیوە و سکاڵای دڵی خۆی بۆ خۆشەویستەکەی ناردووە کە هەواڵی بپرسێت و لای لێبکاتەوە ... دەگێڕنەوە سیّ دەفتەری لە شیعر بۆ خۆشەویستەکەی نوسیوە بەڵام کاتی شووی کردووە قانیع لە داخ و ئاخدا دەیانسووتێنیّ .... دەڵیّ :

دیدەم نەونەمام ... دیدەم نەونەمام

دیدە راستەکەم باڵا نەونەمـــــــــــام

بۆچی ناپرسی لە حاڵی غـــولام
هەتا قیامەت من هەر بە تەمـــام
دڵەی ئازارت لە چی رەنجـــاوە
گەرمە مەیلەکەی ئەوسات نەمـــاوە
مەیلت بۆ ساردە بە قسەی بەدگـــۆ
بە قسەی رەقیب مەکە رەنجـــەرۆ
دیدەم شابازم تەرلانی تـــەوار ... تا کۆتای هۆنراوەکە ......

لە پاشدا قانیع دەستی داوە بە هۆنراوە هۆنینەوەی کۆمەڵایەتی و سەیر دەکات هەر کەسەو بۆ خۆیەتی و کەس خەمی لای کەسی نییە و بۆیە دەڵێ ...:

با بنوسم شیعری کوردی تاکو خەڵکی تێبگـــات
شیعری کورد شیرینترە تا شەکر و هەنگوین و نەبـات

من بە هیوا بووم کە تەپڵی شادومانیم لێـــدەن
چەندە مەئویسم لە حاڵی خۆم کە بۆچ دەنگی نەمات

ئاوری دەروم ئەدەم هەرکەس بە دەردێ موبتـــەلا
یەك لە برسا هار و هاج یەك لە ترسا زیز و مـــات

چونکە وا نارێکە کۆمەڵ تا ئەبەد سەرناکـــەون
دەوڵەمەند گوێ شل نەکا بۆ ناڵەی و فریـــادی لات

تۆ لە دونیادا نەجاتی چوار کەسی وەك من نـــەدەی
پێم بڵێ رۆژی قیامەت چیتە ئەسبابی نەجـــات

تۆ پزیشکی حاڵزان و من نەخـــۆش و دەردەدار
چاکە ئینسافت بێ کە خۆم خستە پـــەنـــات

قانیعە گەر تۆ بەراستی خزمەتی هۆزت دەکـــەی
چاوەڕوانی قەد نەکەی بۆ بەخشش و موچە و بـەرات

قانیع هۆنراوەی بۆ ئامۆژگاری خەڵك هۆنیوەتەوە ، مەبەستی ئەوە بووە کە لە نەزانین دووربکەونەوە و هەوڵبدەن بۆ هاوکاری یەکتر و یەك دەست بن بۆ بەرەو پێشبردنی وڵات و جوانکردنی نیشتمان ... دەڵی :

سەریٚ وەك مێو بیٚ لە حاسەتی دوژمن

بەلاٚم پۆلاٚ بیٚ بەرانبەر بـــــە مـــن

پڕ بیٚ لە خەیالٚ بۆ کچۆلــــە و ژن

وەك بیبیچیتۆ لە ناو تۆی کفـــــن

لە خوا ئەخوازم کە ببڕین چـــــیٚ

تا دوا هەناسەی بەزار و شین چـــیٚ

سەریٚ لە حەننای یاران نەرم نەبـــیٚ

بۆ کەس و کاری تەواو گەرم نەبـــیٚ

لە ڕێی ناموسا لەسەر تەرم نەبـــــیٚ

لە گەلٚ ریش سپی پڕ لە شەرم نەبیٚ

لە خوا ئەخوازم کە ببڕین چـــــیٚ

تا دوا هەناسەی بەزار و شین چـــیٚ .. تا کۆتای هۆنراوەکە

******

شاعیر روو دەکاتە خەلٚك و بە هۆنراوەکانی دەیهۆنێتەوە و دەلٚی ئەی خەلٚکینە کار بکەن و عەرەق برژێنن و ریشەی تەمەلٚی دەربێنن و بە ڕەنجی شانی خۆتان بژین و روو بکەنە خوای گەورە و بە رەنجی دەست و شانی خۆتان بژین ....وەکو دەلٚیٚ ..

چەند خۆشە کورم عەرەق برژێنــــــی

لە دەشت و دەرا غیرەت بنوێنـــــــی

نانی سەپانی خۆت بە دەست بێنـــی

ریشەی تەمبەلٚی لە بن دەربێنـــــــی

چاکی و پیاوەتی بەر مەدە لە دەست

بۆ هاشە و هوشە گویٚ مەدە بە کـەس

وەنییە تۆ کەو بیٚ ئەم دونیا قەفـــەس

برۆ هەرلایە کە ئارەزووت هـــــەس

رۆلە بە دائیم روو کەرە خــــــوا

هەرچیی گا کیلاٚی نابیٚ گا بیخـــوا

نیوەی دەست ڕەنجت هەر بۆ بیٚ نەوا

خۆت رسوا مەکە بۆ کراس و کـەوا
هێندە بخوێنە کە خوێندەوار بـــێ
لە ناو کۆمەڵدا زرنگ و هۆشیار بـی
بە نازی چاکە تۆزێ دیار بـــی
چ لە لادێ بێ یاخو لە شار بـــی
رۆڵە عیسای یاخۆ مـوســـای
مەچۆ بە گژیا هەر بە خـۆڕایی
هەتا ئەتوانی بە دڵنەوایــــی
بیهێنە سەر ڕێ ڕێگەی برایــی

قانیع لە چیرۆکە شیعریشدا دەستێکی بەرز و باڵای هەبووە لە بەر ئەوەی خۆی لە لادێدا ژیاوە ، بە چۆنییەتی ژیانی خەڵکی لادێ ئاشنایەتییەکی رەبەقی بووە ، لە چەکامەی مازوو چنین لە لادێدا تابلۆیەکی تەواوی خەڵکی لادێی کێشاوە و لەوەدا باسی مازوو چنینی خەڵکی لادێ دەکا ، لە باری کێش و پاشڵ و ناوەڕۆکەوە زۆر بەرزە و هیچ چەشنە ناتەواوییەکی تێیدا نییە و هەموو ڕێکوپێکن و لەسەر کێشی حەوت هیجائی هۆنراونەتەوە .
چەند پارچە هۆنراوەیەکی کە باس لە ژینی لادێ دەکات و دەڵێ ...

ژینی لادێ ســەیــرانـــە گەرچی تۆزێ گـــرانـــە
رەوژی نەورۆز ئەوەڵ ســـاڵ        دەکەونە ئیش کروکـــــاڵ
یا جووت یا جۆگە هێنـــــان        بۆ ئاوداشتن دەخـــڵ و دان
یا دار برینی شـــاخـــە یاخۆ پەرژێنی باخـــــە
یـــا تـوتـــە یـــا درەو ناوەستن بە رۆژ و شـــەو
یا گێرە یا شەن کـــــردن        هەڵمەت بۆ فەرمان بـــردن
فەرقی نیـــە نێر و مـــێ هەرچی دانیشتووە لـــە دێ
هەموو خەریك فەرمـانـــن        بە دەستهێنانـــی نانـــن
تا تەواو دەبێ هـــاویـــن تێدەکۆشن زۆر بـــە تیـــن
بەینێ لەویا بــەتــاڵـــن خەریکـــی ئیشـــی ماڵـــن
تیـــرەك لێدان گڵـــەبـــان        کۆڵان گرتـــن بە تەیمـــان
کە ئیش رووی کردە تـــەواو        کۆ ئەبنۆ لە حـــەوز و ئـــاو

چەند داریٚ بیٚ لای مزگەوت　　هەندیٚ راس و هەندیٚ چ ەوت

لە بۆ سێبەر نێژراون　　سەکۆی لە بن کراوە

ئەهلی دیٚ کە زۆر و کەم　　لەسەر سەکۆ ئەبن جەم

تاویٚ شەرە ئاو بژێن　　بەگاڵتەوە شەرە جوێن

تاویٚ باسی ژن هێنان　　تاویٚ تاریف دەخڵ و دان

دوو سیٚ رۆژیٚ بەم جۆرە　　بە گۆرانی و بەهۆرە

رائەبوێرن بە شادی　　گاگا بیری ئازادی

مام خواکەرەم دنیا دیو　　بانگ دەکا هەتیو مەتیو

بۆچی هێندە منداڵن　　هەتاکو کەی لە ماڵن

بەراوردم تەواوە تەقەی مازوو شکاوە

گێتان کوڕی مەیدانە یەڵڵا مازوو چنانە ....تا کۆتایی هۆنراوەکە

قانع لە هەڵبەستەیکدا هۆنراوە بۆ گۆری موفتی پێنجوێنی ئەمێنیتەوە وە دەڵیٚ :

ئەی برای شیرین یاری هاوفەردن
کڵێشەی وێنەی رەنگەکەی زەردم
هاورێی منالی یقوتابخانەکەم
هاورێی چۆڵ گەردی بیابانەکەم
هاورێی سارای مەیل مەریوانەکەم
هاورێی هاتووچۆی گەرمیانەکەم
هاودەرد هاودەروون" هاوخەیاڵەکەم
هاورازی پەنهان" هاوئەحواڵەکەم
هاوبیر ،هاوگریان، هاوشین، هاوزاری
هاوئێش،هاوبرین، هاوبیٚ قەراری
من وتۆ هەردوو قوربانی خاک بووین
بۆجێماوی هۆز دیدە نەناک بووین
بۆجێماوی هۆز دیدەنم ناک بووین
من وتۆ هەردوو بولبولی گوڵ بووین
یەک لەیەک بەدتر گیرۆدەی چڵ بووین
من وتۆ هەردوو ئاوارەی دەردبووین

من وتۆ هەردوو هەناسە سەردبووین

چەن تیری تانەی وەتەن فرۆشان

چەن توانجی سارد، بیە وخۆێشان

چەن کزەی جگەر، چەن قرچەی دەروون

چەن ئاهی شەوان بەزارو زەبوون!!

چەن شەوی پایز، تا ڕۆژ دوو بەدوو

چەن هەوڵی بێ سود، چەندە هاتووچوو

بۆبەجێت هێشتم ڕووناکی دڵم؟

دیلی گیراوی زیندانی گڵم

## چەند پارچە هۆنراوەیەکی قانع

### یاری دڵڕوبا

دڵم زنجیر ئەکەم ئەمما ، لە یاری دڵڕوبا چی بکەم؟

ڕەگم وشکە وەکوو پووشە، لە قووەی کارەبا چی بکەم؟

کە من پێم پڕ لە خاری میحنەتە هەر تاکوو بەر ئەژنۆم

قەدەم ئەنداز ئەکەم بۆ لات، لەگەڵ کەوشی وەسا چی بکەم؟

لە ڕۆژ بێزارم و مەحرەم بە من هەر تاریکی شەو بوو

کە سێبەر ڕەقیبم بێ، لە ڕۆژی ئاشکرا چی بکەم؟

دەمێ کوژراوی ئەبرۆتم، دەمێ خنکاوی ئەگریجەت

ئەبێ تاوێ خەمێکم بێ، لە یاری بێ بەقا چی بکەم؟

********************

لەم پارچە هۆنراوەدا باس لە ژیانی زیندانی خۆی دەکات و ڕوو دەکاتە دوژمن و دەڵی خەیاڵیان خاوە بە زنجیر و کەلەپچە ساردمان بکەنەوە لە نەتەوەبووی خۆمان

ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە

زۆر دەمێکە چاوەڕوانی زیڕزەی زنجیر ئەکەم

سەیری ئەم زنجیرە کە وەك زنوەری شاهانەیە

بووکی ئازادیم ئەوێ خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی

حەلقە حەلقەی پێوەنم بۆ پلپلەو لەمرزانەیە

گەرچی دوژمن وا ئەزانیت من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندام قوتابیخانەیە
گرتن و لێ دان و کوشتن عاملی ئازادیە
تۆپ و شەستیر و کەلەپچە، لام وەکوو ئەفسانەیە
بیری ئازادیم لە زیندان فراوانتر ئەبێت
قوڕبەسر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندیخانەیە
چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ رزگار بکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە
چەکی شۆڕشگێری من نووسین و بیرو باوەڕە
راپەڕینە هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانەیە
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەر دانەواندن کاری نا مەردانەیە
قانعم ئەمڕۆ لە زیندانا بە ئازادی ئەژیم
سەد هەزار لە عنەت لەوەی نۆکەری بێگانەیە

## ماموستا زێوه ر
## باشوری کوردستان
## ( ۱۲۹۵ – ۱۳٦۸ ك )( ۱۸۷۵ – ۱۹٤۸ ز )

پەنجاو حەوت ساڵ لەمەوبەر شاعیر و مامۆستای پەروەردەکاری ناسراوی کورد مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا ڕەسووڵ، ناسراو بە "زێوەر" لە شاری سلێمانی لە تەمەنی ۷٥ساڵیدا کۆچی دواییکرد لە سەر داوای خۆی لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە و کەلێنێکی گەورەی لە ناو شاعیرە کلاسیکییەکانی کورد بەجێهێشت.

ئەو شاعیرە بەهرەدارە زانایە لەساڵی ۱۸۷٥ لەشاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە و لە سلێمانی و لەشارەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات وەك بانە و مەهاباد و لەکوردستانی باشووریش لە هەولێر و کەرکووك خوێندوویەتی بووەتە مەلایەکی زانا و سەردانی ئەستەمبوولی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی کردووەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ زانا و ئەدیبەکانی ئەو شارە بەهات و باتە کردووە و کە گەڕاوەتەوە شاری سلێمانی لە مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۰۸ دا کراوە بە مامۆستای قوتابخانەی "ڕوشدی عەسکەری" لە سلێمانی و لە دوای دامەزراندنی میری عێراقیش لە ساڵی ۱۹۲۱دا کراوە بە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی و ماوەی ۳۰ ساڵ نەوەی نوێی کوردی فێری خوێندنەوەو نووسین و وێژە کردووە . مامۆستا زێوەر یەکێ لە هۆنەرانی هەرە بەرزی کوردە و گەلێ هۆنراوەی بەرز و جوان و شیرینی هەیە و لە هەموو بارێکەوە هۆنراوەی داناوە و زۆربەی هۆنراوەکانی سادە و ڕەوانن ، وە لە ڕێگەی هۆنراو و وێژەوە گەلێ ڕازەی کردوە ، جگە لەمانەش چەند نامیلکەیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی بە زمانی کوردی نوسیوە و کە پلەوپایەی زانستی ئەو دەگەیەنن ، بە هەر زمانی تری عەرەبی و ز فاسی و تورکی ئاشنایی هەبووە و هۆنراوەی هۆنیوەتەوە .

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە پەڕاوی ( مێژووی ئەدەبی کوردیدا ) سەبارەت بە هۆنەریەتی مامۆستا زێوەر هەر لە دەوری منداڵیدا بێجگە لە دیمەنەکانی کوێدستان و شاخی ڕەنگاورەنگی وەختی بەهاران تام و بۆنی هۆنراوەکانی مەولەوی و نالی لە هەموو دەمارەکانیدا هاتوچۆیان کردبوو ، بەم بۆنەیەوە هات (زێوەر) ی کرد بە ناوی هۆنراوی خۆی و کەڵکەڵەی بەرزی بەرتەی جوانی خۆی زێوەر ئارا کرد ...

بەرامبەر ستەمی دەوڵەتی عوسمانیی بەرامبەر بە کورد ئەوەندە دڵیان هێناوەتە کوڵان و دەڵێ :

ئەم وەقتە کە پڕ فیتنە و ڕێی بەستنە ئێستـــا    خۆشی کە ببێ مردنە یا نوستنە ئێستـــا

دوو یاری وەفادار و بەبێ غەش نییە هەرگیز    هەرچی کە تەماشای ئەکەم دوژمنە ئێستـا

ئاشوب و بەلاّ و فیانە وەکو تەرزە ئەبـاریّ    هەرجەردەیی و هەر دزی و کوشتنە ئێستا

مامۆستا زێوەر شاعیرێکی بەهرەداری بەتوانا بووە ، لە شیعری غەزەلدا مامۆستایەکی باڵادەست بووە و گەلێك نموونەی بەرزی لەم بابەتە ناسکە هۆنیوەتەوە و یەك لە هۆنراوە سەرکەوتووانەی ئەم نموونەی خوارەوەیەتی و چەند دێڕێکی لیّ دەخەینە ڕوو:

تکانی ئابرووی چەمەن بە رووی ئـــابـــدارەوە

شکانی نرخی نەستەرەن بە زوڵفی موشکبـــارەوە

چمە لە مەی ! لە جام ! ئەگەر بە لەنجە بێتـــە لام

بە روویی ئابدارەوە ، بە چاوی پڕ خومـــارەوە

عەرەق نییە لە عالەما کە لابەریّ لە دڵ غەمـــا

جگە لە قەترە عارەقیّ لە رووت کە دێتە خـوارەوە

نیشانی من جەماڵی تۆ بەراتی من ویساڵی تــۆ

خەیاڵی من لە خاڵی بە عیشوە لێم مەشـــارەوە

عەزیەکەی حەبیبی من نیگارەکەی تەبیبی مـــن

با شەق بەریّ رەقیبی من وەرە بەسەد ویقـــارەوە

فیدای خەد و قەدی تۆ چەمەن بە فەوجی گوڵیـــەوە

بە بولبول و ب چڵیەوە بە قـومـری و چنـــارەوە

فەرهەنگ روو و زەنگ کوو عەجەم سیاق و روو خوو

ئەناسریّ کە کوردە زوو ب پەیچی لارو خـــوارەوە

نیشانی زوڵفی عەنبەری هەموو وڵاتی گوڵ عەمـــەر
بەعەرد و بەرد و دارەوە بە ئاوی سەرچـــــــنارەوە

ئەمن گەیاندمە ئەنوەری فنونی شیعر و شاعیــــری
ئەتۆش گەیانتە سامری بە چاوی سیحر کـــــارەوە

زۆر کات شاعیرانی کورد هۆنراوەی دڵدارییان وەك دڵدارێکی حەقیقی نەبووە و چونکە لەو سەردەمانەدا هۆنراوەی بێ دڵداری لە ناو شاعیراندا نەدەناسرا و بۆیە شاعیرانی کورد زۆربەیان ئاینی بوون دڵدارەکانیان بەئاینی و خۆشەویستانی ئیسلامەوە ووتوە یان بە خەیاڵ بە دار و جوانییەکانی کوردستاندا ووتووە .

مامۆستا زێوەر سەبارەت بە مەبەستی کۆمەلایەتی گەڵ دواوە و هۆنراوەی هۆنییەوەتەوە ، رێ و رەوشتی چاك و خراپی خەڵکی خستووەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و گەڵ ئامۆژگاری خەڵکی کردووە و رێی چاکی پشانداون و ئەو کارەی کە خراپە هاتووەتە بەرچاوی داوای لە خەڵك کردووە کە خۆیان بە دوور بگرن و تووشی خراپە نەبن ، لە پارچە هۆنراوەیەکدا بە ناو نیشانی ( عەرەق ناخۆم) زۆر بە جوانی هۆنیویەتەوە ، بە یەکجاری و تەواوی دەری دەخات کە عارەق بۆ کۆمەڵ زیانێکی زۆری هەیە و مرۆڤەکان تووشی نەخۆشی جۆر بەجۆر دەکاو ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێت گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بێ درودی خوای لەسەر بێت ... دەڵێ :

عەرەق ناخۆم کە توشی دەردی سەر بــــــم
گرفتاری هەزار دەرد و خــــەفـــــەت بــــم
هەرچی خوا حەز ئەکا ئەیکەم بە بێ دەنــــگ
ئیتر بۆ شەرمەزاری ناو بــــەشـــــەر بــــم
عەرەق ناخۆم کە ژینم کوردت و کەم بــــێ
بە جوانی بۆچی من توشی زەرەر بــــــم
عەرەق ناخۆم کە دوچاری وەرەم بــــــم
هیلاکی خستەگی قەلب و جگەر بـــــــم

عەرەق ناخۆم کە بێ هۆش و خیرەت بـــم

لە حاڵی دۆست و دوژمن من بێ خەبەر بم

عەرەق ناخۆم لە قـــاقـــا و پێکەنینــــــم

بەجارێ مەسخەرەی ئەهلی نەزەر بـــــم

ئەگەر فەزڵ و هونەر لەم کارەدایـــــــە

لەخوا خواستم وەهایە بێ خەبەر بـــــم

لە بۆن و بۆگەنی بێـــــزارە تەبعــــــم

فیدای ئەمری خــــوا و پێغەمبــــەرم

مامۆستا زێوەر لە پارچە هەڵبەستێکی تردا باسی جوانی کوردستان و ئاو و سازگاری جوانی کوردستان و گوڵو گوڵزاری وڵات .. هەموو جیهان دەهێنێ و دەڵێ : من چیمە لە جلوبەرگی هەندەران بۆچی رانك چۆخەی دەستکردی مەڵبەند و نەتەوەکەم لەبەر نەکەم ، وە لە جێی کۆشك و تەلار و دەردی سەری شارە گەورەکان بۆچی لەسەر کێوانی بەرز و خۆشدا لە کەنارەکانی رووبار و کارێزدا دانەنیشم و ئاوی سارد نەخۆەوە لە زێدی مەڵبەندەکەم وە تەماشای ئەو دیمەنە جوانانە نەکەم کە پڕ لە جوانی گوڵ و گوڵزار و پەلەوەرانی جۆراوجۆر و هەوای فینك ... بەم شێوەیە بۆمان دەڵێ ..

من چیمە لە فاسۆنی فەرەنگ و چۆغەی لیـوی

تا شاڵی مەرز بانە خوری بێتە قوماشـــــــم

دانیشتنی سەرچاوەیی ئاوانی چیاکانــــــم

نایدەم بە هوو مولکی جیهان گەرچی گەداشـم

بۆ سەیری گوڵ مێرگی نزاران لە بەهـــــاران

چاوم وەکو نێرگش گەشە مەفتوونی هەواشـــم

داخم ئەوەیە هاووەتەمەنم زۆری نەزانـــــــن

بەم دەردەوە ئەتلێمەوە ئاو کەوتووەتە ئاشــــم

مامۆستا زێوەر سەبارەت بە ئابووریش گەلێ هۆنراوەی جوانی هۆنیەوەتەوە لە پارچە هەڵبەستێکیدا روو دەکاتە وەزیرێك دەڵێ

مامه هۆمەر سەد شوکر تۆ قووت و چاوت هەیـــــە

هەر لە دێیەك چەن ڕەز و عەرد و بەراویشت هەیـــە

توتنەکەت قیمەت نەکا سەد ئیشی تر بۆت قابلــــە

دێیەرت زەرعی پەمووکەی ئاوڕێس چاوت هەیـــــە

توتنەکەت قیمەت نەکا مازوو گەزۆ پێستە و خـــوری

شاڵی زۆر جوان و نەجیبی دەشتی خۆشناوت هەیــە

قول لە پەستەك هەڵکێشە و بچۆرە کێوی بۆ شکـــار

بۆ تیجارەت وەك دەڵەك وەك ڕێوی سەگلاو ت هەیە ... تاکۆتایی .....

واتە : مامە تۆ سوپاسی خوا بکە کە چاو و لەشت ساغە و لە دێیدا چەن ڕەز و بەراوت هەیـــــە

توتنەکەت با نەیکرێت مازوو گەزۆ و پێستە و خۆی و شاڵی زۆر جوانت هەیە هەموو کەسێك کڕیاریەتی ، جگە لەمانەش دەتوانی بچی بۆ شکار و ڕاو دەڵەك و ڕێوی و سەگلاو بۆ پێستەکەیان شکار بکەی ..... مامۆستا زێوەر گەلێ هۆنراوەیشی بەسەر سروشت و جوانیدا وتوە ، ئەو سروشتە جوانەی کە بە فەرمانی پەروەردگار نەخشاوە و بەهار و هاوین و پایز و زستانی بۆ مرۆڤەکان بەدی هێناوە تا کەڵکی لێوەربگرن و تییا بحەسێنەوە ، لە پارچە هەڵبەستێکیدا کە بەسەر وەرزی زستاندا هۆنیویەتییەوە زۆر جوان و ڕازاوانە دەڵێ :

زستان وجوودی ساغە دەماری بەقووەتـــە

ئەمڕۆ کە بیست و پێنجی شەبابیــــــە

ئەم هاژە هاژ و بارشە عوود و ڕوبابیـــــە

دەرحەق فەقیر و کوێو و هەتیو بێ مرووەتە

دونیا بووە بە بەحری سپی شاخ و شێو و دەشت

ئاو دێ جەزیرەیەکی ڕەشە چەشنی ماڵتەیـــە

ئەم بەفرە بەفری ڕاستە نەوەك بەفری گاڵتەیــــە

ڕێگای براوە ڕان کــــە بچێتــە گەشـــــت

گەردن کەچی سوپاهی زستانە شـــاخ و دار

سەرشۆڕ و بێ تەراوەت و بێ مەنزەرەی جوان

بێ سەوزەزاری ڕێگەیی ئاوی سپی و رەوان

بۆ قاسپەقاسپی کەبک و بە بێ تەقمەیی هەزار

مامۆستا زێوەر هۆنراوەیشی بە زاراوەی گۆرانی هۆنیوەتەوە لە پارچە هەڵبەستێکدا کە بە بەماردا هۆنیوەیەتییەوە دەڵێ :

نەوەهار بەزمەن نەوەهار بەزمـــــەن

پەرێ عاشقان نەوەهار بەزمـــــەن

وەشی دەروونەن سەیرانەن رەزمـــەن

عالەم دڵگوشا ئاهەنگش عەزمـــەن

گـەشـتوگـوزار پـۆل یارانـــەن

ناز و نەزاکەت عیشــــوە دارانـــەن

شەرِەن ئاشــــتیەن رازەن نیـــازەن

ووشەی شەوق نوور عەین ئەعــجـازەن

عالەم بەرگ سەوز پۆشا ســەراســەر

یەکسەر جەنەتەن سارا و دەشـــت و دەر

قەمقەمەی کەبکەن وەســـەر هەردەوە

نەوای بـــوڵبوڵــەن بـــاز وە دەردەوە

نەرگش دیدە مەست لالە رەنگ سوورەن

گوڵ مەسنەدنشین بوبڵبوڵ رەنجـــوورەن

تیپ تیپ و رەم رەم پوا غـــەزالـــەن

شۆخەن شیرینەن ئەبـــرۆ هیلالـــەن

شەونم چون لوێ لوێ مەدرەوشۆ چە دوور

چمان گەوهەرەن وەیا قەترەی نـــوور

(زێوەر) ئارەزووش وەسڵ دڵــــدارەن

غافڵ جەتۆف فەســـڵ بەهـــارەن

شاعیر لە نیشتمانی و سروودی پڕ سۆزی قوتابیانیش یەکجار لێهاتوو بووە و ئاشقێکی شەیدای کوردستان بووە ، بۆیە لە هۆنراوەیەکی نیشتمانیدا کە کراوە بە سروود گوتوویەتی:

ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی

مەزرەعەری توخمی نەشات و باعیسی ژینی منــی

تیشەیێ نادەم لەبەردت تۆی کەشیرینی منـــــی

لە کۆتایی هنراوەکەدا دەڵێ ....

ئارەزوو و فیکری سیاحەت ناکەم ئیتر ئەی وەتەن

تۆ لە جێگای قاهیرە و تاران و بەرلینی منـــــی!!

مامۆستا زێوەر لە پارچە هەڵبەستێکی تریدا بە بالای ژاربازێردا دەڵێ :

چوومە شار بازێر بەهەشتی دنیـــــا دێ بەدێ گەڕام ناودەست و چیا

بە حـەێرانەوە جـوانێ لەشــــــانێ ئەم بەیتەی ئەوت عالەم بیزانێ

بژی زەکی بەگ بژی ئینحیصــــــار نەجاتیمان بوو لە کێشی قینگار

لـەو دیوە چوومە ناحـیەی پشــــدەر ناحیەی ماردان جێی شیروخەنجەر

لاوێ لاوکـی ئـەوت لە شــاخــــی زۆر بەسەر بەرزی زۆر بە گوستاخی

بـژی حکوومـەت بژی ئینحیصـــــار نەجات بووین لەدەست دەستەی تەماحکار

ئەمجا ڕووم کردە ناحیەی ســووورداش‌ناو چەمی (تابین) دەوری (کەلەباش)

لەسەر شاخەوە کە گوێم بۆ ڕاگــــرت کابرای (ماغاغی) ئەم فەردەی ئەوت

بژی عەداڵەت بـــــژی ئینحیصـــار لەعنەت لەڤاڵم نەفرەت لە غەددار

لەسووورداشەوە چووم بۆ بــازیـــان ئەهالی هەموو بەشەوق و بێ زیان

چوومە قەرەداغ جوانێ بەقــەتـــار عەکسی دەنگەکەی دابوویە کۆهسار

ئەی وت:هەربژی ڕەببی ئینحیصــــار نەجات بووین لەدەست هەشت حوققە بەچوار

چوومە (شارەزوور) مەعدەنی ئاڵتـوون ئەهالی هەموو دڵشاد و مەمنوون

بەهۆرەی کوردی ناو دەربەندیی خـۆش کە ئاوازیان ئەگەیاندە عەرش

خۆش بێ وڵاتمان بژی ئینحیصــــار تووتن لە چارەك گەیشتە دینار

سیا چەمانەی شاخی هـــــــەورامان ئامۆزا گیان پێنجوێنی کوێستان

خـاڵـەی ڕێبوار لــە کـوڕە کــــازاو تەسکین ئەدا بە دڵی سووتاو

خولاصەی قسە،شادیی ئینحیصـــــار نەشئەی خستە ناو دەشت وکۆهسار

زێوەر جگە لە شیعری غەزەل و وەسف و نیشتمانی و شیعری فەلسەفە ئامێز، کۆمەڵێك شیعری فێرکردنی بۆ قوتابیانی کوردستان داناوە و دەتوانرێت بووترێت یەکەمین شاعیری کوردە ئەم جۆرە شیعرە فێرکردنی دانابێ .....

بۆمان دەرکەوت کە مامۆستا زێوەر لە هۆنینەوەی هۆنراوەی ئاینی و کۆمەڵایەتی و دڵداری مامۆستا بوە و لەم مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاوداوە و هەروەها لە نوسین و پەخشانیشدا پسپۆڕ بووە و لەم بارەیەوە چەند نامیلکە و پەرتوکێکی نوسیون .

***************

****

*

*

## حاجی قادر کۆیی

## باشوری کوردستان

**( ١٢٤٥ -١٣١٤ ك ) ( ١٨١٦ – ١٨٩٧ ز )**

کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەیە . ناوی دایکی فاتێ (فاتیمە) بووە . لە نێوەندی وێژە و ڕۆشنبیری کوردیدا ئەوە باوە وشەی "حاجی" پێشناوی چوونە حەجی نییە ، چونکە حەجی نەکردووە ، ناوی قادر یا عەبدولقادر بووە و لە مانگی حاجییان لە دایکبووە لەبەر ئەوە لە منداڵییەوە بەحاجی قادر ناوبانگی دەرکردووە . حاجی لە ساڵی ١٨١٦ لە گوندی گۆڕقەرەج لە دایکبووە ، ئەم ئاواییە کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای شاری کۆیە نزیك شوێنەواری گۆمەلاڵەی دۆڵی مۆردان.

سەبارەت بە مێژووی لە دایك بوون و مردنی حاجی قادری کۆیی لە نێوان نوسەران و مێژوونوسان جیاوازی هەیە بەم شێوەیە :

مامۆستا عبدالرحمن سەعید دەڵێ : ساڵی (١٢٣٢ – ١٣١٢) کۆچی داناوە .

مامۆستا علائەدین سەجادی و گیومو کریانی و محمدی مەلا کریم ساڵی ( ١٢٣٥ – ١٣١٢ ) ك داناوە .دکتۆر مارف خەزنەدار و دکتۆر ئیحسان فوئاد ساڵی (١٢٣٢ – ١٣١٤ ) ك داناوە .

مامۆستا ئەمین زەکی بەگ بۆ مردنی حاجی قادر ساڵی (١٣١٤) ی کۆچی داناوە . مامۆستا صدیق بۆرەکەیی لە مێژووی وێژەی کوردی دەڵێ : بە پێی کەشکۆڵێکی کۆن کە لەم دواییانەدا کەوتووەتە دەستمان مێژووی لە دایك بوون و مردنی حاجی قادرمان بە تەواوی بۆ روون دەبێتەوە لەم کەشکۆڵەدا نوسراوە کە حاجی قادر لە ساڵی ١٢٤٠ ی کۆچی لە دایك بووە ، لە ساڵی ١٣١٤ ی کۆچی لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە .

حاجی زۆر منداڵ بووە کە باوکی مردووە . لە تەمەنی حەوت ساڵیدا فاتێی دایکی ناویەتی بەرخوێندن. لە نەریتی ناو کوردەواری ئەوە باو بووە کوڕی تاقانە بەمنداڵی باوکی کۆچی دوایی کردبێ دایکی دەیخستە بەرخوێندن. خوێندنی بەرایی حاجی لای مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گونبەتی بووە . ئەمە خاڵۆزای حاجی بوو. لە دوای دوو ساڵ فاتێی دایکیشی کۆچی دوایی دەکا. بەم جۆرە بێ کەس دەمێنێتەوە و مەلا ئەحمەد بەخێوی دەکا.

لە خوێندنی حوجرە تا گەیشتۆتە قۆناغی فەقێیەتی لە کۆیە بووە . لە هاوینی ساڵی ١٨٥٣ لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە وەك فەقێیێك بۆ خوێندن ڕوو لە گوندی شێخ وەتمان لە ناوچە باڵەکایەتی دەکا. هەردووکیان دەبن بەفەقێی مەلا محەمەدی کاك عەبدوڵڵا.

له دوای ماوه‌یێك حاجی له مه‌لا عه‌بدوللّای جه‌لی زاده جیا ده‌بێته‌وه و به‌ته‌نیا به‌ره‌و شاره‌كانی سه‌رده‌شت و سابلاّغ (مه‌هاباد) و شنۆ ده‌كه‌وێته ڕێ، بۆ ماوه‌ی شه‌ش حه‌و ساڵ له‌م شارانه‌دا ده‌مێنێته‌وه تا پرۆگرامه‌كانی خوێندنی حوجره ته‌واو ده‌كا له زانستییه‌كانی ئایینی ئیسلام و زمانی عه‌ره‌بی. له ساڵی ١٨٦٢ مۆڵه‌تی دوازده زانستی وه‌رگرتووه و به‌رێگای ده‌شتی لاجان و باڵه‌كایه‌تی گه‌ڕاوه‌ته‌وه كۆیه .

ژیانی حاجی له كۆیه ئاسان نه‌بووه ، له‌به‌ر ئه‌وه به‌هیچ جۆرێ بۆی نه‌كراوه مه‌لایه‌تی بكا، یا خۆی نه‌یویستووه خه‌ریكی پیشه‌ی مه‌لایه‌تی بێ، هه‌روه‌ها بێ ئۆقره‌یی كاری له ژیانی تایبه‌تی خۆی كردووه و بووه به‌هۆی ئه‌وه‌ی ژن نه‌هێنێ و خۆی نه‌خاته ناو داوی خێزانی و تووشی به‌خێوكردنی ماڵ و منداڵ نه‌بێ.

پێوه‌ندی حاجی به‌ئاغا و كاره‌به‌ده‌ستانی سه‌ره‌وه‌ی كۆمه‌ڵی كۆیه بنه‌ماڵه‌كانی حه‌وێزی (به‌تایبه‌تی ئه‌حته‌ر – ئه‌مین ئاغای شاعیر) هه‌روه‌ها غه‌فووری و مه‌لاكان باش بوو، به‌لاّم ئه‌مه نه‌یتوانیوه له تیر و توانجی سیستێمی ده‌ره‌به‌گی و بزووتنه‌وه‌ی ده‌روێشیزم كه هه‌میشه له خزمه‌تی ده‌سه‌لاّتی سوڵتانی عوسمانی بوون ڕزگاری ببێ.

لێره‌دا شێخ نه‌بی ماویلی ڕۆڵی گرنگی بووه له به‌ربه‌ره‌كانی كردنی حاجی و ته‌نگه‌تاوكردنی تا پله‌یێك ولاّت به‌جێ بێڵێ و ئاواره‌ی ولاّتان بێ. ئه‌م شێخ نه‌بی ماویلییه مه‌لایێكی باش بووه ، له ڕواندز خوێندوویه‌تی و له‌وێ ژیاوه . شێخی ته‌ریقه‌تی نه‌قشبه‌ندی بووه ، ماڵی له كۆیه بووه ، ئاماده بووه هه‌رچی خراپه هه‌یه بیكا بۆ به‌رژه‌وه‌ندی خۆی و دابینكردنی ولاّت. بێ گومان هه‌ڵوێستی كه‌سێكی وا به‌رامبه‌ر به‌بلیمه‌ت و ڕاستگۆ و زیره‌ك و نیشتیمانپه‌روه‌ر له‌خۆبردوویێكی وه‌كو حاجی له كاری خراپه به‌ولاوه به‌رامبه‌ری هیچی دیكه نابێ.

حاجی سه‌ری خۆی هه‌ڵده‌گرێ و ڕوو ده‌كاته ولاّتی ئاواره‌یی، له ئه‌نجامدا له ئه‌سته‌مبووڵ ده‌نیشێته‌وه . وه‌كو نالی له‌و شاره گه‌وره‌یه‌دا گوم نابێ. له كوردی دڵسۆزی هاوڕه‌گه‌زی خۆی ده‌گه‌ڕێ، هه‌ندێكیان ده‌دۆزێته‌وه ، دیارترینی ئه‌و كوردانه چه‌ندانێك له ئه‌ندامانی بنه‌ماڵه‌ی به‌درخان پاشا ده‌بن.

حاجی له ئه‌سته‌مبووڵ وه‌كو جووتیارێكی دواكه‌وتووی نیوه‌ی دووه‌می سه‌ده‌ی نۆزده‌مه‌ی كوردستان ناكه‌وێته ڕوو، هه‌روه‌ها وه‌كو كۆلكه مه‌لایێكی مردووشۆر نابینرێ، به‌ڵكو وه‌ك ڕۆشنبیرێكی شاره‌زا و هوشیار و دڵ و ده‌روون پڕ له هێزی پێشكه‌وتن و شۆڕشی خۆی

دەنواند. لەبەر ئەوە کۆمەڵی تازەپێشکەوتوو لە چاو کۆمەڵە دواکەوتووەکەی خۆی زیاتر ڕێی بۆ خۆش دەکرد شتی نوێ فێر ببێ. نزیکی ئەستەمبووڵ لە ئەوروپا ڕێگەی بۆ حاجی خۆش کرد بینینی بەرامبەر بەئەوروپا فراوانتر بێ. ئۆتۆمۆبیل و شەمەندەفەری لەو وڵاتەدا چاو پێ کەوت. لە نزیکەوە
ڕۆژنامە و گۆوارەکانی وڵاتی عوسمانی دەخوێندەوە .

بناغەی بوونی حاجی بەڕۆشنبیر و زانای هاوچەرخ و ڕامیاری و ستراتیجی و دانا لە کۆیە دەستی پێکرد، لە کوردستانەوە ئەم بیروڕا نوێیانە لە لا دروست بووبوون بەڵام لە وڵاتی عوسمانی لەم لایەنەوە گەلێ شتی نوێ فێر بوو.

حاجی کە پشتی لە وڵاتی خۆی کرد تەنیا شاعیر نەبوو، هەڵگری بیروباوەڕی نوێی دەرەوەی دوازدە زانستەکەی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بوو، کۆمەڵی نوێ یاریدەی دا ئاسۆی بیروڕای مرۆڤایەتی و نەتەوایەتی زیاتر فراوان ببێ ڕۆژگارانی ماوەی ژیانی حاجی لە وڵاتی عوسمانی زۆر ئاشکرا نییە ، ڕاستە ئێمە دەزانین پێوەندی بەبەدرخانییەکانەوە هەبوو، بەڵام لەو سەردەمەدا ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانییان، خۆیان دەستبەسەر بوون چاوای خەفیە و سیخوڕی وڵات بەدوایانەوە بوون، لە هەموو هەرێمەکانی کوردستانی گەورە بڵاو بووبوونەوە هەروەها لە ئەستەمبووڵ و شارەکانی سوریا و قاهیرەی میسر و جێگەی دیکە دەبینران، زیاد لەسەر ئەمە لە مەڵبەندی خۆشیان جزیری بۆتان دەژیان، جا ئێمە ئەوە دەزانین زۆربەی ژیانی ئەو وڵاتەی حاجی لەگەڵ ئەواندا لە ئەستەمبووڵ بوو، بەڵام ڕەنگە لە جێگەی دیکەش لەگەڵیاندا ژیا بێ، جێی وەکو جزیری بۆتان.

سەرچاوەی هەرە گرنگ بۆ ڕوونکردنەوەی ژیانی حاجی هۆنراوەکانی خۆیەتی، چونکە تەنیا هۆنراوەی دڵداری نەوتووە بەڵکو چۆتە ناو ناخی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکەیەوە ، بێگومان ئەم جۆرە هۆنراوانە زانیاری زۆر بەدەستەوە دەدەن، لەبەر ئەوە پێویستە بایەخ بەم جۆرە بەرهەمەی شاعیر بدرێ.

هەرچۆنی بێ لە دوای تەمەنێکی درێژ زۆربەی بۆ خۆی نالەباری بوو، بۆ نەتەوەی بەختیار بوو لە ئەستەمبووڵ لە ساڵی ١٨٩٧ کۆچی دواییکرد. وا باوە لە ئەستەمبووڵ نێژراوە ، بەڵام گۆڕی پیرۆزی دیار نییە .

لە ساڵی ١٩١٣ دا لە ژمارەی ٢ی گۆڤار ڕۆژی کورددا ، جمال خزنەدار ئەرک بڵاوکردنەوە و پێشەك و لەسەر نوسین کێشاوە ، پێنج هەڵبەست حاج بڵاوکردووەتەوە .

له ساڵی ١٩٢٥ دا عبدالرحمن سەعید (کۆمەڵە شیعر حاج ) بڵاوکردەوە . هەرچەندە بە نوسینێ کۆن چاپ کراوە .

له ساڵی ١٩٤١ دا ڕەفیق حیلم سەرگوزەشتە و هەندێ لە هۆنراوەکان حاجی بە شیکردنەوە لە بەرگ یەکەم (شیعر و ئەدەبیات کوردی) دا بڵاوکردەوە ، ٢٠ لاپەرە بۆ تەرخان کردووە .

له ساڵ ١٩٥٣ دا گیوموکریانی چاپی دووەمی دیوان حاجی چاپ و بلاو کردەوە ، وە لە ساڵی ١٩٦٩ شدا چاپی سێهەم ئەو دیوانە هەر لە هەولێر چاپ کرداوە .

له ساڵی ١٩٦٠ دا محمدی مەلا کریم لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بە ناو نیشان ( حاجی قادری کۆی شاعیر قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ) چاپ و بلاو کردەوە .

له ساڵی ١٩٦١ دا کەریم شارەزا لە کتێبی ( کۆیە و شاعیرانی )دا حەوت لاپەرە بۆ ژیان و شیعر حاجی تەرخان کردووە .

له ساڵی ١٩٦٦ دا دکتۆر عیززەدین مستەفا رەسولْ نامە دوکتۆراکەی خۆی بە زوبانی عەرەبی و بە ناونیشان ( الواقعه فی الادب الکرد ) لە بەیروت چاپ کردووە ولە لێکۆڵینەوە زانستیدا بۆ شیعرەکانی حاجی شەش لاپەرە تەرخان کردووە . لە ساڵی ١٩٦٦ دا دکتۆر ئیحسان فوئاد پوختەی نامەکەی دوکتۆرا بە زوبان رووسی لە مۆسکۆ چاپ کرد کەهەندی لاپەرەی بۆ حاجی تەرخان کردووە . لە ساڵی ١٩٤١ – ١٩٧٤ – ١٩٧٦ – مەسعود محمد سێ بەشی کتێبەکەی حاجی چاپ کرد و بە ١١٧٥ لاپەڕەی گەورە ، لە ژیان و هۆنراوە و شاعیریەتی حاجی کۆڵیەوتەوە ..

چەند چمکێك لە راستییەکانی حاجی قادری کۆیی کە لە دیوانەکەیدا هاتووە :

– : حاجی تا نەچووەتە ئەستەنبولْ شیعری نەتەوەی و کۆمەڵایەتی دانەناوە ، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەك نییە بە دەستەوە کە حاجی پێش چوونی بۆ ئەستەنبولْ شیعری لە سەر نەتەوایەت وتووبێت .

– : بە زۆری شیعرە دڵدارییەکانی حاجی زیادەی بیر و هەستی ژیانی کوردستانی رۆژهەلات و باشووری بوون ، چونکە لە ئەستەنبولْ لە هۆنراوەی نەتەوەیی و کۆمەلایەتی و لاواندنەوە گوێی بە هۆنراوەی دڵداری نەداوە .

– : ئەگەر مامۆستا کورەکانی بەدرخانییەکانیش بووە ئەوا وا ناگەینْ کە هەموو دەم لە ماڵی ئەواندا ژیابێ ، بە بەڵگە شیعرەکانی خۆی ماڵ و ژووری تایبەت بووە .

– : هەرچەندە حاجی وەك ڕووناكبیرێكی پێشكەوتوخوازی سەردەمی خۆیی سەیری مەسەلەی نەتەوایەتی كردووە و ویستویەتی بە جۆرێكی زانستیانە چارەسەری فەلسەفەی ژیان بكات بەڵام لە سنووری فەلسەفەی ئاینی ئیسلام دەرنەچووەتە دەرەوە ، بۆیە دەتوانرێت بە حاجی بوترێت شاعیرێكی مەلا بیر و ڕووناكبیر .

– : حاجی تا كۆتایی ژیانی ژن و خێزانی نەهێناوە و بێ ژن و ماڵ و منداڵ ماوەتەوە . هەرئەمەش بووە هۆی ژیانی بوو بە كۆسپ ئەناكو ژن و منداڵ ببوایە بۆ كۆكردنەوەی هۆنراوەكانی ئاسان بوو ساغ كردنەوەیان و كۆكردنەوەیان .

حاجی قادر لە هۆنەرانی هەرە بەرزی كوردە و لە ئاسانی وێژەی كوردەواریدا هەتا هەتایە وەكو ئەستێرەیەكی گەش دەدرەوشێتەوە .. بە پێی وتراوەكان حاجی لە سەرەدەمی لاوێتیدا دەستی كردووە بە هۆنینەوەی هۆنراوە وە هۆنراوەكانیشی زۆر سادە و ڕەوان و دڵگیرن ، لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا سەری كێشاوەتە ناو دەرگای هەموو چەشنە هۆنراوەیەكەوە : ئاینی و دڵداری و كۆمەڵایەتی بەڵام زیاتر مەبەستی لە هۆنینەوەی هۆنراوە ئەوەبووە كە خەڵك سوودی لێوەربگرێت .

حاجی دەكەوێتە ناو كۆڕی خواناسانەوە بە چەند هۆنراوە ستایشی خوای تاك و تەنها دەكا و گەورەیی و مەزنی و شان و شكۆهی خوای مەزنمان بۆ دەردەخا و لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێن كە كەمتر هۆنەرێك توانیوەیەتی بەم چەشنە ستایشی خوا بكا و لامان وایە یەكەم كە توانیویەتی پێی بكا و بەم جۆرە بە یەزداندا هەڵبڵێ و ستایشی بكات ....

وەك دەڵێ :

ئەی بێ نەزیر و هەمتا ، هەر تۆی كە بەر قـــەراری
بێ دار و بێ دیـــاری ، یێـــدار و پایــــــەداری
بۆ باغی مەردی باغی ، سەرمایەكەی خەزانـــــــی
بۆ مەزرەعەی فەقیران سەرایەكەی بـەهــــــاری
بۆ پادشا نیشانی بۆ هەر سەودای ئەعــــــــزەم
بێ سەدر و شانشینی بێ پەردە پـــــــەردەداری
جەبباری بێ فتووری سوڵتانی بێ قـــــــووری
ڕەزاقی مار و مێرووی ئاودێری دێمەكـــانـــــی
فەیروزی تەختی گەردوون مەوزووعی نەخشی تۆیە

یاقوت و لەعلی رۆژە ئەستێرکان دوڕاری
جێ و مەکانی تۆیە ، بێ جێیە و بێ مەکانی
لیل و نەهاری تۆیە ، بێ لەیل و بێ نەهاری
هەر ئەمری تۆ مەدرا بۆ کاروباری عالەم
هەرچەندە بێ وەزیر و بێ سەدر و کارو باری
سەحرا نەوەردی شەوقت خورشید و ماهی تابان
دوو جاریەن شەو و رۆژ بێ مەحمەل و عەماری
مەعلومە بۆچی ( حاجی) مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری

لە پارچە هەڵبەستێکی تردا هاوار بۆ پەروەردگار دەکات و دەڵێ :

یا ئیلاهی

یا ئیلاهی بە ئایەتی مونزەل
بە چوار یار ئەحمەدی مورسەل
بینەوایانی موڵکی کوردستان
هەر لە کانی تا دەگاتی شوان
لە خەوی جەهل و مستیو غەفڵەت
بە خەبەر بێن بە نەغمەیی رەحمەت
پاکی دەرچن لەکار نا بە مەحەل
رۆمی رافرێنن بۆ دەری ئەسفەل
حاجیە شیعرەکانی وەك کارە
رۆژی دەبینین درەفشی هەڵداوە

حاجی عاشقی زێدو مەڵبەندی کوردەواری بووە لە چەند هەڵبەستێکدا بە ناوی بەهار هۆنیویەتیەوە باسی جوانی نیشتیمانەکەی دەکات ئەم هۆنراوەی لە کاتێکدا هۆنیویەتیەوە ئاگری دووری و دەردی ئاوارەیی و دەربەدەری و بێ کەسی جەرگ و هەناوی هەڵکزاندوە و سروەی سەودای نیشتیمان باوەشێنی کردووە و ناچار بەو هۆنراوانە دڵی پڕ لە زوخاوی

خۆی فێنك كردووەتەوە كە خۆی بە ئەستەمبوڵی غەریبایەتی ژیاوە مەبەستی مەڵبەند و نیشتیمانی ئەو خاكە پاكەیە كە خوای مەزن بە دیی هێناوە و ئێمەی تیایا دەبین و تیایا دەژین ، ئەو تاڤگە و كانی و كارێز و سەرچاوانەیە كە بە ناو ئەو خاكە شیرینەدا دەڕوا و ئەو شەماڵ و هەوای ژیان بەخشەیە كە بێ ترس و لەرز و بە ئازادی هەموو هەڵی دەمژین ، زۆر بەجوانی باسی مەڵبەندی كوردەواری دەكات و دەڵێ :

وتم بە بەختی خەواڵوو وەرە ئەتۆیی خـــــودا
لە خەو هەســــتە زەمـــانێ بچینەوە ئـــەولا

گوڕەی بەهارییە ئێستێكە شاخ و داخــــی وڵات
پڕە لە لالە و نەسرین و نەرگسی شەهـــــــلا

لە گرمەگرمی سەحاب و لە هاژەی بــــــاران
چیایە پڕ لە هەرا و نەواڵە پڕ لـــــــە ســـــەدا

پڕە لە سەیل و گۆلاو و كانی رووبی زەمـــیـــــن
پڕە لە بەرق و بریقەی بروسكە جەووی سەمــــــا

شكۆفە دەرهەمی شاباسی بادی وەعدە دەكـــــا
لە شەوقی مەقدەمی خەمڵیوە دار و بەردی چیـــا

پیاڵەیی زەڕی نێرگس لە سەر كەفی سیمیــــــن
پڕ لە شەونمی وەك دوڕی لـــوئـلـــوئـــی لالا

گوڵیش بە پەنجەی پیرۆزی جامی یاقـــــووتـــی
لـــە بۆ نیساری موهــەیایە پڕ لـــە زێڕ و تـــەڵا

لە شادی وەك سەفی شایی لە كێو و كەژ ئەزهـــار
هەزار بە خەلعەتی گولگوون دەكەونە رەقس و سەما .... تاكۆتایی ....

حاجی لە بابەتێكی تردا دەدوێ ئەویش بابەتی كۆمەڵ و كۆمەڵایەتییە . وە دەست دەكا بە پەند و ئامۆژگاری كۆمەڵ و بە تەواوی باری چۆنیەتی ژیانی خەڵكی وسەردەمی خۆیمان بۆ

دەگێڕێتەوە ، دەڵێ وێژەوانان و هۆنەران چاك وایە ڕەخنەم لێنەگرن بۆ ئەم قسانەی کە دەیکەم ، هەندێ لە نەتەوەکانی تر لەم سەردەمەدا هەر پیشە و کارێك کە دەیکەن تا تاقی نەکەنەوە نایخەنە روو و ناوی نابەن و کەوابوو مرۆڤ دەبێ لە کار و تێکۆشاندا بێ ، دەبێ خانەقا و شێخەکان چ سوودیکیان هەبێ بۆ ئێمە ، وادیارە کە لە بێ کاری و تەوەزەلی و تەمبەڵی فێرکردن و کۆکردنەوەی سامان و دارایی بەدەر هیچ سوود و کەڵکیان نییە ، پێغەمبەری ئیسلام درودی خوای لەسەر بێت لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێ (( بە شوینی زانست و زانیارییدا هەتا چین برۆن )) نێرومێ لەم فەرمایشتەدا هیچ تۆفیرێکی نییە ، ئەگەر کەسێك نەمێڵێ و بەرگری لەم کارە بکا دیارە دینی نییە . هەرچی بەهرەیە لە خوێندەواری دەبنە دەروێش و مارگر و بار هەڵگرم ... بەڵی بەم چەشنەش دەست دەکات بە هۆنراوەکەی و دەڵێ :

ئودەبا چاکە لێم نەبـــن درهـــەم
لەم قسە و لەم حیکایەتەی دەیکـــەم

ئیدیعای هەر سەنایعێك ناکـــــەن
تاکو نەیخوێنن و ئیمتیحانی نەکـــەن

خانەقا و شێخ و تەکییەکان یەکســـەر
پێم بڵێ نەفعیان چییـــە ئاخـــر

غەیری تەعلیمی تەمبەڵی کـــردن
جەمعی ئەملاك و خەزنە کۆکـــردن

دەفعەیەك ئیمتیحانیان ناکـــەن
تێ دەگەن ڕێگرن یانە تریاکـــن

مەحەکی لێ بدەن ئەگەر وەکـــو زەڕ
تێ دەگەن یگرن وە یـــا ڕێبـــەر

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمیـــن
( اطلبـوا العلم ولـو بالصيـــن )

نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نییـــــــە
گەر مەلا نەهی فەرموو دینی نییـــــــە

تۆ وەرە فێری فەن بەچیتە لـــــــەوە
گاورە هیندووە وەیا خــۆ جـــــووە

لازمە خول بخۆی وەکـــو بـــەرداش
هەمو قەرنێک دەگۆڕێ ئەمری مەعـــاش

تەمبەڵی کاری حیز و بـــێ خێـــرە
دەستی ماندوو لەسەر زگـــی تێـــرە

ئەهلی جەننەت نە شوان و گاوانــــە
ساحیبی فەن و عیلم و عیرفـــانــە

هەرچی بێ بەهرەیە لە کەسب و کەماڵ
دەبنە دەروێش و مارکر و حەمـــــاڵ

ئەو هەمووە مەدح و بادەیی دڵبــــەر
نووسراوە لە سەد هـــەزار دەفـــتەر

یا وەکو سولوسی شیرین و فەرهـــاد
بەیتی حاجی لەبەر هەزار دەفتـــەر

ئێستە میللەت دەبوونە ساحیب جـــا
یـانــە هـــاوتـــایـــی ئەولیائوڵلا

عیشقبازی و هـــەوای دەروێشـــی
میللەتی خستە فەقر و دەروێشـــــی

بەسە (حاجی) دووسەد هەزار دەفعــە
پێم گوتی ئو قســـــانە خۆڕایـــە

قوڕی کام جێ بکەم بەسەرخۆمـــا
ئەمە لێم بووتە عیللەتی ســـــودا

بەسەی چاکە دەستیان دەگــــرم
تەرکی ناکەم بەلۆمە تا دەمـــرم

حاجی داخ و موخابن دەخوا و دەڵێ : هەر ماڵێك کە کرابێتەوە بۆ خودا وەك کەعبە وایە بۆ پەرستنی خوای مەزن ، بەڵام لەم هەموو شێخ و دەروێشانەی کە من دەیانبینم نابینم کە تاکێکیان بچنە مزگەوت و خوا بپەرستن ، ئەوەیە کە مزگەوت و میحراب بێ کەسە ، تەنانەت کەسیش گوێ بە قوتابخانە و فێرگە نادا .... دەست دەکات بە هۆنراوەکەی و دەڵێ :

یانی هەر ماڵی کرابێ بۆ خــــودا
کەعبەی عولیایە بۆ زیکر و دۆعـــا

شکڵی تەکیە و خانەقا و تەکیەکـــان
واقیعەن ڕەنگەینن ئەما بۆ ریـــان
لەم هەموو شێخ و موریدان ریـــا
تاکێکی ناچێتە مزگەوتی خــــودا

مەسجید و میحراب و مەنبەر بێ کەسـە
هەر مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەســـە

موعجیزە و کەشف و کەرامەت و دۆعـا
بۆچی نەبوو فەخری عالەم موستەفـــا

جیسمی نوورانی و ددانی گەوهەریـــن
ئەو شکا و ئەمیان بووە جێگای بریـــن

حاجی لە پارچە هەڵبەستێکدا ناوی هەندێ لە هۆنەرانی کون و نوێی هێناوە و باس کردون و لەمەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە حاجی زۆربەی کاتی خۆی بەخوێندنەوەی دیوانی هۆنەرانی کورد بەسەر بردووە و چێژو شەیکەی وێژەییانی لێوەرگرتووە ، لەو پارچە هۆنراوەیەدا ناوی ئەم هۆنەرانەی هێناوە ( کوردی ، نالی ، رەنجووری ، فیکری ، ئەمین بەگی دزەیی ، کەیفی ، سالم ، مەحوی ، شێخ رەزا ، خەستە ، وەفایی ، جامی ، سەلمان ، مەلگە قوڕ ، شێخ ئەحمەد ، فەقێ تەیران ، بێتووشی ، بێسارانی ، مەڵکە ، مەلا خدری رووباری ، میرزا یاقۆ ، فەقێ ئۆمەر ) بە هۆنراوەکەیدا دەڵێ :

(نالی ) ئوستادێکی گەلێ چا بوو
خدری ئاوی حەیاتی مەعنا بـــوو

یەکێ تر بوو ( محمدی فیکـــری )
مووی دەئەنگاوت بە تیرێکی فیکری

یەکێ ( رەنجووری ) ئەهلی کەرکووکە
فیکری بیکری هەموو وەکو بووکـــــە

کەیفی حاجەت نیە بەکەم باسی
ئەم کتێبە بخوێنی دەیناســـــی

( سالم ) و ( مخوی ) و شێخ رەزا ) و ( خەستە)
شـــاعـیرن هـــەر چـــواری بەرجەستــــــــە

لە کون و قوژنی کەلاوەیی دەهــــــــر
چەندی تر هەن میسالی گەنج و گەوهـەر

ئەحمەدی خانی ساحێبی مەم و زین
شـــاهبــازی فــــەزایی عللیــن

وەکو بێتوشی شاعیری عەرەبـــی

تا قیامەت نە کەس بووە نەدەبێ

خۆ ( مەلا مستەفای بێسارارن )
بێ نەزیرە لە نەزمی کوردستان

دەشتی کەرکوک و کێوی هەورامان
شاعیری زۆرە بێ حەد و پایـــان

سادە هەر نراویان بکەم ئیملا
ئەم کتێبە بچوکە بەش ناکـا

ئەحمەدی کوڕ لە شاری سابڵاخە
بەیتێکی داخە بەتێکی باخـــە

ئەمە سەرپاکی شاعیری غـــەران
هەروەکو ئەسنەوین لە نێو کوردان

گشتیان بێ نەزیر و یەك وەزنن
قابلی بەزم و لایقی ڕەزمـــــن

حاجی چۆنیەتی خیلافەتی دەوڵەتی عوسمانی ڕووندەکاتەوە و پەردە لە سەر ڕوومەتی شوومی دەوڵەتەکەیان هەڵدەدا و دەڵێ : پشت بەم بە ناو عوسمانییانە کەبەستن و ئەمانە گورگن و لە پێستی مەڕدان ، ئەمانەخۆیان بەکەلەپوور گری ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەزانن ، هەموویان بەندەی بتن و لە ڕێی خوا و پێغەمبەرەوە ناڕۆن جگە لە تووڵانەوە خراپە کاری تریان نییە و دەڵێ :

ئەم سگانەی ك لە لای ئێوە وەکیل و کـــەلان
بێنە لای تۆ بە خودا نایکەیە گاوان و شـــوان
ئەمە کەر میزە دەڵێن وارسی شەرعی نەبەویـــن
هەموو عەبدی سەنەمن باسی مەکە گەورەکەیان
خۆم بەدارا و بەئەسکەندەر و خەسرە و نـادەم

گەر بزانم لەبەر ئەم دەرگەیە دەبمە سەگـــوان

نالی و خاکی بەبە ، حاجی و کۆیە بە مەتـــەڵ

هەروەکو حافیزی شیرازە کەلیم و هەمـــــەدان

حاجی قادری کۆیی گەڵێ جار دیوانەکەی لە چاپ دراوە و چاپکراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو هۆنراوەکانی لە یەك دیواندا کۆنەکراوەتەوە چەند هەڵبەستێکی هەیە .

حاجی قادر وا دەرکەوتووە لە سەرەتاوە هۆنراوەی لە جوانی گولەکانەوە وەرگرتووە و کەوتووەتە داوی روومەت گوڵانەوە لە هۆنراوەیەدا دەڵێ :

مەە و مێهری بەغارەت دا بەشوعلەی شەمعی روخساری

گوڵستانیش بەیەغما چوو لە تەنگی خونچەیی زایـــی

لە نەشئەی چاوەکەی مەستی مەە و مەیخانە وێرانـــن

هەموو کەس بەندی زونارە لە سەودای زوڵفی تاتـــاری

دڵ و گیان و جیهان و تەن وەکو ئیمان و دینی مـــن

فیدای روخساری گوڵناری نیساری زوڵفی ئـــــەڕاوی

ئەشیعەی مێهری گەدوون و شوعاع و شەعشەعەی بەدری

لە سایەی پرتەوی رووتە بە قوربان نووری یـــا نـــاری

دەخیل ئەی چاوی جادوگەر بفەرموو مەردومان یەکسـەر

دەڵێن خەوتووی و بێداری دەڵێن مەخموور و هۆشیـــاری

بپرسە (حاجی) تۆ جارێ لە زوڵف و پەرچەمی خـــواری

بڵێ گەر تاوی بۆز ماری بڵا گەر ماری بۆچ تـــــاری

حاجی قادری کۆیی لە پارچە هەڵبەستێکی تردا بۆ نیشتیمانەکەی هۆنراوە دەهۆنێتەوە و دەڵێ

کوردە دەزانی لەکوێ ساکنەخزمانـــی تـــــــۆ

گووێگرە تاپێت بڵێم مەسکەنی قەومـــانی تـــۆ

کێویی توورووس و عومقی حەوزەکەی ئەسکەندەروون
غەربی یە تابەحری ڕەش سەرحەدی مەیدانی تـــۆ

بەحری ڕەش و ئەردەهان ئاوی ئـــەرا ســـەبزان
حەددی شیمالە ئەمەگۆری بێچـــوولانی تـــۆ

ئەڵوەندو کێوی ڕۆمی تاسەری کێـــوی ئـــەراس
سەرحەددی ڕۆژهەڵاتە جۆگەو کێـــوانی تـــۆ

ئەموازو کێوی حەمرین زەنگارو ڕێ ی نووســـەی بین
بۆ گە رەفی جەنووبە ڕەوچە یی ڕێچوانی تـــۆ

داخلی ئەم سنوورە دووانزە ویلایەت هـــەیـــە
دەڵێن دووانزە میلیۆنە نفووسی کوردانـــی تـــۆ

حاجی درۆیە ئەصلا نفووسیان نەنـــووســـراوە
دەگاتەبیست ملیۆن بنووسرێ خزمـــانی تـــۆ

## پـيـره مـێــرد
## بــاشــوری كــوردســتـــان
( ١٢٧٨ – ١٣٧٠ ك ) ( ١٨٧٦ – ١٩٥٠ ز )

پیرەمێرد، ناوی (تۆفیق مەحمود هەمزە)یە، ئەم شاعیر و ڕۆژنامەنووسە مەزنە، لە ساڵی ١٨٦٧ی زاینی بەرامبەر بە ١٢٨٨ی كۆچی، لەشاری سلێمانی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، لەو ڕۆژەدا ماڵی مەحمود ئاغای هەمزاغای مەسرەف، خۆشی و بەشارەتێكی زۆری تێكەوت. گۆزەبانە دەبەخشرایەوە، مزگێنی ئەدراو زەردەخەنە لەسەر لێوی ئەو پیاوماقوڵانە دەنەخشا، كە پیرۆزباییان لە مەحمود ئاغا دەكرد، چونكە خوا كوڕێكی دابوویە، لەبەرئەوەی باوكی مەحمود ئاغا، واتا هەمزاغای مەسرەف، سەرۆك وەزیران و لێپرسراوی كاروباری دارایی ئەحمەد پاشای دوامیری بابانییەكان بوو، لەبەرئەوە لەڕۆژی سیازدەیدا مەولودنامەیان خوێندو خواردن بۆ هەژاران نێردراو بەرگ بۆ منداڵانی بێباوك كڕدراو مەلاش بانگی بەگوێی ئەم ساوایەدا داو ناونرا، (تۆفیق) .

پیرەمێرد لەبارەی ژیانی منداڵی خۆیەوە لە ژیاننامەكەیدا دەڵێت: (كاتێ هاتمە ئەم كۆنە جیهانەوە، دەوری منداڵی لای هەموو ڕۆڵەیەك خۆشە، چونكە غەمی گوزەران نازانێت، بەو سەودایی منداڵییەوە خۆشم ڕابوارد) ، پیرەمێرد بەم نازو نیعمەتەوەو بە چاودێریی و خۆشەویستیەوە پەروەردەكرا، تا تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان، ئەوسا ئیتر بردیانە (حوجرەی)ی مەلا حسێنە گۆچە، هەتا خوێندنی تەواو كرد لەوێ مایەوە، ئینجا سمایلنامەو چەند كتێبێكی تری وردیلەی خوێند.

ڕۆژێك (تۆفیق)ی تەمەن هەشت نۆ ساڵان، لەگەڵ مامۆستاكەیدا لەسەر شیعرێكی (حافز)ی شیرازیی تێكدەچن، چونكە پیرەمێرد خۆی بەخاوەن ماف دەزانیێ، نایەوێت لەقسەی خۆی پاشگەز ببێتەوەو داوای لێبوردن لەمامۆستاكەی بكات، ناچار حەسەن ئەفەندی مامی لەو حوجرەیە گواستییەوەو بردی بۆ حوجرەی مەلا سەعیدی زلزڵەیی(٤)، كە ئەیباتە ئەوێ. حەسەن ئەفەندیی ئەڵێ: (تۆفیق ئومێد ئەكەم دەم و نەفەسی ئەم زاتە پاكە بتكا بەشاعیرێكی وەكو من) بەمەدا دەردەكەوێت كە حەسەن ئەفەندی مامیشی هەر شاعیر بووە، هەرچەندە بەداخەوە كە ئێمە هەتا ئێستا هیچ شیعرێكی ئەومان دەست نەكەوتوە. لەم حوجرەیەدا سەرەتایی بەهرەی شیعر وتنی تێدا دەركەوت، خوویدایە خوێندنەوەی ئەدەبیات و شیعرو سەرگوزشتەی ئەدیبان و شاعیران، لەسەر دابونەریتی كوردەواریی و بەپێی ئەوەی كە لەبنەماڵەیەكی عەشایەردا چاوی هەڵهێنابوو، ئارەزووی سوارچاكی و

تفەنگچێتی پەیداکرد، شۆرەتی سوارچاکیی پیرەمێرد بەناوبانگ بوو، وەك مامۆستا سەجادی دەیگێڕێتەوە، لەشاخی هەڕووتە، کە پیادە بەئاستەم پێیدا سەردەکەوێت، ئەم بەتاو لەسەردا ئەسپی هێناوەتە خوارەوە، بەسەر پردی قەشان و تەپادا بەغار پەڕیوەتەوە.

لەدوای ئەوەی کە ئیتر بەرەبەرە لەخوێندنەکەشی پێشکەوت، واپێویستبوو لەسەر فەقێیەتی دەوام بکات. لەسەرەتاوە لەمزگەوتەکەی باپیری کە ئێستاش ماوە (مزگەوتی هەمزاغا)، کە نزیك ماڵی خۆیان بووە و لەنزیك باخێك بووە پێیان وتووە باخی پوورەبەگی، کە لەگەڕەکی گۆیژەیەو چاپخانەکەی پیرەمێرد لەنزیك ئەو مزگەوتەیە، لای مەلا مەحموود دەرسی عەرەبی دەخوێنێت، لە خوێندنی عەرەبیدا دەچێتە پێشەوەو دەست ئەکا بەخوێندنی (سوتی)، بەدوای خوێندندا وەك هەر فەقێیەکی ئەو سەردەمە لەشارو و جێگەی خۆی دووردەکەوێتەوە، بەپێی ئەو عادەتەی، کە لەکام مزگەوتدا مامۆستای چاك بووبێ فەقێکان ڕوویان تێکردووە، وەکو چۆن مامۆستایانی ئێستا هەریەکەی لەبوارێکدا شارەزایی پەیدادەکەن و وانە دەڵێنەوە، مامۆستایانی ئەوساش هەر مەلایەی لەبوارێکی تایبەتدا شارەزایی پەیدا دەکرد، پیرەمێردیش هەروەکو حاجی قادری کۆیی و نالی و مەحوی و مەولەوی و زێوەر، مزگەوتداو مزگەوت و شاربەشار گەڕاوە و لە هەرشوێنێك ماوەیەك ماوەتەوە . دەگاتە مزگەوتەکانی شاری (بانە) لەکوردستانی ئێران و ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی .

بەڵام پێش ئەوەی تەواوی بکات، دەستی لەخوێندن هەڵگرت و ڕوویکردە ژیانی ڕۆژانەی ئەم دنیایە . لەو سەردەمەشدا هەرکەسێك خوێندنی مەلایەتی تەواو بکردایە و مەلایەتی بکردایە، ئەوە دەبوو بەمەلا، بەڵام گەر وازی لێبهێنایە پێیان دەوت (میرزا)، بەو پێیەی پیرەمێردیش وازی لەخوێندنەکەی هێنا، بوو بە میرزا.

لە ئەیلولی ساڵی ١٨٨٢ی زایینیدا، واتە لەتەمەنی (١٥)ساڵیدا، دەبێت بەکاتبی نفوسی سلێمانی، زۆری پێناچێت دەکرێت بەکاتبی (زەبت) لە دادگای سلێمانی، لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٨٣دا بووە بەفەرمانبەری زەوی و زار و موڵکی میری لە هەڵەبجە، نزیکەی سێ ساڵ لەوێ مایەوە، بە پێی نووسینەکانی پیرەمێرد بێت کە لە (ژیان) و (ژین) دا بڵاویکردوونەتەوە، وادەردەکەوێت کە ئەو سەردەمە عەشقی شیعر لەدەروونیدابووە، خولیای شیعر کۆکردنەوە کەوتۆتە سەری، تا ئەو دەمە هەر خەریکی لەبەرکردنی شیعری (نالی) بووە، بەڵام کە چۆتە ئەو ناوچەیە، شەیدای (مەولەوی) و (بێسارانی)یش بووە، بەهەموو دەشتی شارەزووردا گەڕاوە، کەشکۆڵی ڕەنگینی بۆخۆی پێکەوە ناوەو هەرچی

شیعرێکی دەسکەوتبێت یان بینیبێت یان بیستبێ، لە کەشکۆڵەکەیدا نووسیویەتیەوە. پاشان بوو بە سەرنووسەر (باشکاتب) لە دادگای چوارتا، لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٥دا گوازرایەوە بۆ (کەربەلا) بەوەزیفەی مودەعی یاریدەدەریی گشتی، بەڵام بڕیاریدا کە نەچێت بۆ ئەو وەزیفەیەو بەیەکجاریی دەست لە فەرمانبەریی دەوڵەت هەڵگرێت ، شێخ موستەفای نەقیب دڵخۆشی دایەوەو کردیی بە نووسەری تایبەتی خۆی بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکانی. ژیانێکی باش و لەباری بۆ خوڵقاندووە

## ژیانی لە تورکیا

لەبەرئەوەی (تۆفیق) لاوێکی زرنگ و زیرەك و بەڕەوشت بوو و خوێندەوارییەکەشی بەپێی ئەو سەردەمە باشبوو، لەتەك بنەماڵەی شێخانی سلێمانیدا پەیوەندییەکی پتەوی پەیداکرد، تاوایلێهات متمانەی زۆر شتیان پێکرد، خۆشیاندەویست، جێی بڕوایان بوو، بۆیە کاتێك لەساڵی ١٨٩٨ شێخ سەعیدی حەفید (باوکی شێخ مەحموودی نەمر) لەسەر بانگێشتی سوڵتان عبدولحەمید بانگکرا بۆ ئەستەمبوڵ، شێخ سەعیدو شێخ مستەفای نەقیب ڕوویان لە تۆفیقی مەحموود ئاغا نا کە لەگەڵیان بچێت بۆ تورکیا، ئەمیش بەپێی ئەو نزیکی و پەیوەندییەی لەگەڵیاندا هەیبوو، دەستی نەنا بەڕووی داواکەیانەوە، بەمجۆرە شێخ سەعید جگە لە شێخ مستەفای نەقیب، چەند کەسێکی هەڵبژارد لەگەڵیاندابن، یەکێکیان تۆفیقی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف بوو.

ئەودەمە تۆفیق خاوەن ژن و ماڵ بوو، بەڵام دیسان ماوەی ئەوەی نەدا کە ژن و منداڵ ببنە کۆسپ لەڕێگەی ئەم سەفەرەدا، ئەودەمە تۆفیق غەزالەخانی کچی عەبدوڵڵا فەندیی عەزیز ئاغای بابەکر ئاغای مەلا وەیسی هاوسەری بوو، دوو کچیشی لێی بوو بوو (ڕەحمە)و (ئامینە)، ئەودەمە تۆفیق ماڵئاوایی لە دۆست و هاوڕێیانی و لە (غەزالە)خانی خێزانی کرد، کە دەستی بەسەرو قژی کچە بچکۆلەکانیدا دەهێنا، هەرگیز بیری نەدەکردەوە، کە ئەم سەفەرەی ئەوەندە درێژخایەن دەبێ، موستەفا سائیب لە دەستنووسێکیدا دەڵێ: (تاریخی ڕۆشتنی خاڵم هەرگیز لەبیر ناچێت، چونکە لەکاتی سەفەریا لەسەر دیواری ماڵەوە نووسرابوو، ئیتر لەمنداڵییەوە هەر لەبیرم مابوو)

تۆفیق لەخزمەت شێخ سەعید و شێخ مستەفای نەقیب و شێخ مەحموودو دەستەو دایەرەیانا گەیشتە ئەستەمبوڵ، لەوێش بوونە میوانی بارەگای سوڵتان، لەپاش ساڵێك لەگەڵ شێخ سەعید و شێخ مستەفاو گەلێ ڕۆشنبیر و پیاوانی بەناوبانگی سەفەرەکەیاندا

حچن بۆ (حەج)، تۆفیق دەبێت بەحاجی تۆفیق، کاتێك لەحەج دەبن وەفایی شاعیر و سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوك، دەبنە هاوڕێی حاجی تۆفیق .

پیرەمێرد لەمبارەیەوە دەڵێت: (وەفایی کە لەپێشدا موفتی شیعرە جوانەکانی بووم، والرێکەوت لە ماڵی خوایشا هاوناڵەو ئەففانی بووم، لەپاش حەج لەرێگەی حیجازدا مردو سەید ئەحمەدی خانەقا لەسەری بەند بوو، تاناشتنی رەفیقی گریانی بووم). لەپاش ئەوە سەید ئەحمەد ڕووەو عیراق دێت و حاجی تۆفیقیش دەچێتەوە بۆ تورکیا .

بەمشێوەیە تۆفیقی مەحموود ئاغا، لەتەمەنی ٣٢ساڵیداو لە هەرەتی لاویدا، بوو بەحاجی تۆفیق. بەهۆی زیرەکی و هۆشیاریی خۆیەوە، حاجی تۆفیق زوو دەچووە دڵەوە، ئەمەیان لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە لەنووسین و داڕشتنی فارسیدا دەستێکی باڵای هەبوو، لەبەرئەوە عیزەت پاشای نووسەری دەرباری شەهریاری لەئەستەمبوڵ، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو نامەیەی کە ناسرەدینی شای ئێران بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی ناردبوو، داوا لە حاجی تۆفیق دەکات بەفارسیی وەڵامی سوڵتان بۆ شای ئێران بنووسێتەوە، وەڵامەکە هێندە جوان دەبێت سەرنجی کاربەدەستانی دەرباری سوڵتان ڕادەکێشێت، بۆ پاداشتی ئەمە، لە ١٤ئەیلولی ١٨٩٩ ئیرادەی سوڵتانی بۆ دەردەچێ. دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی باڵادا لە ئەستەمبوڵ، هەروەها پلەی بەگێتیشی دەدرێتێ، ئەمجا ئیتر بەناوی حاجی تۆفیق بەگی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەفەوە، لە دیوانی سوڵتانی ولەڕەسمیاتدا ناودەبرا .

هەر لەو ماوەیەدا بەهۆی عزەت پاشاوە لە ئەستەمبوڵ ، لە کۆلێجی یاسا (كلیه الحقوق) وەردەگیرێت و بڕوانامەی حقوق وەردەگرێت .

لەم ماوەیەشدا پیرەمێرد وەك پیاوێکی خاوەن رەوشت و داوێن پاك نایەوێت بەهیچ جۆرێك ناوی گەرد بگرێ، ویستی ژیانی رەبەنایەتی بەجێبێڵێت و ماڵۆچکەیەك بۆخۆی پێکەوە بنێ، لەئەنجامدا ئافرەتێکی لەبنەماڵەیەکی ناسراوی ئەردینەییە خواست کە ناوی سامییە خانم بوو، بوو بە هاوسەری ژیانی، لە ١٩٠٤/٤/١٧ دا حاجی تۆفیق و سامییە خانم کوڕێکیان بوو ناویان نا (نەژاد)، دوای سێ ساڵ ، لە ١٩٠٧/٥/١ کوڕێکی تریشیان بوو ناویی ویداد بوو .

لە تەموزی ١٩٠٥دا، بانگی مەشروتیەت دراو مەجالیسیان تێکچوو، هەر بۆیە حاجی تۆفیق هەتا ساڵی ١٩٠٨ لەئەستەمبوڵ بەکاری محامیەتی و گۆڤارو ڕۆژنامەوە خەریك بووە.

له ساڵی ۱۹۰۷ (کۆمەڵەی کورد) بە نهێنی پێکهات بەسەرۆکایەتی (شێخ عەبدوڵقادری کوڕی شێخ عەبدوڵڵای شەمزینی) کە پیرەمێرد یەکێکبووە لە دامەزرێنەکانی ئەم کۆمەڵەیە. پاشان لەساڵی ۱۹۰۸دا کە حیزبی (اتحات و ترقی) کەمالیستییەکان سوڵتان عبدولحەمیدیان لابرد، ئەو کۆمەڵەیە بەئاشکرا خۆی ناساندو پیرەمێردیش یەکێکبوو لە ئەندامەکانی .

پاشان لە ۱۹۰۹/۹/۵دا کە فەرمانی بۆ دەرچوو کرا بەقائیمقامی (جۆلەمێرگ) و پاشان لە ۱۹۱۲/٤/٤دا، کرا بە قائیمقامی (قەرەمورسلا).

پاش سێ ساڵ و لە ۱۹۱۵/۲/۱دا، کرا بە قائیمقامی (بالاوە)، ساڵ و نیوێکیش لەوێ مایەوەو لە ۱۹۱٦/۹/۲۸دا، کرا بە قائیمقامی (بیت الشابب) دوای پێنج مانگ و نیو لە ۱۹۱۷/۳/۱۸دا، بوو بە قائیمقامی (گومش کوی) .

لەهەمان ساڵدا و لەهەمان پلەدا چۆتە (ئوگە پازاری، هگبلی ئوگە)کە دوورگەیەکی خۆش و ناوداری تورکیایەو هاوینە هەوارە . وادەردەکەوێت کە پیرەمێرد ئەوێی زۆر پێخۆشبووەو گەلێ یادەوەری خۆشی لەگەڵا ئەم شوێنەدا هەیە، لە ژمارە ۹٦۷ی ۱۹٤۹/٦/۲ی رۆژنامەی (ژین)دا، لەگەشتنامەی ژیانیا دەیگێڕێتەوە: (لە (ئوگە) دراوسێی رەجائیزادە ئەکرەم بەگ و عوششاقیزادە خالید زیائو حسێن رەحمی بووم، رەزا تۆفیقیشیان پێناساندم، کەوتمە بەهەشتی سەروەتی فنونەوە، کە ئێواران لەئەستەمبوڵەوە بە پاپۆڕ گەڕامەوە بۆ لانەی سەعادەتی خۆم کە لەئەگە بوو، سەروەتی فنونم لە کۆگرتەی ئەو پاپۆری سەر دەریای مەرمەڕەدا ئەخوێندەوە، تەئسیری ئەو شیعرو ئەدەبیاتە لەسندیباتی بەحریی زیاتر ئەیخستمە دەریای خولیاوە، کە لەگرامافۆندا گوێم لە نەغمەی بەستەکەی خۆم ئەگرت کە بۆ (مهر النسا و)م وتبوو، رۆحم ئەچووەوە سەر تەختی سلێمانی، وامئەزانی فریشتەی ئاسمان و پەریی سەر کێوی قاف گوێ لەدەنگی شیعری من دەگرن. هەندێجار شەوی مانگەشەو کە ئەچوومە کەنار دەریاو تریفەی مانگ ئەیدا لەو ئاوەو جریوەی نازو غەمزەی ئەو کچە رۆمە دڵبەرانە ئەفسوونی ئەم ئەفسوونگەرانەم ئەبیست، لەهیچەوە ئەکەوتمە خولیای شیعرەوە، بولبول بۆیە بە دەوریا ئەسورێتەوە شیعری منی بەسەرا بخوێننەوە .

ئینجا لە ۱۹۱۸/٤/۱۷دا، کرا بە موتەسەڕیفی (ئەماسییە)، کە ئەمە دوا وەزیفەی بوو لە تورکیا ، لەوکاتەدا خزمەکانی لەسلێمانییەوە دەستدەکەن بەنامەنووسین بۆی، بەتایبەتی

موستەفا سائیبی خوشکەزای گەلێ نامەی بۆ ناردووەو داوای گەڕانەوەیان لێکردووە کە بێتەوە بۆ کوردستان .

پیرەمێرد ماوەی ٢٥ساڵ لە تورکیادا دەمێنێتەوە، دەشێ پرسیارێك بەرەو ڕوومان بکرێت کە ئاخۆ بۆچی حاجی تۆفیق ئەمەندە ساڵە لە غەریبی مایەوە، بۆچی دوای گەڕانەوەی شێخ سەعیدی حەفید لەگەڵیا نەهاتۆتەوە بۆ کوردستان و لەوێ مایەوە؟

لەوەڵامی ئەمجۆرە پرسیارانەدا وتراوە

١-ئەم ئەدیبە مەزنە لەبەرئەوەی لە قوتابخانەی ڕەسمیدا نەیخوێندووەو لە حوجرەو مزگەوتەکانیشدا وەك لەمەوبەر زانیمان لە (سویتی)دا وازیهێنابوو، لەبەرئەوە کە گەیشتە ئەو وڵاتە، بۆی دەرکەوت کە ئەم لەچاو ئەدیبی ئەوێدا نیوە خوێندەوارە، بۆیە پڕبەدڵ ئارەزووی لەوەبووە کە هەلێکی بۆ بڕەخسێ و بتوانێ بخوێنێ و ئاسۆی بیری فراوان بکات. ئەوەبوو ئاواتەکەی هێنایەدی، بەوەی توانی (حقوق) تەواو بکات و ببێتە پارێزەری ڕەسمی خاوەن بڕوانامەی باوەڕپێکراو، خۆی لەم ڕووەوە لە وەسێتنامەکەیدا دەڵێ: (بە نیوە خوێندەواری لەسلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە) هەروەها دان بەوەدا دەنێت کە زۆربەی ڕووناکبیرانمان سەرچاوەی ڕووناکبیرییان تورکیا بووە، کە وەك وتمان: ئەودەمە مەڵبەندی ڕووناکبیریی بووەو کەڵچەری ڕۆژئاوا یەکەمجار گەیشتۆتە ئەوێ، ئەمجا بەوڵاتانی تردا پەخشیداوەتەوە، حەوت ساڵ بەرلەوەی ئەم جیهانە بەجێبێڵێ وتویەتی: (ئێمە زۆرمان لەئێوەوە پێگەیشتووە.

ئەمانە سەلماندنی ئەوەن کە مەبەستی بووە ببێتە خوێندەوارێکی چاك و شارەزای هەمووجۆرە زانستێك بێ، دیارە ئەمانەش لەودەمەدا بۆکوردێکی وەك ئەو هەر لەوێ دەسگیر دەبوون.

٢-جگە لەخوێندن وەك شاعیرێکی هەست ناسك، ئارەزووی لە تێکەڵبوونی ڕووناکبیران بوو، جا کە لەئەستەمبوڵ جێگیر بوو، هەستی بەوەکرد شەپۆلی تازەگەری و نوێخوازی لەبەرهەمە ڕەنگینەکانی ئەدیبانی سەردەمی بوژانەوەدا ڕەنگی داوەتەوەو تازەترین ئەدەبی ئەورووپایی لەوێ دەکرێت بەتورکی و لەبەردەست خوێنەراندایە، هەتا ڕووناکبیرە عەرەبەکانیش ڕوویانکردە ئەوێ، بەگشتی سەرچاوەی خوێندنەوەیان لەوێوە پێدەگەیشت، جا کە حاجی تۆفیقی خۆمان ئەم ڕووناکبیری و بوژانەوەو ڕووناکبیرییەی هەستپێکرد، زۆر

پێی شادومان بوو، بەتایبەتی کە بووە گوڵی کۆڕو ئەنجومەنی ئەو ئەدیبە کوردیانەی کە لەوێ بوون، سەرەڕای ئەدیبە تورکەکانیش.

٣-پیرەکوردی ئەستەمببولێ، جگە لە هەوڵدانی بۆ خۆ ڕووناکبیرکردن و تەواوکردنی خوێندنی زانستگە، هۆیەکی گشتگیریش هەبوو کە وای لێبکات بمێنێتەوە، ئەویش ئەو سەرگەرمی و تێکۆشانەی بوو لەتەك هاوڕێیانی خەباتیا بۆ ڕزگارکردنی کوردستان.

لەم سێ خاڵەدا بۆمان دەردەکەوێ کە چ هۆیەکی گرنگ هەبوون بۆ مانەوەی (پیرەمێرد) لەتورکیا. ئەگینا هەموو کاتێك دڵی هەر بۆ خاك و نشتیمانەکەی لێیداوەو هەمیشە خەوی بەکوردستانەوە بینیوە .حاجی تۆفیقێك کە زۆربەی تاقی گەنجێتی و هەرزەکاری لەتورکیادا رابواردووە، لەوێ ژنێکی هەبوو، دوو منداڵی لێی هەبوو، پاش ئەم ماوە دووروودرێژە، ئاگری نیشتمانی دایك هەڵیگرت، سۆزی خۆشەویستی کوردستان و بەسەرهاتەکانی خستییە جموجۆڵ و سەر سەودای گەڕانەوە، وەکو چۆن نالی شاعیر هەڵبەستە بەرزەکەی لەشامەوە ناردبوو بۆ سالم لە شاری سلێمانی بۆ ئەوەی حاڵ و ئەحواڵی شاری سلێمانی لێبپرسێت و بۆی بنووسێت ئایا ماوەی گەڕانەوەی هەیە بۆ کوردستان یاخود ئەبێ تادواهەناسەی هەر ئاوارەو دەربەدەر بێت و لەوڵاتی بێگانەدا بژی، پیرەمێردیش بەوجۆرە دەستیکرد بەنامەنووسین و پرسیارکردن لە حاڵ و ئەحواڵی کوردستان، بەڵام ئەو ڕۆژانەی کە پیرەمێرد دەیویست بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو رۆژانەی نالی هەڵبەستە بەرزەکەی ناردبوو بۆ سالم، کاتی نالی و سالم ئەو کاتەبوو کە کوردستان لەژێر باڵی دەسەڵاتی ڕەشی عوسمانییەکاندا دەیناڵاند، بەڵام سەردەمی گەڕانەوەی پیرەمێرد، سەرەتای جوڵانەوەی هێزی نەتەوایەتی بوو، شێخ مەحموود ئاڵای شۆڕشگێری و داواکردنی ماڧی گەلەکەی هەڵکردبوو، پیرەمێرد لەپرسینی حاڵ و ئەحواڵی ئەو سەردەمەی کوردستان، ئەم چەند دێڕەی خوارەوەی بۆ یەکێك لەخزمەکانی لەشاری سلێمانی کە موستەڧا صائیبی خوشکەزایەتی، ناردووە، ئەڵێ ...

لەئەستەمبوڵەوە هەڵسام، لەخەودابووم هەتا ئێرە/ لەسەیری (ڧی المنام)دابووم کە چاوم کردەوە لێرە/ حەیاتێکی ترم دی، خزم و خوشێیان دەوریان دابووم/ لەسەر نوێ هاتمەوە دنیا بەروح وەك تولفی ساوابووم/ ئەمە دوو ڕۆژە جەژنی رۆحمە، دەنگی وەتەن دەبیەم/ خودا دیداری ئێوەشم نسیبکا زۆر ئەبینێ پێم/ هەواڵی ئێوە چۆنە؟ بێمەوە؟ یائێوە دێنەلام/ نسیب ئەزانێ، چەند ڕۆژێکی تر مەعلوم ئەبێ ئەنجام.

پیاوێکی ناودارو ناسراو لەناو کۆمەڵی ڕووناکبیرانا، خاوەنی پلەو پایەی باڵا، لەشوێنێکی خۆشی دڵگیری وەك (ئوگە پازاری)دا، لەناو کۆشك‌و تەلاری قەشەنگدا ژیان بەسەر ببات، کەچی بەجۆرێك مەیلی لای نیشتمانەکەی بێ، خەو بەشەوانی گوندی (گورگەدەر)ەوە ببینێ کە بەمنداڵی لەتەك خزم‌و کەسوکاریا بەهاوینان ئەچوونە ئەو گوندە بچوکەو بەئارەزوی دڵی خۆیان بەناو ڕەزوو باخەکاندا تەراتێنیان کردووەو شەوان منداڵان چاوشارکێ و هەڵبەزو دابەزیان کردووە، ئەوەتا خۆی لە ژمارە ٨٩٤ی ڕۆژنامەی (ژین)ی بەرواری ١٩٤٧/١١/٢١دا وتویەتی: (لەئەستەمببولا بەڕوتبەو نیشان و ئەعزاییەتی مەجلیسی عالیەوە لە (ئوگە) کە مەڵبەندی پرنسینسەکانی کۆنی ڕۆم بوو، لەقەسرێکی مومتازدا، دائەنیشتم. کە شەو ئەنوستم، لەخەوما لە (گورگەدەر) لەباخەکەی شێخ ئەحمەدی بازلیخا هەنارم ئەدزی) .

یەکێك لەو هۆنراوانەیی پیرەمێرد، ئەوەی هەموو ساڵێك لەگەڵ ئاوازێکی بەسۆز ڕەشایی و سەرماوسۆڵەی زستانمان بۆ لادەبات و مزگێنی بەهار و ساڵێکی نوێمان پێدەبەخشێت شیعری "نەورۆزە . پیرەمێرد خۆی بووە بە هۆی ئەوەی خەڵکی یادی نەرۆز بکەنەوە و ئاگر لەسەر گردی مامە یارە لە شاری سلێمانی بکرێتەوە و ئاهەنگ بگێڕن ، بۆیە دەڵێ :

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هـــاتـــــەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتـــەوە

چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ‌پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهـــــار

ئەو ڕەنگە سوورەبوو کە لە ئاسۆی بڵندی کـــورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیك ئــــەبــرد

نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگـــــەوە
لاوان بە عشق ئەچوون بە بەرەوپیری مەرگـــەوە

ئەوا ڕۆژهەلات، لە بەندەنی بەرزی وڵاتـــــەوە
خوێنی شەهیدە ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتـــەوە

تا ئێستە رووی نەداوە لە تاریخی میللەتـــــا

قەڵغانی گوڵـلە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتـــــا

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گریـــن
نامرن ئەوانە وا لەدڵی میللەتا ئـــەژیـــــن

ئەم هۆنراوەیەی پیرەمێرد ئاگرێکی لە دڵی لاواندا دروست کرد ، لاوانی کوردی لە خەو هەستاند  بە شێوەیەك هەموو بۆ کردنەوەی یادی نەورۆز کەوتنە هەوڵ و تێکۆشان بۆ زیندوو کردنەوەی یادی نەتەوایەتی کەوتنە خەبات .

پیرەمێرد بە یەکێ لە هۆنەران و نوسەران و زانایانی نەتەوەی کورد دادەنرێت ، ئەو لە ماوەی تەمەنیدا گەلێك راژە و خزمەتی بە زوبان و وێژە و کەلەپووری نەتەوایەتی کردووە ،بۆ یەکەمین جار قوتابخانەی زانستی لە سلێمانی کردووەتەوە .

هۆنراوەکانی پیرەمێرد زۆر ڕەوان و جوان و پاراو شیرین بون ، هەر لە خۆیەوە هۆنراوەیشی نەهۆنیەوتەوە بەڵکو هەرکاتێك کە هۆیەك هاتووەتە پێشەوە هۆنراوەی هۆنیوەتەوە ، دیارە ئاو و هەواو و سروشتی جوانی کوردستان کاریان کردووەتە سەر پیرەمێرد کە سروشتی کوردستان پڕ بووە لە کێ و چیا و باڵندەی دەنگ خۆش و باخ و گوڵزار و تاڤگەی ئاو و دەیان جوانی تر بۆیە بەبالای جوانیدا دەڵێ :

ئاوە جوانەکەی سەرچاوەکەی زەڵـــم
بۆ کەلاڕێزانی سەر بە تەم و هــــەڵم

ئەڵێی سەرچاوەی بەختی کوردانـــــی
سەروەتت نیە وێڵی هـــەردانـــــــی

تاڤگەکەت سەربەرز ، سارد، وەك تەرزە
دانەی مرواری ، لەنجەی سەد تـــەرزە

لەو ئاسمانەوە ئەرژێتە خــــــواری
لە چاوی گەردوون فرمێسك ئەبـــاری

وێنەی عاشقی کە نالەکار بـــــــێ

سەحرا نە وەرد بیّ بەبیجوری یار بـیّ ......... تا کۆتایی ...

پیرەمێرد لەم پارچە هۆنراوەدا ڕچەی هۆنەرانی پێشووی شکاندووە و بە چەشنێکی نویّ ە سروشت دواوە و شۆڕشێکی لە ڕێژەی کوردیدا بەدی هێناوە و لەم هۆنراوانەدا باسی سەرچاوەی زەڵمی کردووە کە چۆن گەڵای دارەکان دەرژێتە کەناری ئەو ڕووبارە و تەم و مەڵم ڕووبارەکە دادەگریّ و وەکو بەختی کوردان ئاوەکەی لیّڵ دەبیّ و ئەوسا ئاوەکەی ڕەوان دەبیّ و دەرژێتە ناو چەمی تانجەڕۆ.

پیرەمێرد لە پارچە پەندێکدا بە هۆنراوەیی باسی نەرم و نیانی و سەخاوەت و پیاوەتی دەکات و تا دەکرێت دوور بکەویتەوە لە کاری دوندوتیژی و نالەباری...:

وەك خاك بە کە دنکیّ جۆیان تێچەندی بیانـــدەرەوە بە دە ئـــەوەنــــدی

وەك ئاگر مەبە هەرچیت هاتە پێـــش وای بســوتێنی بێتە خــوڵە مێـــش

پیرەمێرد لە پارچەهەڵبەستێکیدا باسی نالەباری و شپرزەیی کۆمەڵ دەکا و دەکەوێتە دەردە دڵ و دەڵیّ ...:

ئەستێرە بەرزەکان ئـــەدرەوشـــێنەوە بە شـــەو
وەکو من بە داخەوەن نە سرەوتیان هەی نە خــەو
چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یـــەکتریـــن
وەك سەرسەرین شەویّ سەریّ ناکەینە سەر سەریـن
من خوار و ژوور لە دەست چووەکەی بێوڵەت ئەوان
وەك خێڵی خوار و ژوور کەری کور وێڵی ئاسمـان
شەو شەونمی ئەوانە چیمەن ئاو ئەدەخـــواتـــەوە
ڕۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەحەر بەخـاتــەوە
دوێشەو بەری بەیان بوو دەگریان بەسەر مـنـــا
منیان کەساس ئەبینی لە ناو دۆست و دوژمنـــا
دڵسۆزی وام نەدیوو کە بۆم بگــری وەك خەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو بە ئاونگــــی تێکەیم
بام ڕاسپارد کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئــــەوان
وەك ئێمە نین نزیکتری لای بارەگای خـــوان
ڕاسپێریان نوسی بوو بە شەونم لەسەر گیـــا

تا ئاسمان پریشکی لەدی ئێوە هـــەڵـــبژا

هاواری کوردەکانی سەروو گەیە ئاسمـــــــان

بەو دووکەڵی هەناسەیە ئاو دێ لە چاومــــــان

واتە : ئەو ئەستێرانەی کە لە ئاسماندا دەدرەوشێنەوە وەکو من بەداخەوەن و خەو و ئارامیان نییە ، چەند ساڵە کە ئێمە و ئەوان ئاگامان لە خەوتن و شەونخوونی یەك هەیە هیچ شەوێك نەبووە کە سەرێك لە سەر سەرین دابنێین و بحەسێینەوە ، من ئیتر ئیلاخ و قشلاخم بۆ نەماوەتەوە و ئەو خێڵەش کە هەر خەریکی هاتوچۆن ئەوانیش وێڵ و دەربەردەن ، دوێنێ شەو هەڵم و تەم لە بەرەبەیانا گریان بەسەر منا چونکی منیان بە زەبوونی چاو پێکەوت بوو کەچی هاواری کوردەکانی باکوریش گەیشتە ئاسمان و ئەوە دووکەڵی هەناسەی ئەوانە کە دەبێتە هۆی ئەوە ئێمە ئاو بە چاومانا بێت .

پیرەمێرد گەلێك خۆشەویستی خۆی دەربڕیوە بۆ نیشتیمانەکەی و چەندین هۆنراوەی بە خۆشەویستی نیشتیماندا وتوە وەك دەڵێ :

خۆشم دەوێ وڵاتەکەم

خۆشم دەوێ وڵاتەکـەم ... کانگای هیواو ئاواتەکــــەم

خۆشم ئەوێ خۆشم ئەوێ ... ئەم نیشتیمانەم خۆش ئـەوێ

تا لێدانی دڵ ئەیـرەوێ ... قەد لەبەر چاوم ناکــــەوێ

ئاوەم هەواو ئاو و گــڵە ... بۆ ژیانم خوێنی گـــڵـــە

دڵ کە بولبولی سەرچڵە ... شەیدایە بۆ رووی ئەو گـــوڵە

خۆشم دەوێ وڵاتەکـەم ... کانگای هیواو ئاواتەکـــەم

کوردستانە خۆشەویستـم ... هەتا ماوم ئەیپەرستــــــم

بە جوانی دیمەنی مەستم .. هاوار ئەکا هۆش و هەســتم

خۆشم دەوێ وڵاتەکـــەم ... کانگای هیواو ئاواتەکـــەم

دڵم ئەڵێ وەك زمانـــم ... خۆشم ئەوێ نیشتیمـــــانم

خۆشەویستی نیشتیمانـــم ... بووەتە سەر لەوحەی ژیانـــم

خۆشم دەوێ وڵاتەکـــەم ... کانگای هیواو ئاواتەکـــــەم

خۆشم ئەویٚ خۆشم ئەویٚ ... ئاواتەخوازم سەرکـــەویٚ

ناوی لە ناوا دەرکـەویٚ ... گەشە و رووناکی بەرکـــەویٚ

خۆشم دەویٚ ولاتەکـەم ... کانگای هیواو ئاواتەکـــەم

سروشتی کوردستان وای کردبوو لە پیرەمێرد کە بەردەوان بە جوانییەکەیدا هۆنراوە بهۆنێتەوە دیان بۆ جوانی بەهار دەڵێت :

کە دەڵێن ئەمڕۆ دەشت و دەر شینە

چەندە مەڵبەندی ئێمە شـیرینـــە

بچۆرە سەر گردی یـــارە ببینــــە

لە جیهاندا گوڵێکی ڕەنـــگینـــە

زەمزەمەی بولبولی بەهارانــــــە

ووردە بارانی ژێر دەوارانـــــــی

لە شەوی بەزمی سەرچنارانـــــی

وشکە سۆفی ئەخاتە گۆرانــــــی

ئەو دەمەی ڕۆژ دەگاتە ئێـــــوارە

رووبکەرە شاخی گوێژە بنـــوارە

عەرشی پەروەردگاری لیٚ دیـــارە

دامەنی وەك بەهەشتی ئـــــاوداره

یەکیٚ لە کارە گرنگەکانی پیرەمێرد کۆکردنەوەی پەندی پێشینانە کە پەندەکانی دەکردە هۆنراوە و لە رۆژنامەی ژیان و ژیندا بڵاوی دەرکردنەوە ، ژمارەی ئەو پەندانەی کە لە رۆژنامەکەیدا بڵاوی کردووەتەوە و بەچاپی گەیاندووە گەشتووەتە ٦٤١٠ پەند .

پیرەمێرد دەستێکی باڵای هەبوو لە کردنی پەندەکاندا بە شیعری و زۆر بە جوانی دارِشتوونەتەوە بۆ هۆنراوەیی ، لەبەر ئەوە چەند کۆپلە پەندێکی هۆنراوەیی دەنوسین ....

گوییٚ ڕاستت سووك بیٚ بۆ چاکە بیستـــن گوییٚ چەپت کەڕ بیٚ لە فیت هەڵبەستـــن

قسەی چاك دەگمەن دەگاتە جێی خـۆی ..... واتەی بەد زۆر کەس پۆستەچییە بــــۆی

شوێن بۆ سەر پیشەی خۆی دەچێتـــەوە..... گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتـــــەوە

ڕووبەڕوو دەبی لەگەڵ ژینی تـــــاڵ..... چونکی بەخەیاڵ کەس نەبووە بە مـــاڵ

پشیلـه دەمی بۆ دووگ نـــەدەچـــوو..... دەیگوت پێم ناخورێ، چەند سوێرە پەککو

چەند خۆشە لە پاش تاڵی شیرینــــــی..... لەشوێنی ترسی شەو مژدەی ئەمینـــــی

چاك زوو لە بیر خە ڵك ئە چیتـــــە وە..... قینی خراپە هــــە ر نابرێتــــە وە

تۆ قینە بە ری خە ڵقت گرتــــــە دڵ..... ئە و قینە بۆ جە رگ ئە بێ بــــە جقڵ

هە میشە دڵت خە فە تبار ئەبـــــێ..... خواردنت لە لا زەهری مار ئەبـــێ

وا چاکە کە قـین لـــــە دڵ دەراوی..... ئە و سایە خۆیشت ئـــــەزانی پیاوی

بە دڵێکی خۆش ئە نوویت و ئە خــۆی..... شەو بە دەردەوە نا ناڵێنی بـــــۆی

ئە گە ر پادشای جەواهر پۆش بـــی ..... هە موو ی بە فیدای دڵێکی خۆش بـی

دڵخوشی بەراست هە ر بە خودایـــــە ..... خوا نە یدا نابێ رە نجی بە بایــــــە

زور لە گەل حوکمی چارەنووس ناکرێ..... بە بێ خواستی خوا هیچ سە ر ناگـــرێ

لە دووی سیاسە ت خۆت مە خە رە بە ند..... رێوی قق واڵە ی پێبوو پێستیان کە نــد

کاری نارەوا تاســـــەر نـــــامینــــێ ..... خوا هەقی بزنی بی شاخ ئەسێنــــێ

کەتۆ بەخشیت وجنێویـــــان پێـــدای ..... ئینجا بزانە کە مەردی خــــــودای

کە تۆ خۆت شل کرد بۆ ناکەســــــێ ..... ئەڵێ بروانە چۆن لێم ئەترســـــــێ

کەتۆڵەی خەڵکت بە سەرەوە بێــــــت .....ئەبێت قەڵغانت لــــــە بەرەوە بێـت

کەدەست لەدەست بێ قوەت لەخوایـــە ..... هیچ شوبهەت نەبێ ئەمە کـــــەوایـــە

کە وتیان دونیا ماستی مـــــەیـــــوە ..... ئەوسابزانە کەس تێ نەگــــەیـــوە

کەسی هیوادار نائومێد مـــــەکــــــە ..... خێرت ئەنوسێ بەقەد رێێ مەککــــــە

کەچاکە ئەکەیت مەیڵێ لەلای کـــــەس ..... بۆزموقی خۆت بێ وخوابزانێ وبــەس

کەم بخۆو لەشت بێ عیلەت ئەبـــــــێ ..... کەم بڵێی سەرت سەلامەت ئەبــــــێ

کەمی خۆت مەدە بە زۆری خەڵکـــــی ..... کەچاوت لەدەست بێت دیارە بێ کەڵکی

لەجێیەك بنوو ئاو هات تەڕ نەبـــــــی ..... سەودایە بکە توشی شەڕ نەبــــــی

مارو دوپشکی دنیا بە زەبـــــــــرن ..... بۆپیاوی زۆردار هاودەمی قەبـــــرن

هەمیشە عاقڵ وعیلم لـــــەپێشــــــە ..... لەهەموو شاری نەزان بــــارکێشــــە

هیچ کەس لەبڕێ نەبوە بەکـــــــورێ ..... تادەبی بە پیاو سەد کفن ئـــــەدڕێ

گەورە یەکبگرن میللەت سەرئەخـــــەن ..... ئەڵێن دوو رێوی شێرێ کوڵ ئەکـــــەن

بە هیوای هاوسێ بی بێ چێشت ئەمێنـی ..... چاوەڕێ دەست بیت هەر خەو ئەبینـــــی

خۆزگە بۆ چاکە هەموو یەك ئەبوویـــن ..... بە هیچ قوەتێك قەد دانەئەکەوتیــــن

کـەس واتــــای چاکـە ناگێڕێتـــــەوە ..... غەیبەتیش لای کەس ناشارێتــــــەوە
دەوڵەمەند ئەمرێت بە ڕێز و پۆشتــــــە ..... ئەوەی شین دەکات بۆ چێشتو گۆشتــە
هەقیرێك ئەمرێت کەس پێی نازانـــــێ ..... پاش مانگێك ئەڵێن فلان کەس کوانــێ
کەسێك دڵسۆز بێت بۆ هەموو کەســـــێ ..... دەرگایشی نەبێت لە دز ناترســــــێ
بەخیل خۆی نایخوات هەولێشـــــی زۆرە ..... ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمـــەخـــۆرە
زۆر دار و هەزار وەك سەرماو هەتیـــــو ..... بزن هەولی گیا و قەساب هەولی پێـــو
چاو مەبڕە دەست ، خراو فێر ئەبـــــی ..... بە پارووی خەڵکی دەرەنگ تێر ئەبـــی
بۆ ئیشی بچوك قەد تێمەکـــــۆشــە ..... کۆم هەتا قوڵ بــــێ بۆ مەلە خۆشە
ئەگەر قسەی حەق لە من دەپرســــــی ..... تێر ئاگـــــای نیە هــەرگیز لە برسی
بەو کەســــــە دەڵێن عاقڵ و وشیــــار ..... دوو جـــار لە جێەك پێوەی نەدا مار
ئاوری بن کایە ، بۆســــــۆی لێنایـــە..... دزی خـــۆمــاڵی لـــە گرتن نـایـە
ئەگەر بکەویە بەر هەڵمەتی شێـــــــر ..... قەت پەنا نـەبەی بۆ ڕێـــوی بێخێـــر
وەختێك دەزانی مانای حەوســـــــەڵە ..... بە کەوچـــــك ئـــاوی ئەکەویە مەلـە
میوان نایەوێ سفرەت ڕەنگیـــــن بـــێ ..... نانت جۆبین بێ و خوڵقت گەنمین بـــ
بۆ ئـــەم نەزیلـــەش گـــوێ ڕابـدێرە ..... چێشتی پڕ کابان ، بێخوێ یـــا ســـو
گەیێ نەگبەتی بێتە ســــــەر شـــانی ..... پەلوولە بخـــوات ، دەشکـێ ددانی
حەزدەکەی دووربی لەگێرە وکێشــــــە ..... بە قەد بەرەی خـــۆت پێ ڕابکێشە
ئیش بە بێ زەحمەت مەحاڵە بوونـــــی ..... پیاو ماسی بگرێ تەڕ دەبێ قوولـــی
ئـــاوت خواردەوە جـــارێك لە کانی ..... بەردی تێ مەخە خۆ تۆ ئینســـــانــی
پیاو بە خزم ودۆست دەبێ کۆڵـــــەوار ..... ناقەڵشێ هــــۆرە لـــە خۆی نەبـێ دا
لە گــــەڵ ئەم بیر و بـاوڕە چــۆنی ؟ ..... دەڵێن چێشتی خـــۆش دیارە بە بۆنـــ
دار وشـك دەبێ بـــــە ئـاواتی بـاز ..... جـــارێك لە ســـەری بخـــوێنی ئاواز
بیســـــــتومە پـــارو لـە زار بکـــەوێ ..... بۆ کۆش چاکترە ، نەك ئێرە و ئـــەوێ
بچۆرە جێەك هیچ کەس نەتناســـــێ ..... خۆت هەڵبکێشـــــە پڕ بـــە کـــراسـێ
لە قــــــەدیمەوە ئـــــەم قسە قـاوە ..... کوێر هەتا دەمرێ بە تەمـــــای چـــاوە
ئەمـــــەش فەرموودەی قەدیمەکانــە ..... بەرد لە جێگای خۆی قورس و گـــرانە
لە شـار و لادێ ئـــەم نەقڵە بــــاوە ..... گیای شین بە جێگای سەختەوە مـاوە
دووڕوو هەروایە پیشە و ڕەفــتـــاری ..... هەم لـە ناڵ ئـــەدات هەم لە بزمـاری

قەدیمی دەڵێن بۆ دەستەوەستان ..... هیچ فەرقی نیە گەرمین و کوێستان

ڕەنگە دەرنەچی لە ئیمتیحانم..... ئەگەر عەیبی تۆ تەواو بزانم

عەیبەکانی خۆت بێتە بەرچاوی..... ڕەوا نابینێ بە کەس بەدناوی

مەشهورە دەڵێن خزم بە ددان..... گۆشتیش بخوا ناشکێنێ ئێسقان

هەر خوویەك مرۆڤ گرتی بە شیری..... بۆی تەرك نابێ زەمانی پیری

براگیان هێشتا ئەسپ نەکڕاوە..... ئاخوڕ هەڵبەستن خەیاڵی خاوە

گۆشت خۆرن هەموو دەعبای ئەم ناوە ..... کەچی هەر ناوی گورگ بەد ناوە

قەد لە شوێن چووان نەچیموە چاکە..... بەس لەیرە و لەوێ کای کۆن بە باکە !

ئاو بتبا مەچۆ سەر پردی نامەرد ..... چش با بخنکێی بە سەد ئێش و دەرد

پەسەنتر بووە چ ئێستا چ زوو..... ڕێوی گەڕیدە لە شێری نووستوو

شوان دەڵێن شوانیی بێ ئیفتیخارە..... نانچنینەوەی لا عەیب و عارە

وەك فەرمووبانە پیاوانی حاڵی ..... قوت بۆ گا نابێ گوێلکی خۆماڵی

پەندێکی تریش هەیە لەم بارە ..... دەڵێن گای جووتی ، بە گوێلکی دیارە

مریشك بۆ خۆی وەسەر نەکا خۆڵ ..... ناکرێ بەسەریابە شان و قۆڵ

سەرباری خەڵکە تەنبەڵی و بێخێر..... دەستی ماندووە لەسەر زگی تێر

ئەو ڕۆژە هەر دێ سەرکەوی لە کەل ..... بەو مەرجە بە جێ نەمێنی لە گەڵ

وا مەشهورە شوان هەتا بخەوێ ..... مەڕەکەی زیاتر لێ دوور ئەکەوێ

نانی ڕۆژ پەیدا بکە و نانی ڕۆژ..... هەڵمەگرە هەرگیز منەت لەم و لەو

شوێن بۆ سەر پیشەی خۆی دەچێتەوە..... گیا لە سەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە

ڕووبەڕوو دەبی لە گەڵ ژینی تاڵ ..... چونکە بە خەیاڵ کەس نەبووە بە ماڵ

پیرەمێرد لە گەڵ ئەوەی بۆ ماوەی نزیکەی بیست و شەش ساڵ خەریکی ڕۆژنامەوانی بووە و گەلێ وتاری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئاینی و ویژەیی لە ڕۆژنامەکەیدا چاپ کردووە ، هەندێك پەرتوکیشی داناوە کە هەندێکیان بریتین لە ( مەم و زین ، دوانزە سوارەی مەریوان ، گاڵتە و گەپ ، کەمانچە ژەن ) .

## مەولەوی

## باشوری کوردستان

( ١٨٠٦ – ١٨٨٢ ز )

ناوی (سەید عەبدولرەحیم)ی کوڕی (مەلا سەعید)ە و لە نەوەی مەلا یوسف جانی کوڕی مەلا ئەبوبەکر موصنەفی چورییە ، کە دەگەڕێتەوە سەر خواناسی بەناوبانگ سەید محەمەد سەید زاهید، کە بە پیر خدری شاهۆ ناوبانگی دەرکردبوو. لە وەچەی حەزرەتی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالبە . نازناوی شیعریشی مەعدوومی بووە و لەناو خەڵك و لە کۆڕی ئەدیباندا بە مەولەوی ناوبانگی دەرکردبووە.

مەولەوی لەساڵی ١٨٠٦دا لە دێی سەرشاتە لە ناوچەی تاوگۆزی، لە بەشی باکووری کوردستان لە خێزانێکی ئاینپەروەر لەدایك بووە و هەر لە سەردەمی منداڵیدا ماڵی باوکی هاتووە بۆ دێی بیژاوە لە نزیك هەڵەبجە. لەوێ لای باوکی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە و وردەکتێبە سەرەتاییەکانی فارسی و صرف و نحوی خوێندووە. پاشان لەسەر نوسوولی فەقێکانی کوردستان لە پاوە لە ناوچەی هەورامانی لهون چووە بۆ خوێندن و پاش ماوەیەك لەوێوە چووە بۆ چور لە مەریوان و لەوێیشەوە بۆ سنە و لە مزگەوتی وەزیر دامەزراوە.

ئینجا چووە بۆ بانە و لەوێیشەوە چووە بۆ سلێمانی و لە مزگەوتی گەورە دامەزراوە ، کە لەو کاتەدا هێشتا جەنابی شێخ مەعرووفی نۆدێ تێیدا مامۆستا بووە . ئینجا چووە بۆ هەڵەبجە و لە مزگەوتی جامیعە لای مەلا سادقی تەوێڵەیی، کە موستەعید بووە لە خزمەتی شێخ عبداللە خەرپانیدا، خوێندوویەتی. ئینجا چووە بۆ قەڵای جوانرۆ و لە خزمەتی مەلا موحەممەدی قازیدا خوێندوویە . لەوێیشەوە بۆ جاری دووەم لە سەردەمی ڕەزاقولیخانی والیدا چۆتەوە بۆ سنە و لە مزگەوتی دارالإحسان دامەزراوە .

ماوەیەکی زیاتر لە جاری پێشوو لەوێ ماوەتەوە، ئینجا دیسانەوە هاتووەتەوە بۆ سلێمانی و لە خزمەتی مەلا عەبدولڕحمانی نوتشەییدا کە موفتیی سلێمانی و مامۆستای مزگەوتی مەڵکەندی بووە ، خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی دەرسوتنەوەی وەرگرتووە.

بڵاوە ، کە مەولەوی لە زەمانی ڕەزاقولی خانی والیدا لە مزگەوتی دارالإحسانی سنە لە خزمەتی حاجی مەلا ئەحمەدی نوتشەییدا ئیجازەی وەرگرتووە، ڕاست نییە. چونکە حاجی مەلا ئەحمەد هەتاوەکوو پاش زەمانی فەرهاد میرزا، کە پاش غولام شاخان و ڕەزا قولیخانی برای بووە بە حوکمرانی ئەردەڵان و پاش سەفەری حەجی لەگەڵ شێخ بهاالدین لەپاش ساڵی

١٨٧٣ بوو، ڕۆیشتووه بۆ سنه و لەو کاتەدا مەولەوی تەمەنی لە ٦٠ ساڵ کەمتر نەبووە. بەڵکو پاش ئەوە تەنها

چەند ساڵێك ژیاوە. کەواتە چۆن دەگونجێت لە تەمەنی وەهادا ئیجازە وەربگرێت؟!

هەروەها لە ساڵی ١٨٥٥دا شێخ سراج الدین مەولەوی لەگەڵ حاجی شێخ عبدالرحمانی کوڕی دەنێرێت بۆ سنه بۆ کێشەی ناکۆکیی نێوان غولام شاخان و مەلاکانی سنه. دیاره دەبێت مەولەوی لەوکاتەدا مەلایەکی پایەبڵند بووبێت، ئەگینا بۆ ئیشی وەها نەدەنێررا. جگە لەوەش ڕێی تێ ناچێت مەولەوی ئیجازەی لای حاجی مەلا ئەحمەد وەرگرتبێت، چونکە هەشت ساڵ لەو گەورەتر بووە. وەك لەم شیعرە فارسییەوە دەردەکەوێت کە مێژووی لەدایکبوونی حاجی مەلا ئەحمەدە بە حروف ابجد:

هاتفی أز سر الهام بتاریخش گفت

بود أحمد خلف أمجد عبد الرحمن

کە ئەمەش دەکاتە ١٨١٤. بەڵگەیەکی تریش هەیە بۆ سەلماندنی ئەوە ، کە مەولەوی لە سلێمانی ئیجازەی وەرگرتووە، ئەوەش ئەو چیرۆکەیە ، کە پاشان هەر لەم کورتەمێژووەی ژیانیدا دەیگێڕینەوە لەبارەی چوونیەوە بۆ سەیران بۆ سەرچنار لەگەڵ هەندێ لە میرەکانی بابان پاش تەواوبوونی ئاهەنگی ئیجازەوەرگرتنی.

مەولەوی لە سەرەتای مەلایەتیدا لە دێی چروستانە لە نزیکی هەڵەبجە دامەزراوە فەقێی ڕاگرتووە و دەستی کردووە بە دەرسوتنەوە. پاش ماوەیەك هەوای تصوف دەکەوێتە کەللەی و گرفتاری زەوقی ئەهلی مەعنا دەبێت و دەروات بۆ تەوێڵە بۆ خزمەتی شێخ عثمان سراج الدینی خەلیفەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، کە یەکەم کەس بووە ئەو تەریقەتەی لە کوردستاندا بڵاو کردۆتەوە. مەولەوی لە تەوێڵە دەبێت بە موریدی شێخی سراج الدین و کاتێکی زۆر بە سلووکەوە دەباتە سەر. پاش چەند ساڵێك دەگوێزێتەوە بۆ بیاوێڵە، کە دێیەکە لە ژووری هەڵەبجەوە.

پاش ماوەیەکی تریش لەوێوە بار دەکات بۆ گونە، کە یەکێکە لە دێیەکانی هۆزی تەورولّی. پاش چەند ساڵێك ئەوێش بەجێدەهێڵێت و دەچێت بۆ شەمێران، کە ئەو کاتە لەژێر ئیدارەی شێخ علی عەبابەیلێدا بووە. شێخی ناوبراو زۆر خزمەتی مەولەوی و دەستوپێوەندەکانی دەکات، بەڵام پاش ماوەیەك بە کاریگەریی موحەممەد پاشای جاف بەڕێوەبردنی شەمێران لە دەستی ئەو شێخ علییە دەسەنرێتەوە و دەدرێتە دەستی ئوسمانی خاڵە، کە لە

پیاوماقوولانی هۆزی یەزدانبەخشی بووە. لە ئەنجامی ئەم لابردن و دانانەدا مەولەوی ماڵی لە شەمێران بار دەکات و دەڕواتەوە بۆ سەرشانە، کە تێیدا لەدایك بووە و لەوێ دەمێنێتەوە تا کۆچی دوایی دەکات.

مەولەوی لە دواساڵەکانی ژیانیدا تووشی گەلێك ڕووداوی ناخۆش بووە. ئەو ڕوداوانەی لە چەند پارچە شیعردا بە سۆزەوە هۆنیوەتەوە. کتێبخانەکەی سووتاوە. عەنبەر خاتوونی خێزانی مردووە ، کە جێگایەکی تایبەتی لە دڵی مەولەویدا هەبووە. حەوت ساڵ پێش کۆچی دوایی کوێر بووە. هەر ئەم کوێربوونەشی بووە بە هۆی مردنی . ئەوە بووە جارێکیان بۆ سەرخۆشیکردن لە دۆستێکی دەڕوات بۆ پریس، کە لە گەڕانەوە دا نزیکی هانە سوورە دەبێتەوە بە جڵەوڕاکێشی ولاخەکەی دەڵێت: من چاوم نابینێت، دارتوویەك لەسەر ڕێگەمانە لقێکی لاری هەیە ڕێگەکەی گرتووە، کە گەیشتینە لای پێم بڵێ، با سەرم دانەوێنمەوە. وەها ڕێ دەکەوێت، کە دەگەنە ئەو شوێنە کابرای جڵەوڕاکێشی ولاخەکەی لەبیری دەچێتەوە، کە مەولەوی ئاگادار بکاتەوە. مەولەوی سنگی دەدات بە دارەکەدا و بە پشتدا دەکەوێتە خوارەوە لەسەر ولاخەکە و پشتی دەشکێت و لە ئەنجامی ئەوەدا لە ١٨٨٣دا ماڵئاواییی یەکجاری دەکات و لە گۆڕستانی ئەسحابە لە نزیکی سەرشاتە بەخاکی دەسپێرن.

مەولەوی پایەیەکی بڵندی هەیە لەناو زاناکانی کورددا و بەتایبەتی لە قسەزانەکاندا دەستێکی باڵای هەبووە. ئەو دانراوانەی، کە لە پاشی ماونەتەوە ، بریتین لەمانەی خوارەوە:

-الفضیلة ٢٠٣١ شیعری عەرەبییە و لە ١٨٦٨دا دایناوە و عەنتیکەیەکی هونەرییە و جگە لەمەش، کە واتا زانستییەکەی زۆر ورد و بەرزە. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

بسم الله الرحمن الرحیم

من تاه فیه نهیه الحکیم

-العقیدة المرضیة ٢٤٥٤ شیعری کوردییە و لە ١٩٣٣ لەلایەن محی‌الدین صبری النعیمییەوە لە میسر لەچاپ دراوە. وە مامۆستا مەلا عبدالکریم مودەریس لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی بۆ کردووە و فاتح عبدالکریم پێیداچووەتەوە و لەچاپدراوە لە ساڵی ١٩٨٨ ، وە لە ساڵی ٢٠١١ دا بە چاپێکی نوێ و ٧٢٠ لاپەرە چاپکراوەتەوە .. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

زوبدەی عەقیدە و خولاصەی کـەلام

هەر لە تو بو توس حەمد و پەنای تام

مەولەوی خۆی ئەم عەقیدەیەی کورت کردووەتەوە و باسە گرانەکانی لێ لابردووە بۆ ئەوەی قوتابییە تازەپێگەیشتووەکانی لێی تێبگەن.

-الفوائح ٢٥٧ شیعری فارسییە و لەگەڵ عەقیدە کوردییە باسکراوەکەدا لەچاپ دراوە. یەکەم شیعری ئەم کتێبە ئەمەیە:

چو در خود بینم از بس رو سیاهی     نگنجـد ای الـهـی یا الهـی

جگە لەمانەش نامیلکەیەکی بە فارسی هەیە، کە باسی ئوسوولی تەریقەتی نەقشبەندی دەکات.

**نموونەیەك لە هۆنراوەکانی مەولەوی**

ئاماوە وەهـــار، وەهـــار شـــادی
بۆی عەتر نەسیم غونچەی ئـــــازادی

خێڵ خانەی خەفەت بار بەنییش کەردەن
مەینەت ڕوونی یان وە ماوای مـــەردەن

خەم وێنەی کەمان قامەت خەم بی یەن
هەوارگەی قەدیم نە دەسش شی یـــەن

بەزم شەوق و عەیش نە دەروون جەمەن
ئانە هیچ نەبۆ نە دەروون، خەمـــەن

ئینە نەتیجەی دیاری باڵای تـــۆن
نیشانەی وساڵ خاڵ ئاڵای تـــۆن

**هامفەردەکان و دووفەردی مەولەوی**

**هومایۆن ساحێب**

شیعری مەولەوی لە سەردەمی خۆیدا لای شاعیرو هامفەردەکانی بە ئاشکرا دەستی بۆ براوە و لە پرۆسەیەکی زۆر ئاشکراو باوی نوسیندا بە جۆرێ کە ئەو کات ئەنگ و شوورەیی نەبووە لای چەند هاوڕێیەکی دەرکەوتووتەوە و بە مەرهەم و چارەسەری دەرد و زامی خۆیانیان زانیوە. لە نێو کەشکۆڵەکان و بەرهەمی هاوچەرخانی مەولەویدا ئەم دیاردە بە ئاشکرا دەبینرێت ، ئەم دیاردەیە تا ئەوشوێنەی بناسرێتەوەو خاوەنداریەتی ڕاستەقینەی

مەولەوی پێوە دیاربێت کێشە نیە . کاتێ دەبێتە کێشە کە شوێنی ڕاستی هەندێ شیعر شوناسی ئەدەبی و زاراوەی تایبەتی خۆیان لە دەست دەدەن و دەچنە دوون و تەنی تری شیعریەوە جا هەندێ جار هەر لای خودی مەولەوی شیعرمان هەیە فەرد(تاک)ە و وێنەی لە شوێنی تردا دەرکەوتووەتەوە.جاری واش هەیە شیعرێ لای مەولەوی فەردە و چووەتە نێو ساختمانی شیعری شاعیرێکی ترەوە .یان دەشگونجێت بێژین کە مەولەوی جارجار دڵبردەی تاکە تاکەیەك لە شیعری هاوچەرخانی بووە و شیعری ئەوانی وەك پۆ بۆ تانی شیعری خۆی هێناوە ، یان ئەوانی کردووەتە ئامیانی شیری زوڵاڵی شیعری خۆی. لەوانە (داخی و مەجزووب وکوماسی و.....هتد) توانای ناسینەوەی ئەم دیاردەی پۆو تانە یان شیرو ئامیانە لە دەسەڵاتی کەشکۆڵ نووسان و دواتریش کۆڵیاران دەرچووبێت و بووبێتە مایەی تێکەڵ کردن لە شیعرو خاوەندariyان.

پێش ئەوەی نموونەی پێویست بەرچاو خەین کە مەبەستی ئەم نووسینەیە خراپ نیە پێناسە وخاسیەتی فەردەکانی مەولەوی لە کتێبە هێژاکەی دکتۆر ئەنوەر بگوازینەوە وخۆیشمان قسەیەکی لێبکەین.

فەرد: بابەتێکی زۆرچڕ و مەودا کورتی شیعریە، لای مەولەوی ژانرێکی لیریکیە و بەشێوەی هونەری جۆرا و جۆردەربڕاون. لە فەلسەفەی ژیان و ئایین و پەند و ئەڤین و وێنەی سروشتی کە تێکڕا دەربڕی شەپۆلی یەك لە دوای یەکی بەردەوامی هەست و ئەندێشەی شاعیرن . فۆلکلۆری کوردی بوەتە هەوێن و سەرچاوەی ئەم ژانرە لای مەولەوی. ئەو یەکێکە لەو شاعیرانەی ئەم ژانرەی هێناوەتە شیعری کوردیەوە و شاعیرانی تر پەیڕەویان لە مەولەوی کردووە .

بەڵام ئەم پێناسە و خاسیەتانە بەس نین بۆ ناسینەوەی ئەو ژانرە. چوون دەکرێت هەر دوو دێڕێکی چڕ بگریت و جیای کەیتەوە ببێتە فەرد. بەم جۆرە تێکەڵ و پێکەڵی کەوتوەتە نێوشیعر و فەردەکانی مەولەویەوە ، چوون فەردمان هەیە لە دیواری شیعرێکدا بووە و ڕەنگە نەساخێك بە جیای نوسیبێت. وە بە پێچەوانەوە ڕەنگە مەولەوی فەردێکی و تبێت و سەلیقەی نووسەرێك لە شیعرێکی تردا بە پێی گونجان جێی بۆ کردبێتەوە. بۆ نموونە ئەم دوو فەردەی نێو دیوانەکە و کتێبەکەی دکتۆر:

ئای چەن سەرچەنگ چەرخ چەپ وەردم

چەرخ چەن چەرخاو من مام نەمـەردم

ئەم فەردە لە نووسینەکەی محمد عەلی قەرەداغیدا بوەتە شەشەم دێڕی شیعرێك ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی ٦ل٢٣٨) کە (٥) شیعرەکەی پێش خۆی زۆرجیان و وا گومان دەبەی کە هی مەولەوی بن. چوون هەم زمانیان جیایە هەم دەس و تەقەڵیان .

لە کتێبەکەی مامۆستا حەکیمیشدا سەرەتای شیعرێکی (١٥)بەیتیە ( مەولەوی حەکیم مەلا صالح ل١٦١) لە نووسینەکەی سید محمد اسعد سەجادیش هەمان شوێنی لای مامۆستا قەرەداغیە و لەوی وەرگرتووە ( کنگرە بزرگداشت مولوی کردل٣٣٥) وە لەم دواییەشدا مامۆستاحەکیم بە شیعری یوسف بەگی ئیمامی بڵاوی کردەوە . ( دیوانی یوسف بەگی ئیمامی چاپی یەکەم ٢٠٠٩ل١٦-٢٠) کە من لام وایە شاعیرۆکە و هەندێ کەس شیعری شاعیرە گەورەکانیان لە ناو شیعری نزمی خۆیان جێ کردوەتەوە بە نیازی ناوبانگ و گەورە بوون . ئەم دیاردە زۆر دەردەکەوێت و نموونەی زۆرە.

فەردی یەکەم:

ئای چەند سەر چەنگ چەرخ چەپ وەردم

چەرخ چەن چەرخاو من مام نەمـــەردم

ئەم شیعرە لە دیوانەکەدا تاکێك و د. انوریش هەروەکو دیوانەکە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردووە لە ژێر ناوی (فەرد) کورتەیەکی چڕوپڕی زانستی باس دەکات و ئەم فەردەیشی. وەکو چۆك دانەدان و خۆڕاگری شاعیر باس کردووە ( لیریکا ل٩٣-٩٤) بەڵام لە کتێبەکەی کاك حەکیمی مەلا ساڵح ( مەولەوی حکیم ل١٦١،٨٨-١٦٣) دەبێتە پانزە بەیت و ئێمەش دەیگوازینەوە و لە هەرکوێ پێویست بوو ڕاڤەی دەکەین، هەروەها مامۆستا حەکیم لە پشکنینەکەی دا بەم شیعرەوە ٩ پارچە شیعری بڵاو کردوەتەوە ، بەڵام مامۆستا حەکیم لە چاپ کردنی دیوانی یوسف بەگی ئیمامیشدا هەمان شیعر بڵاودەکاتەوە و ڕوون کردنەوەی خۆیشی دەنوسێت بۆ کارەکەی. ( دیوانی یوسف بەگی ئیمامی حکیم مەلا ساڵح چاپی یەکەم ٢٠٠٩ ل١٦-٢١) .

هەروەها مامۆستا محمد عەلی قەرەداغی لە شارۆکەیدا هەمان شیعری بە تێکەڵی بڵاوکردوە تەوە لە کەشکۆڵی حاجی مەحموودی یاروەیسیشدا کە مامۆستا عوسمان محەممەد هەورامی ساخی کردوەتەوە بە شیعری یوسف بەگی جاف تۆمار کراوە لە گەڵ هەندێ جیاوازیدا ( کەشکۆڵی یاروەیس ل ١٥٢-١٥٧) سەرە ڕای ڕێزی زۆرمان بۆ دانایی ئەو سەروەرانە ئێمە پێمان وایە کەسیان نەچوونەتە ئەودیو بارووی باخی شیعرەکەوە . جا

شیعری مەولەوی بێت یان هی هەرکام لە یوسفەکان. ئێمە ڕاڤەی دەقەکەمان کردوە کە زۆر مەبەستمان ساخ کردنەوەی خاوەنی نەبووە .هەر چەندە لەوبارەشەوە گومانی خۆمان دەربڕیووە.

ئەی هوو چەن سەرچەنگ چەرخ چەپ وەردم
چەرخ چەن چەرخیا من مام نەمـــــەردم

ئەی هو چەند چەپۆکی چەپگەردم خوارد، چەرخ چەند سوڕا و لە سوڕانەوەکانی دا من مام و نەمردم. بۆ ئەوەی باری لێدانەکە (دەردەکە) بە سەختی و سامناك پیشان بدا لەسەر پیتی (چ) پێ دا دەگرێ، تا دەنگی ستەمی چەرخ و نالەباری یەکەی و چەپۆك بارانی دەستی ڕۆژگار هەست پێ بکەیت، مەولەویش ڕۆحێکی بەمێزی مۆسیقای هەیە، بۆیە ئەو ئیقاعانە لای مەولەوی هۆشیارانە بەکارهاتوون دەرەوە و ناوەوەی شیعری مەولەوی سیخنانە لەو نموونانە

یە گەردوون مودام گەردەلولشەن      دڵداران دڵان های چەند تولشەن

ئەمە گەردوونە هەمیشە گەردو لوولیەتی، دڵداران، دڵان.. های چەند درێژە. واتە سەرەتای سوڕانی (گەردەلولی گەردون دیارنی یە و خوا دەزانێ سوڕانی چەند توول دەکێشێ.

مودام – مەدام: بە پێکی یەکتا پەرستیش هاتووە . گەرچی باوەڕ ناکەم شاعیر ئەم مانایەی پێ دا بێت.لە ئەدەبیاتی عرفانی کرمانجی ژووروودا زیاتر بەم مانایە بەکار براوە بەتایبەتی لای عارفی گەورە و سۆفی خواناس و خۆ ناس مەلای جزیری دەڵێت:

گووشی ب عامێ مەدە ، تەرکی مودامێ مەدە      اکثرهم فی غما، اغلبهم فی عما

(دیوانا مەلایێ جزیری،تحسین ئیبراهیم دۆسکی چاپی دوو ۲..۵ل۳۷)

ئاڵــم بەرکــەنار، وێم بــە حــاڵــی وێــم
ئای چەن گیان سەخت بیم چەن چەرخش دا پێم

دنیای خستەلاوە، یانی گەرد و خولی ئالآندە من، خۆم بە حاڵی خۆم، ئای چەند سەخت بوو گیانم و چەند خولی پێ دام. ئەم شیعرەش یەکێکە لەو شیعرانەی کە نزیکە لە هەڵدانی پشتەکانی دۆن و مێژووی ڕۆح و تەن گۆڕین . وە زۆر بە ژیانی زلێخا دەچێت . ئەو کاتەی عشق و درکاندنی ڕازەکەی سووك و ڕیسوای دەکات وهاونشینەکان بە جێی دێڵن و هەر خۆی بەحاڵی خۆیەتی. کۆشك و تەلار و خزمەتکار و سامان و ساز و تەنانەت ئاموونی خواش لە دەست دەدات.

مەجرا و مەحفەرش کەیل نە شادی پڕ

وە باری ئیلیس پەردەی حەیـــادڕ

مەجراو مەحفەرش: بۆخچە و سندوقی پڕاو پڕە لە شادی و، بەباری ئیبلیسدا پەردەی حەیای دڕی. مامۆستا حەکیم (مەجراو مەحفەری) بە جۆگەلە و چاڵ ڕاڤە کردووە کە بەلای ئێمەوە ڕاڤەی تریش هەڵدەگرێ .لە کەشکۆڵی یاروەیسدا (مەجرای مەحفە ر) هاتووە . کە بە ڕێبازی ئامادە بوونی لێك دراوەتەوە ( کەشکۆڵ ل١٥٣) .بۆ بەراورد و جیاوازی ڕاڤەکان بڕوانەرە ئەو سەرچاوەیە. وە ڕەنگە وشەی (باری) ناو بەیتەکە (یاری ) بێت واتە یارمەتی دەرو وێنەکەش ئاوای لێ دێت:

ئەم گەردونە وەك چەرچی یەکی ساختەچی وێنە دەکات کە سندوقەکەی پڕ لە کالآو وردەواڵەی خراپ و لەو دەرو وخول وکەسابەتەشدا شەیتان یارمەتی دەرو دەلآڵیەتی . وە بەیتەکانی دواتر کە کالآی سندوقەکەن تێکڕا (سلبین).سنوق و بوخچەی گەردوون پڕپڕە لە شتی سەرنج ڕاکێش و(وەك وردەواڵە فرۆشێ منالێ خەڵەتێنەی پێ بێت) وە بە یارمەتی شەیتان ئەم گەردوونە فریومان دەدات.

ئەوەڵ بارخانەی بەد بەختیش ئاوەرد      هەروێم مزانو چۆن باربەندیش کـەرد

یەکەم جار بارخانەی بەد بەختی هێناو هەرخۆم ئەزانم چۆنی پێچاوەتەوە یانی بارخانەکە (کەل و پەلی بەد بەختی بووە ، زۆریشی پێچاوەتەوە) دواتر لەکەل و پەلەکانی دەدوێت.

ئاوەرد پارچەی بەد پۆشـا نە وەرم      ڕووسیا، ڕەنگ زەرد سەرتا کەمەرم

هێنانی پارچەی (قوماشی)بەدی لەبەر کردن (واتە خراپەی پێ پۆشیم). پارچەی بەد لەو تەرکیبە جوان و ناوازانەیە کە مەولەوی زۆر بەربلاو پەرەی پێداون بۆی بە شیعری مەولەوی دەچێت . کاك حەکیم ڕاڤەی ئەم بەیتەی بەم جۆرە کردووە ، پارچەی قوماشی بەدی هێناوە بەبالأی بڕیم سەرهەتاکو کەمەرم بە ڕوو ڕەشی و ڕەنگ زەردی ماوەتەوە.

پارچەی بەدی لەبەر کردم (وەرم) ڕوو دەگرێتەوە تا کەمەر وە ئەو پارچەی بەدە پارچەیەکی نە بینراوی ڕەنگ زەرد و ڕەشی واتایی یە (معنەوی) ناوێکی لێکدراوی واتایی یە دیارنی یە و لە خراپە پێکهاتووە هەڵگری سیفەتە سلبییەکانە لە ناو بارخانەکەی چەرخی چەپ گەردایە. لەو پارچەی بەدە کە دارای ڕەنگە سلبییەکانە . ڕەشی بەر ڕووکەوتووە و زەردی بەر سەر تا کەمەری. (ڕووسیا و ڕەنگ زەردی) کردووەتە دەلالەتی خەجاڵەت. تەناسوب هەیە لە بەیتەکەدا.

نزول کێشا دەست بەختم ئـــەو رای بەد

پای ئەدەب نە ئەرگ عادەت کەردم ڕەد

دەستی بەختم بۆسەر ڕێی خراپەکاری شۆڕبووییەوە و پێی ئەدەبم لە کۆشکی عادەت ڕەت کرد. ڕاڤەکەی کاك حەکیم نزولی پێچەوانەی صعود، وەرگرتووە، ئەمە ڕاستە، بەلاّم (نزول) فارسی یەکەی مانای (سودە) لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕی پارە و بازرگانی دا وحەرامە، شیعرەکەش لەبارو بارخانەکەوە دیارە جۆرێك بازرگانی تێدا کراوە و کالاّکان کالاّی بەدبەختین بەیەکیەتی بابەتەوە شیعرە کە پابەندە، بۆیە دەکرێ بەم جۆرەش ڕاڤە کرێ.

بەختم لە ڕێی (بەدا) دەستی بۆ سوود (پارە و قازانجی حەرام) ڕاکێشا. پێ ی ئەدەبم لە (ئەرگ) کۆشکی بچوك لە ناو ڤێلاو کۆشکی گەورەدا، ، بە پێی عادەتی شاهان بۆ هەموو کەسێ نیە، شاعیر دەڵێ من زیاتر چووم و ڕەد بووم. (دەستی بەخت، پای ئەدەب، کۆشکی عادەت، تەرکیبە جوانەکانی داهێنانی مەولەوین جێناس هەیە (ڕەد، بەد). کەسێ لە گەڵ ئەم گەردوونە چەرچی یەدا مامەڵە بکات دەدۆڕێ . وە لە یوسف و زلێخادا ، زولێخا ئەو سود و بەرتیلە دەداتِ لە دەست خستنی یوسفدا و کەسابەتێکی حەرامە و هەروەها پێی بێ ئەدەبیەکانیشی لە ڕەسم و یاسای کۆشك دەردەچن.

لای مەحموود پارەیس دوای ئەم دێرە دوو بەیت هەن کەلای کاك حکیم تۆمارنەکراون.ئەوانیش:

کەم کەم وە هەوەس بەسەد هەزار گەرز

لاحیا فی الدین پام بری نە ئـــــەرز

ناگاە بە فریب پەشتی پا دا لێـــــم

چەرخم دا ئەو پێچ قەلەندەری وێـــم

بۆ بەراورد بڕوانە (مەولەوی حکیم ل١٦٢ودیوانی یوسف بەگی ئیمامی -حکیم ل١٨و کەشکۆڵی حاجی مەحموودی پارەیس ل ١٥٣-١٥٤)

ڕێزە کەرد شیشەی بەزمی بیساتم

زرنگیا زەنگ نەردی نەهاتـــم

شووشەی بەزمی شادیم (کەیف و ڕابواردن)ی ورد و خاش کرد و زەنگی نەردی نەهاتم زرنگایەوە (دەنگی دۆڕانم دەنگی دایەوە) ئەمەش لەناو زڕاندنەکەی زڵەیخاوەیە لە کۆشکی

عەزیزا و بنێشتە خۆشەی ڕازەکەیەتی کە دەبێت عاشقی ڕاستەقینە ڕاز فاش نەکات و نەیەڵێ دڵی لە دەست بچێت.

پارە پارە کەرد مەنیام وە مەینەت
بادا لە تەرەی مەینەت وە بەینەت

ڕاڤەی ئەم بەیتە بەم جۆرەیە. چارمنووسی وە مەینەت لەت لەت کرد و ئەمجا تەشی مەینەتی وە بەینەت بادا. (کاک حەکیم) مەنیامی، وە مامەوە ڕاڤە کردووە و لای مامۆستا محمد عەلی قەرەداغیش (مینام) نوسراوە کە مانای دروستی دەکاتە شووشە و مانای خوازراوی دەبێتە سومعە .(مەنیام) ئەگەر وشەکە هەورامی بێت واتە نام، خۆ ئەگەر (منیە) عەرەبی بێت ( فەرهەنگی دەریا ب٢ ل١٣٦٥) و وەك هەموو وشەکانی تر کە پێش مەولەوی تا سەردەمی ئێستاش دەکرێنە کوردی – هەورامی (محبت –مۆبەت) منیە –مەنیا ئەوە واتاکەی بەو جۆرەیە واتە (چارمنووس).کە هەردوو واتاکە بە ڕاڤەو ژیانی زلێخا دەخۆن .بەڵام بەو پێیەی بەیتی پێشتر شووشەی تیا بەکار هاتووە ، ڕە نگە ئەم بەیتە لە بەیتە جادووبازەکان بێت و فرەمانا بێت.

لە کەشکۆڵی یاروەیسدا وەها نووسراوە:

پارێ پەرەند کەرد من نیام وە.. کە ساخ نەکراوەتەوە ......

ئەی سەر تا ئەوسەر خول ئـــاوەردەوە        هەودای هەم و غەم مەحکەم کردەوە

ئەم سەرتا ئەوسەری (دوو تاڵ –یان دوور لۆنە )پێکەوە ڕێسان و بایدان، هەودای هەم و خەمی توند و مەحکەم کرد (تاڵی ڕێسراوی مەحکەمی هەم و خەم کە پچڕانی گران بێت.

ئیسە نە عەیشەن نە ســـــرور نە ڕاز        نە دایرەی دەف نە چل چەنگ نە ساز

ئێستا نەژیانم هەیە و نەشادی و نەڕاز و نەساز و ئامێرەکانی میوزیك.

عاشق کاتێ ڕاز دەدرکێنێ و بەدناو دەبێت... عەیش و نۆشی ژیانی لە دەست دەدات (زلێخا لە پیریدا).ئەم دۆخە دەبرێت، هەموو عەیش و نۆشەکەی لە دەست دەدات تەنانەت ئامێری مۆسیقاکەش.

لای یار وەیس دوای ئەم بەیتە ئەمانە هەن کە بە ڕاستی مووچرکە دارن:

نەجۆشی جلووس سوزی جــــــوانی نە هازی هەڵمـــــــەت زۆری زرانی

هیچ کام نە باغچەی بەدەن نە مەندەن        بینای بنچینەی بیساتم کەنـــــــدەن

یەکسەر پەردەی چەرخ چی ئەهلی کارەن        ماڵاو بەرد هەر عەکس تاپۆم دیـــــارەن

یەکسەر (ئازا –خێرا) پەردەی چەرخ (ئاواز و ئاهەنگی چەرخ) چی ئەهلی کارە (پیاوی نیش) وە ڕەنگە مەبەستی لە ئەندامەکانی جەستە بێت ئەوانەی دەتوانن لە ڕەنجدانا بەکار بخرێن (دەست و بازوو قول و قاچ).یان(خزمەتکاروکارەکەرەکانی زلێخا)کە دواتر ڕوونی دەکەینەوە. واتە ئاهەنگی چەرخ بۆ گەڕانی مەجلسی خۆی ئەهلی کارەکانمی بردو ڕای ماڵین و ئێستە هەر وێنەی تاپۆم دیارە ( تەنی بێ هەست و قەوارەی بێ گیان) تاپۆ : بەڵگەی بوونی شتێ کە هەیە بەڵام ڕاستەقینەی شتەکە نەبێت. ئەم بەیتەش لای کاک حەکیم جۆری تر لێکدراوەتەوە( مەولەوی حەکیم ل١٣٦) .

بازهەم کلاّفەم چون بەدلەی دمرونش

هەرچەرخم مەدۆ چەنی چـەرخ وێش

هەمتر کلافەم (دەزوی سواو و ئاڵۆسکاو –یان خەرەك) وەك شڕوشیتاڵی دەروێش ئەمسوڕێنێ لەگەڵ خۆیدا. لای یاروەیس نیو بەیتی یەکەم وەهایە:

باز هەم قولاّخم چوون بەژلەی دەروێش

هەی چەرخ وە بەدی وێت گرفتار بی

هەی چەرخ بدەری هەرتا دیاریـــی

هەی چەرخ گرفتاری بەدی و کەچ ڕەفتاری خۆت بیت و هەر تاهەیت هەر خولت بێت و بسوڕێی.

شەرت بۆ چون چەنی (یوسف) بەدکاری

تۆ ئەو چەپگەردی، من ئەو بێ عــاری

مەرج بێت، چونکە لەگەڵ یوسف بەدکاری، ئیتر تۆ بە ڕێگەی (ناڕاستی) خۆتاو منیش بێ عاری بگرمەبەر.

مامۆستا حەکیم نووسیویەتی دیارە (بۆ یوسف) ناوێ نووسراوە ، مامۆستای قەرەداخییش نووسیویەتی( یوسف ڕەنگە زەلامێکی بەدو نالەبار بوبێت و بۆنموونەی بەدکاری هێنرابێتەوە)ئەم سەرنجە زۆردوورە لە پێگەی بێژەی (یوسف)ی نێو شیعرەکە . من لە کۆتایی دا دەمەوێ لە یەکیەتی بابەتی شیعرەکە و چیرۆکی یوسف و زلێخاوە سەرنجێکی ناقابیل بدەم.

وەك وتمان ئەم شیعرە تا کارەکەی ئەم دوایەی مامۆستا حکیم (دیوانی یوسف بەگم)مە بەستە ، هەر بەشیعری مەولەوی دراوەتە قەڵەم و بەبەراورد لە گەڵ شیعرەکانی تری یوسف

بەگدا ئەم شیعرە بە هێزترە و تام و بۆنی شیعری مەولەویشی پێوەیە. بە هەر حاڵ هی هەرکەسێ بێت سەروەران باش ڕاڤەیان نەکردووە.

ڕاز و بەسەرهاتی پاڵەوانی لیریکی ئەم شیعرە زۆر بە موعانات و ڕازەکەی زلێخا دەخوات. تەنانەت هەندێ لە شیعرەکانیش لە سێبەری بەیتەکانی خانا و چیرۆکی یوسف و زلێخادا نیشتوون .زلێخا چەند جارێ خەو بە یوسفەوە دەبینێ... کاتێ چاوی بە عەزیز دەکەوێت و ئەزانێ پاڵەوانی خەوەکەی نیە ئاوادێتە گۆ-:

هەی داد هەی بێداد هەی چەرخی چەپگەرد

تۆ ئەرووی دەوران چێشت بەمن کـــــرد

تاڵەی من بەو تەور سیاو زەبوونـــــــەن

کەشتی ستارەم غەرقابی هونــــــەن

ئەرد سەخت ئامان بە فاڵی بەختـــــم

جەرگ پارەی تیغ جەلادی سەختـــــم

گەردوونی کە چ باز کەج ئەردی کەج کار

وستەنم ئەگێج جەفای بێ شومــــــار

ئێمە ئەزانین کە مەولەوی چاوی بە ئەسەرەکانی خانا کەوتووە و(یوسف ناوە شاعیرەکانیشی ناسیوە)وبەهرەی لێ بردوون ئامارەیەکی گرنگیش هەیە کەئێمە بتوانین وەك چرایەك بۆتاریکی ئەم شوێنە.هەڵیکەین.ئەویش دێرێکی (داخی)یە بۆ شیوەنی مەولەوی.

ئەشعار یوسف ئەبیات خانـــــا

جەخەیاڵ خاێش وە هیچ مە نەمانا

مەولەوی خۆی ویستویەتی هاوشانی خانا بکات لە حکایەتە شیعریەکاندا و دواتر زانیویەتی سەرکەوتوو نابێ و وازی هێناوە . ئەم شیعرە گەر هی مەولەوی بێت ئەو چرکەساتانەی ویستەکەی مەولەویە بەڵام بە پوختی و بە شیعر ، ئەم یوسفەی کە مەلای داخی بۆ بەراوردی مەولەوی هێناویەتی ،خەیاڵ ناکەم یوسف بەگی ئیمامی بێت . و ڕەنگە یۆسف یان یۆسۆ ئاسکەی مەبەست بێت ، کە ئەویش بۆخۆی خاوەنی ڕازێکی ئەڤینداری و کەشف بوونی سرو چارەنوسێکی بە داخ و جەرگبڕە. ( بڕوانە کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی – گۆرانی ساغ کردنەوەو سەرەتا نوسینی ئەنوەری سوڵتانی ١٩٩٨ لەندەن ل١١٨-١١٩ و بۆ نموونەی شیعریشی ل٢٢٨-٢٣٣و٢٥١-٢٥٢و٢٦١)

بنیادی شیعرەکەی مەولەوی لە سەر (بە دڵ نەسوڕانی چەرخ و بێ دڵی) (بێ عاری بەرامبەر نەهامەتی چەرخ)... کە تێکڕای وێنەکان بە ژیانی زلێخا و بێ عاری و بێ ئەدەبی یەکانی کۆشك و سوو .

**تەواو کەری باسی (هامفەردەکان و دووفەردی مەولەوی**

بنیادی شیعرەکەی مەولەوی لە سەر (بە دڵ نەسوڕانی چەرخ و بێ دڵی) (بێ عاری بەرامبەر نەهامەتی چەرخ)... کە تێکڕای وێنەکان بە ژیانی زلێخا و بێ عاری و بێ ئەدەبی یەکانی کۆشك و سوود دانەکانی بۆ کڕینی یوسف دەخۆن).هەروەها بێ عاری یوسفەکەش بە دان پیانانەکەی یوسف ئاسکە دەچێت لە دوا چرکەی ژیانیدا،چەند شیعرێکی میللی بە زاریەوە دەوترێن دیارترینیان ئەم تاکەیە گوایە بەرامبەر خان ووتویەتی:

**ئەمگوژی ئامگوژی هەر بە گێرمەوە**

**خاتو کلاو زەڕ بوو بە ژێرمــــــەوە**

هەرچەندە من یوسف ئاسکە بە دوورتر دەزانم لەو گۆبەنە مێژوویە و زاڵمان ئێستاش دەتوانن بە مەیلی خۆیان بۆ هەر بڕیارێکیان سیناریۆ بسازێنن . ئەو جۆرە شیعرە میللیانەش دواتر بە مەیلی دەر ئەنجامەکانی سیناریۆکە کەوتوو نەتە سەر زاران. شوێنەوارناسان و عەودالانی مێژووی ڕاستەقینە دەبێت ڕۆژێ ڕووی ڕاستی ئەم جۆرە چیرۆکانە هەڵماڵن . ئێمە دەزانین زێڕین كلاه بە نابە دڵی زەماوەنی خان پەزیرایی دەکات و مل بۆ نیاز و بەرژەوەندیەکانی کاکی نەدات .وە ستەم و فەسادی و بەد ڕەوشتی هە ندێ لە بنەماڵە فەرماندارەکانی کوردستان بە گشتی و ئەردەلانیەکانیش بە تایبەتی لە مێژوودا دیارە و تەنانەت مێژوونوس و ئەدیبێکی وەك مەستوورە بە زۆر براوە دەشێ کلاو زەڕیش پشکۆی گڕی زلێخای تیا بووبێت و ئالانبێتیە یوسفی شاعیرو سیابەخت و سیاچەمانە بێژی بلیمەت و یوسفی ئێمەش ملی نەدابێت و بووبێتە سوپەر بەلای ئابرو نە چوونی خان و کڕینەوەی سومعەی دۆڕاویان لە ئەنجامی بەد نیازیەکانی کلاو زەڕخان . ڕێك بە وێنەی ڕازەکەی حەزرەتی یوسف چوونکە ئەو شیعرانەی تا ئێستا لە بەر دەستن بەناوی یوسف ئاسکەوە بە چیرۆکەکەی ناخۆن و دەبێت لەو مەیدانەدا هەوڵی زیاتر بدەین و بەوەی لە خەیاڵدانی ئەدەبی نەتەوەییماندایە دەم و دەست ڕازی نەبین.

**ڕاڵەکە پێوەن دەبینەوە بە یوسف و زلێخاوە ، بەم جۆرەیە:**

سوڕانی چەپگەرد بەلای زلێخاوە (بێ مەیلی یوسفە، بەرامبەری، وەلای وایە چەرخ بەدکاری لە گەڵ یوسف دەکات کە یوسف ناز و نیعمەتەکانی ئەو و ڕابواردنەکانی قبوڵ نیە.یانی بە پێوەری عرفانی بۆ پێناسەی بەلا کان کە پێغەمبەران بەشی گەورەیان بەر کەوتووە ، ئەوە جوانی یوسف دەبێتە بەلاّ بۆی . وە لە ڕووی حیکمەتی ڕۆمانەکەشەوە دیارە جەماڵی یوسف خراپ کەوتەوە بۆ زلێخاو حافز ئیشارەیەکی جوانی لەو حکایەتە درکاندووە

من از ئان حسن روز رفزون کە یوسف داشت دانستم  کە عشق از پردە عصمت برون ئارد زلیخـــارا

من دەمزانی ئەو جوانیەی یوسف سەر ئەنجام دەبیتە مایەی دەرهێنانی زولێخا لە پەردەی شەرم و پاکی ( مەحرەمی ڕاز بەرگی ١ ل٢٧). ئەمامەتی یەکانی زولێخا ئەوەڵ جار لە هاتنی بارخانەی گەردوونەوەیە کە بەرەو مێر کاروان دەڕوا و یوسفی پێ یە. کە کۆتایی چیرۆکەکە بە باری عرفانی تەواو دەبێت.

بەلاّم ئەم شیعرە دارای ناوەڕاستی حکایەتەکەیە و تەنها مەشهەدی شەیتەنەت و بێ عاری و هەواڵەکانی زولێخا و خۆڕاگریەکەی یوسفە. وەڕەنگە (یوسف) ناوێکیش هەبێت لە ئارادا و مەولەوی شیعرەکەی ئاراستە کردبێت(گەر شیعری مەولەوی بێت ) . یان شیعری یوسف بەگ بێت بەو جۆرەی کە کەشکۆڵی یاروەیس تۆماری کردوە و مامۆستا حەکیم لەم دواییانەدا بلاّوی کردەوە . بەلاّم ئاشکرایە کە شاعیرەکەی ئێمە لە سەخت ترین کۆستەکان و کارەساتەکانی دا نەیداوەتە بێ عاری، خوێنەری وریاو توێژەری بە تاقەت دەتوانێ تەواوی چیرۆکی یوسف و زولێخا بخوێنێتەوە و بەراوردی لە ئێمە باشتر بکات. ئێمە زیاتر ڕاڤە و خوێندنەوەمان کردوەتە کاری خۆمان ساغکردنەوە لە توانای کەم ئاوازی ئێمەدا نیە.

فەردی دووەم:

چوون شەماڵەی نوورگڕگڕانە
پەی پاس ماران زەنگ زڕانە

شەماڵەی نوور(ئێرە قونێ-ئایرە قونێ-ئێرەقوولە)زیندەوەرێکە شەوان لەبن کلکیدا شەوقێ ئەدرەوشێتەوە. لە هەنبانە بۆرینەدا بە(گوستێرک-گوڵەستێرە)هاتووە.

ڕاڤەکەی لەدیواندا:

چرای عەشق وخۆشەویستیم بەدەستەوەیە وەکو گوڵەستێرە بە دەورتا دەسوڕێمەوە وبە گۆرانی وتن زەنگ لێ ئەدەم وماری بەدکارانت لێ دوورئەخەمەوە. مامۆستا گڕگڕانی بە

گەڕان و درەوشانەوە لێکداوەتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا واتای ئاگربازی و بەردەوام گڕگرتن و سووتان دەدات. لای مامۆستا حکیم جیاواز لە دیوانەکە ڕاڤەکراوە و هاتوە:وەك گوئەستێرە دەگەڕێم و دەدرە وشێمەوە، بۆ پاسی مارەکانیش زەنگ لێدەدەم. چرای ئەڤینم بە دەستەوەیە و لەدەورت دەگەڕێم و بەزەرەی دەنگیشم ماری ئەگریجەکانت لەسەر ڕوخسارت دووردەخەمەوە. مەبەستی ئەوەیە من گڕی ئەڤین دایگیرساندوم و تیشك دەدەمەوە. بەڵام تۆ ئەی نازەنین ئەگریجەکانت ڕوخساری داپۆشیویت و تیشك ناداتەوە لە بەرئەوە بەزەنگی ناڵەی دەروونم ئەو ماری ئەگریجانە دوور دەخەمەوە تا ڕوخساری پرشنگدارت دەربکەوێت ( مەولەوی و تەقینەوەی زمان ل٥٩)من پێم وا نیە مەولەوی وێنەکەی لەو زیندەوەرە گڕ بەقنگەوە وەرگرتبێت. خۆ گەر واش بێت ئێمە دیسان جیاواز بۆ ڕاڤەکەی دەچین. شەماڵەی نوور: جوڵە وسەما ( فەرهەنگەکەی شیرین وخوسرەو محمدی مەلاکەریم ل ٨٣٨)و لە ڕزانەی گڕێکە کە بەرداوم وجولاو دێتە پێش چاو وەکو گوڵی گڕی مۆم یان چرا کە هەوا لێی بدات و بجوڵێت . مەولەوی تەشبیهو ئیستیعارە چرەکەی بە مەبەستێ هێناوە کە زۆر دوور و درەنگ دێتە زەنمان. ئەویش سوودەکانی تین و تاو و ڕۆشنایی ئاگرە. جووڵەی گڕ و بوونی شەوق لە کەپر و کەورگ و نێوباخ و ماڵی کوردەواریدا ئامارەی بوونی پاسەوان و بێداری و ئاگایی بووە. (تا بەیانی ئاگریان دەسووتا و بەخەبەر بوون). هەروەها ئاگری نەکوژاوە ئامارەی بێداربوون و تەنگژەیەکیشی تێدایە. نەخەوتن و بێداری خووی نەخۆش و دەردەداران و حەسحەسان و عاشق و پاسەوانانە .کە مەولەوی جێی بۆ تێکرای ئەگەرەکان کردوەتەوە. بە پێچەوانەوە ماڵێ ئاگریان دیارنەبوو بێت نیشانە بووە بۆ بێ ئاگایی و لە گوێی گا نووستنیان و هەل و دەرفەتی زیان لێ دانیان زیاتر بووە. بەدکار و دز و پیا و خراپان بێخەم بوون لە زیان لێدانیان . ئەم نەریتەش پاشماوەی زەرتوشتایەتیە و دەبێت بۆ ڕەهەندە پیرۆزەکانی ئاگر بچین.

لە ئەدەبیاتی عرفانیشدا بێداربوون ئامارەی سەگە هوشیارەکانی بەردەم ئەم ئارەزووی یار ویستی یەن بە جۆرێ شەیتان و سەربازە خوێڕیلەکانی نەتوانن پەلاماری هەرزەلە ڕۆشنەکانی عاشق بدەن و واریاتە جوانەکانی مەزراو باخی موحیبەت ئەتك کەن ، ناڵەناڵی عاشقانیش بۆ هەمان ڕۆڵە بۆ بێداربوونیان تا مەزرەعەکانی یار بێ زیان بن.

**مەولەوی دەیەوێت بڵێت:**

ئەی یار من تابەیان بە دیارتەوە دەسووتێم و غەرقی تیشك و ئاگرم، نانووم و بێدارم . دەناڵم و وڕەو دەنگم دێت. بەمەش (مارەکان) بەدکارانت لێ دووردەخەمەوە و فرسەتیان

نادەم. نەریتی زەنگ لە مل کردنی ئاژەڵیش کە دۆستانی تر بۆی چوون ڕاستە و بۆ هەمان مەبەستە.

یان من بە ماری پڕ پێچ و سحری نهێنی زوڵفەکانت گە زرام و لە و هەوڵەی دام کە دەس بۆ جوانی لەعل و ڕومانەکانت بەرم وەزەم لێکراو پێوە بووم . ئێستاش بۆ پاس و خۆ پارێزی لە مارەکانت هانام بۆ چەکەکانی بەرگری کردن بردووە .دەنگو ووڕە و گڕو ڕۆشنایی.

هەرچەندە من ووتوومە خۆم لە قەرەی ساخ کردنەوە نادەم و پەنجە شکێنی سەروەرانی ڕابەرم پێناکرێت ، بەڵام ئەو بێ ئەدەبیەش دەکەم و جارجار ئەوەی بیستوومە و لە لام هەیە وەك سەرنج دەری دەبڕم.

سەبارەت بەم تاکەش کەدیسان لە دیوانەکەدا هەیە دکتۆر ئەنوەریش وەك نموونە بۆ سروشت جوانی مەولەوی گواستوویەتیەوە و نەم بیستووە مەولەوی ناسانی تریش بە دوایدا چووبن و سەرنجیان لێدابێت.کەچی زاناو ڕابەری ئەدەبیات سیدگاهری هاشمی لە یەکێ لە بەرنامەکانی هەوراگەی دلآندا دەیخوێنێتەوە و لە پێشەکیەکدا دەفەرمێ لام وایە شیعری میرزا شەفیعی مامێزەکیە. ( هەوارگەی دلآن کاسێت) من چوومە خزمەتی میرزا شەفیعەکان کە هێژاو ماندوی مەیدانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی مامۆستا محمد عەلی قەرەداغی کە باسی چوار لە شەفیعەکانی کردوە . واگومان دەبەم ئەم شەفیعەیانی بە میرزا شەفیعی کولیایی ناوبردووە و دەنوسێت لە دێی ڕەزڵەی ناوچەی کولیایی کرماشان لە دایك بووەو لە سەردەمی خوسرەو خانی ئەردەلآندا ژیاوە ( کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی بەرگی چوارەم ل٤٣. هەروەها لە کەشکۆڵی بەرگی ٢ لە ل١١٩ و بەرگی ٣ل٢٧٦) دا شیعری بە ناو شەفیع هەیە.

صدیق بۆرەکەییش لە مێژووی وێژەی کوردیدا دەنوسێ لە مامێزك لە دایك بووە و لە نوسینی سەرچاوەکانیدا بە کولیایی ناوی دەبات ( مێژووی وێژەی کوردی بەرگی یەکەم ل٤٩٤–٥.٥) بەڵام من مادام لە دەمی سید گاهر بیستوومە و ئەم (شەماڵەی نوورەی ) لای مەولەویشی تیایە کە بۆ شوێنەکەش گونجاوە لێرەدا دەینوسمەوە و بەجێی دێڵم بۆ ساخ کەرەوەکان: نازار مەزانی....

حەرفێ مەپەرسوو جە ڕای نەزانی
جە کۆت ئاوەردەن فیرۆزەی کانی
نیانت نە تەخت لەعل ڕومانـــــی

قەدیم جەوێتەن یا تازەت سەندەن

کام حەکاک نەشانەی شا هۆرکەردەن ئەم دێڕە جوان نایەتە گوێ ڕەنگە درووستەکەی بەم جۆرە بێت:

کام حەکاک نەشار نەیشاپوورکەندەن
ئوسات کێ بیەن پەی نیشان کەندەن
پەنجەش نەرێزۆ زەر ئەفشان کەردەن
یە جەکۆت بیەن کێ تەرتیب دادەن
ێونعی کلکی دەست کامین ئوستادەن
ئانە خەیاتەی خام خاوودێزەن
یا تووکی تاوس جقەی پەروێزەن
یە نە خەزانەی کام خەسرەو مەندەن
ئەودامە چێشەن نە دەورت کەندەن
حەی وەچان چێشەن لەو لای دامەوە
لێوشان گرتەن وە پەنهامەوە
ئەسڵشان سجەن یا زەنگی مارەن
وەزە مەکەرۆ یا بێ ئازارەن
مار جە دام بەتەر ، دام جەمار بەتەر
ماوەرۆ نە ڕای ئەو ماران خەتەر
فەسڵێ من تۆم دیت نیمچە نەو ڕەس بیت
ناشی نە شکار دوور جە هەوەس بیت
سیا مارانت ئەودەم مار تول بی
دامت کڵف نەبی هێمای نە لوول بی
ئیسە مارانت دام حەی سەندەن
دایم هەر نەگیر گازو وەزەندەن
هەرکەسێ لە گیان وێش وێەردەبۆ
شامۆهرە نە مۆر پەیدا کەردەبۆ
بێ خوف جە خوف سپای شاماران
نەتەرسۆ جە زام زەنگی حەیتاران

شاماران بەحوکم موهرە دام کەرۆ
دەس پەی کڵف باخ کاف و لام کەرۆ
حەیفەن ئیجازەش نەدۆ وە توون دا
نەکێلۆ نە مەوج دەریای جەیحوون دا
ئەلئان یەکێ مِن مار تۆم گەستەن
تەرواڵەم نە دەور ئاوایی بەستەن
چوون شەماڵەی شەم گڕ گرانەن
پەی پاس ماران زەنگ زڕانەن
جەو سەبەب شەفیع زامش پڕ خارەن
کوشتەی حەی وەچان سیای تاتارەن

مامۆستا پێش خوێندنەوەی شیعرەکە پەخشانێکی ڕاڤەی نووسیوە . یانی شیعرەکەی کردوە بە پەخشان ولە کۆتایەکەیدا کە ئێمە مەبەستمانە دەڵێت:

من لە ئاوایی دوورکەوتوومەتەوەو تەرواڵەم بە ستوە نانووم ، چوون ئەو مارانە گەستوویانم،لەترسی ئەوەی جارێکی تر نەمگەزن ، دوورکەوتوومەتەوە و ئێشك دەگرم.

تەرواڵە :دروستکردنی جێگە خەو یان جێگەی پاس کردنە بە دارو چۆ بە جۆرێ لە زەوی بەرزبێتەوە (قەرەوێڵە) بەمەش لە مەترسیەکانی مارو دوپشك پێوەدان دوور دەکەویەوە.

**خۆشەویستی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت ) لای مەولەوی**

فەلەك نەقشی پێی دی لەزەمینـــــــدا
خۆی گرینی هاتووە ڕووی برینـــــــدا

چاوگەی چاوەکەی لێل و حەسرەت مەند
( لیتنی کنـــت ترابا ) ی دەخوێنـــــد

هەرچی ڕیفعەت و عیززو هەستـــــی وێ
فیدای نەبوونی و خوارو پەستـــــی وێ

حەق ڕەحمی ئاورد بەسۆز و تـــــاودا
دەفیقی پەردەی لابرد لە نـــــاودا

سورمەی گەردی پێی کێشا وە چـــاودا

بە چاوی پڕ ئێش دووری بێ خـــــاودا

ئێشێ چلووی چوو نەختێ پڕ خەو بـــوو

لەحیکمەت میعراج،ئەو یەکێ ئەو بـــوو

# هـێمـــن

## رۆژهەڵاتی کوردستان

( ١٩٢١ – ١٩٨٦ ز )

هێمن ناوی (سەید محەممەد ئەمین)ە کوڕی سەید حەسەنی شێخول ئیسلامی موکرییە، لە بنەماڵەی مەلا جامییە ، دایکی ناوی زەینەب کچی شێخ بوورهان بووە کە ئێستا لە بنەماڵەیەکی گەورەی موکریانن . شاعیر و وەرگێڕی گەورەی کورد بوو لە ساڵی (١٩٢١)ز بە شەوی جەژنی بەراتێ لە گوندی لاچین نزیك شاری مەهاباد لە دایك بووە.

لە تەمەنی منداڵیدا چووەتە بەر خوێندن، سەرەتا ئەلف و بێ ی لای مامۆستا سەعید ناکام خوێندووە پاشان باوکی ناردوویەتی بۆ شاری مەهاباد بۆ ئەوەی لە قوتابخانەی دەوڵەتی بخوێنێت. لە ساڵی(١٩٤٢) ز کە کۆمەڵەی (ژ.ك)دامەزرا ، هێمن ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەو کۆمەڵە بووە. لە ١٩٨٦ کۆچی دوای کردووە لە مەهاباد گیانی بە خاك سپاردووە.

هێمن لە رۆژگارێکدا لە دایك دەبێ کە ڕەزاشا جڵەوی حوکمەتی پێە کە لاسایی ئەتاتورکی دەکردەوە ، جلوبەرگی کوردەواری بەتەواوی قەدەغە دەکرێ و ئەوەدەی لە دەستی هات ، سووکایەتی بە خەڵك کرد و شەپەکە و تەپڵەی هێنا نێو بازاڕەوە ، هێمن لەم کەش و هوایەدا گەورە دەبێ ، بەش خوراوی و کۆیلەیەتی مرۆڤ وەکوو خوێن لە مێشك و دەمار و ئێسك و پێستی دا دەگەڕێ و دەبێتە سەربەندی ژیانی .

لە کاتی منداڵیدا گوێچکە بە حەکایەتەکانی دایە دەگرێ ، کە پیرەژنێکی دونیا دیو بووە و زۆر شتی بەنرخی لێ فێر بووە ، ئەلف و بێ لای سەعدی ناکام دەخوێنێ و پێش ئەوەی ئەلف و بێی فێر بکا ، بزنۆکێ و مەڕنۆکێی خوسێنی حوزنی موکریانی بۆ دەخوێنێتەوە و هێمن لەبەری دەکات و هەروەها شیعرەکانی شێخ رەزای تالەبانی و زۆر شتی دیکەی لێ فێر دەبێ و پاشان بۆ درێژە دانی خوێندن ، باوکی دەینێرێتە مەهاباد و لە قوتابخانەی سەعادەتی ئەو شارە دەست دەکات بە خوێندن ، هێمنێکی لادێی کە جگە لە زمانی کوردی هیچی تر نازانێ و لەو قوتابخانەیەش کەس نەیدەتوانی بە کوردی قسە بکات ، منداڵان گاڵتەی پێ دەکەن و پێی دەڵێن کرمانج ، چونکە ئەو کاتە لە مەهاباد بەخەڵکی دێیان دەووت کرمانج .

هێمن ئەو ساڵە خوێندنی بەسەر کەوتنێکی زۆر باشەوە تێپەڕ دەکا و هاوین دەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی و لە لا مەلای دێ و باوکی دەرس دەخوێنێ و تەمرینی نوسینی خەت دەکات ،

ـوکی لە کاتی منداڵیدا گوێچکە بە حەکایەتەکانی دایە مرۆت دەگرێ، کە پیرەژنێکی دنیا
ـیو بووە و زۆر شتی بەنرخی لێ فێر بووە.

ئەلفوبێ لای سەعیدی ناکام دەخوێنێ و پێش ئەوەی ئەلفوبێی فێر بکا، بزنۆکێ و مەڕنۆکێی حوسێنی حوزنی موکریانی بۆ دەخوێنێتەوە و هێمن لە بەری دەکا و هەروەها شیعرەکانی شێخ ڕەزا و زۆر شتی دیکەی لێ فێر دەبێ و پاشان بۆ درێژە دانی خوێندن، باوکی دەینێرێتە مەهاباد و لە قوتابخانەی سەعادەتی ئەو شارە دەست بە خوێندن دەکا.

هێمنێکی لادێی کە جگە لە زمانی کوردی هیچی دیکەی نەدەزانی و لەو قوتابخانەیش کەس نەیدەتوانی بە کوردی قسە بکە، منداڵان گاڵتەی پێدەکەن و پێی دەڵێن کرمانج، چونکە ئەو کاتە لە مەهاباد بە خەڵکی دێیان دەکوت کرمانج، هێمن ئەو ساڵە خوێندنی بە سەرکەوتنێکی زۆر باشەوە تێپەڕ دەکا و هاوین دەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی و لە لای مەلای دێ و باوکی دەرس دەخوێنێ و تەمرینی نووسینی خەت دەکا.

باوکی کە دەزانێ خەتی خۆش بووە، دەستی پێ لە خوێندن هەڵدەگرێ و دەڵێ: بڕۆ دەرسی مەلایەتی بخوێنە. هێمن کە هیچ کات خۆشی لە مەلا نەهاتووە، تووشی ئەم تاڵییە دەبێ و چوار ساڵ لە خانەقای شێخی بورهان دەخوێنێ، بەلام ئەو خوێندنە هیچ کەڵکێکی نابێ، چونکە ئەو چوار ساڵە بە گاڵتە دەباتە سەرێ و لە خانەقای شێخی بورهان کە ٨-٩ نەفەر دەبن، جگە لە هەژار و هێمن تەوای خاڵۆزا و پوورزا دەبن، پاشان دەچێتە لای مامۆستا فەوزی و ڕێگای ژیانی پێ نیشان دەدا و ساڵ و نیوێك لە لای ئەو دەرس دەخوێنێ.

هەژار لە پێشەکی دیوانی سەیفولقوزاتدا، بەم جۆرە باسی خۆی و هێمن دەکا:

هێمن و من دوو منداڵی کرچ وکاڵی لەڕ و قرخن، بە تەمەن دە دوازدە ساڵ بووین، لە خانەقا گەیبووینە یەك، نا خێری گیانمان دەرس بخوێنین، خوێندنی چی؟ دوو گێل و حۆلی پەڕ بلاو، لە یەك دەمدا لە لای دوو مامۆستا دامەزراین، یەکی ریش پان، لە عەرەبی شارەزایە و خەتی نییە، ئەوی دی گەردەلێ، فارسی زانە و خەتی خۆشە. جا وەرە شەق و دار بخۆ، خۆ جنێو هەر باسی ناکرێ، سوێندی کەسم لە سەر نییە، ئەگەر بڵێم تلپاتی تەڕیش فێر نەبووین، نیسکێك درۆی تێدا نییە، ماڵم هەقە لە ترێ دزینی ناو رەزی، لە پلار دەداران گرتن، لە راوی دووپشك و ئەسپێ و کێچ و جوجە و قوڕ شێلان و هێلکە لە هێلانە دەرهێنان، هیچ کەس تۆزی نەدەشکاندین. بۆ نەگبەتی هێمن وە شیعر هاتبوو، هەروا گارە گارەی

دەهات، جار و بارە شیعرێکی نیوە و کۆڵەی خواری لاپانی دادەنا، بە فیزەوە نیشانی دەدام.
یانی ها بم ناسە، من چیم، منی کلۆڵ نەمدەتوانی میعریش بکەم.

بەو جۆرە شیعر گوتنی هێمن لە خانەقاوە سەری هەڵداوە و پێگەیشتووە. لە گوندی کولیجە لە لای سەید عەولای سەید مینە کە پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، بەڵام زۆر زانا و تێگەیشتوو دەبێ ،ماوەیەك دەرس دەخوێنێ و بە گەورەترین مامۆستای، مامۆستا هێمن حیساب دەکرێ. تەمەنی هیمن دەچێتە سەر و بۆ ئەوەڵین و دوایین جار لە گوندی کولیجە عاشق دەبێ، عیشقێکی پاك و خاوێن و ئاسمانی، بەڵام ئەم عاشقبوونە زۆر ناخایەنێ و لێك جیا دەبنەوە و هەر لەو گوندە فێری سواری و تەقڵە و راوە کەو و کەروێشك دەبێ.

ساڵی ١٣١٧ی کۆچیی هەتاوی کە تەمەنی ١٧ ساڵانە دەبێ، مامۆستاکەی گوندی کولیجە بە جێ دێڵێ و ئەویش دەگەرێتەوە بۆ گوندی خۆیان واتە شیلاناوێ کەماڵیان چووبووە ئەوێ و مل لە کار و کاسبی هەڵدەکێشێ و بە ڕۆژ خەریکی کاری کشت و کاڵی دەبێ و شەوانە خەریکی خوێندنەوە و شیعردانان، باوکی پێی دەزانێ و دەفتەری شیعرەکانی دەسووتێنێ.

### ژیانی سیاسی

ناوی هێمن دەگەرێتەوە بۆ ئەو زەمانە کە لە کۆمەڵەی ژ-کاف و کۆماری کوردستاندا وەکوو پێشمەرگەیەك خزمەتی بە نەتەوەکەی دەکرد و لە نێو تێکۆشەرانی ئەو سەردەمە کە هەر یەکەی ناوی نهێنیان هەبوو، بە هێمن ناسرا و هەر وەکوو بۆخۆی دەڵێ:

شاعیری هیچ قازانجی بۆ من نەبووبێ ئەو قازانجەی هەبووە کە ئەو ناوە دوورودرێژەی «سەید محەممەد ئەمینی شێخەلئیسلامی موکری» بۆ من کورت کردەوە بۆ یەك ناو بۆ هێمن

لە ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢١ی کۆچی هەتاوی لە شاری مەهاباد کۆمەڵەی ژ-کاف بە دەستی ڕەحمانی زەبیحی وچەند کەسی دیکە دادەمەزرێ. هێمن دەبێتە ئەندامی ئەو کۆمەڵەیە و شەو ورۆژ لە بیری ئەوەدا دەبێ کە چی بۆ ئەو کۆمەڵەیە بکا کە کاری ڕزگاری کوردستانە، هێمن لەو کۆمەڵەیەدا دەبێتە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری نیشتمان و دواییش گۆڤاری ئاوات. لە ساڵی ١٣٢٤ی کۆچی هەتاوی کە لە سەر بناغەی ژ-کاف، حیزبی دیموکراتی کوردستان بە ڕێبەرایەتی قازی محەممەد دادەمەزرێ .

هێمن بۆ یەکەم جار لە مزگەوتی سووری مەهاباد لە بەرامبەر خەڵکدا شیعر دەخوێنێتەوە و دەبێتە سکرتێری هەیئەت رەئیسەی میللی دیموکرات و دوایە لە کۆمیسیۆنی تەبلیغاتی حیزبدا دەست بەکار دەکا. لەو کۆمارەدا بۆ دانانی کتێبی کوردی بۆ فێرگەکانی کوردستان کاری کردووە، لە گۆڤارەکانی ئەودەمی حیزب وەك کوردستان، هاواری کورد، هاواری نیشتمان، گڕوگاڵی منداڵان و هەڵاڵەدا شیعر و وتاری بڵاو کردۆتەوە. لە کۆماری مەهابادا پێشەوا شانازی پێوە کردووە و رایگەیاندووە کە شیعرەکانی پڕ مانان ودەبێ تەواوی ئەندامانی حیزب لە بەری بکەن و بیکەنە پرۆگرامی تێکۆشینی خۆیان.

هێمن هەر لە پلەی یەکەمی تێکۆشانیدا وەك شاعیرێکی نەتەوەیی و کـــــۆمەڵایەتی بیر و باوەڕی

خەڵکی بۆ لای خۆی راکێشابوو، چونکە هەڵبەستەکانی لە راستەقینەدا ببوونە ئاوێنەی دڵی کۆمەڵانی گەل و دەربڕی بیر و ئاواتیان. هێمن هەر لە رۆژی یەکەمی تێکۆشانی هونەری خۆیەوە بۆ خاوێن کردنەوە و پەرە پێدانی زمانی زگماکی قۆلی هەڵماڵی. هەڵبەستەکانی بە زمانێکی ساکار دەهۆنییەوە و بەزمانی گەل دەدوا، جا بەو بۆنەوە پێشەوا پێی سپاردبوو، کە بۆ گەلێك وشەی فارسی و عەرەبی کە لە رێڕەوی خەباتی سیاسیدا بە کار دەهێندرێن، وشەی کوردی پەتی بدۆزنەوە و بەکاری بێنن، هێمن بە سەرۆکی کۆمیسیۆنێك کە بۆ ئەو کارە دیاری کرابوو، دانرا، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بە داخێکی زۆر گرانەوە کۆمار دەڕووخێ و هێمن دەڵێ:

(( ئەو رووداوە دڵتەزێنە و ئەو کارەساتە جەرگ بڕە هەموو کوردێکی بە شەڕەفی خەمناك و تازیەبار کرد)) .

ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی هەتاوی دایکی پێ لە کەوشان دەکا و پێی دەڵێ: دەبێ ژن بێنی، بەڵام هێمن نایەوێ ژن بێنی" بەهەر جۆرێك بێ، دایکی، هێمن رازی دەکا و داوای برازایەکی خۆی بۆ دەکا و هێمن قەتی نەدیوە، بەم جۆرە لە٢٥ی خەزەڵوەری ئەو ساڵەدا بووکی بۆ دادەبەزێنن و هەژار لە زەماوەندەکەیدا هەڵدەپەڕێ و بەرهەمی ئەم ژن هێنانەش کوڕێك بە ناوی سەلاح دەبێ. ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی هەتاوی وشکە ساڵی پێش دێ و ئەویش وەك خەڵکی دیکە دەکەوێتە چەرمەسەری و ناڕەحەتییەوە و گرانییەکی بە تەوژم ئێران دادەگرێ، زۆر کەس لە برسان دەمرن و خەڵك لەو ساڵەدا کوللێرەی جۆ و هەرزن دەخۆن.

لە ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی هەتاوی کۆبوونەوەیەك لە مەیدانی شاری مەهاباد پێك دی وهێمن شیعری دەبرۆ ئەی شاهی خائین، بەغدا نیوەی ڕێت بێ دەخوێنێتەوە. لە کودەتای ٢٨ی گەلاوێژی ئەو ساڵە هێمن بە تەواوی قاچاغ دەبێ و ماوەیەکی زۆر بە کێوانەوە دەبێ و ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی هەتاوی باوکی دەمرێ و هێمن دەڵێ:

(( دەردی باب مردن، دەردێکی زۆر گرانە و پیاو لە هەر تەمەنێکدا بابی بمرێ، هەست بە هەتیوی دەکا )) .

دوو ساڵ دوای باوکی، دایکیشی دەمرێ و ئەم ڕووداوانە بە تەواوی پیری دەکا.

**لە دوای شۆڕشی ئیسلامیی ئێران**

بۆ جارێکی دیکە هەوای نووسینی گۆڤار بە مێشکی دادێ و بەهاری ساڵی ١٣٦٤ی کۆچی هەتاوی بەردی بناغەی گۆڤاری سروە لە شاری ورمێ دادەمەزرێنێ و یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە لە سەرەتای هاوین گەیشتە دەستی خەڵك و هێمن ئەمە دەڵێ: ئومیدەوارم ئەم سروەیە هەر بێ و هەر دڵان ببووژێنێتەوە و هەر گوڵان بگەشێنێتەوە و هەر دڵی کوردان خۆش بکا.

هەژار هەر لەو کاتەوە چاوی کردووەتەوە و خۆی ناسیوە و کەوتووەتە ناو کۆمەڵەوە . ژیانی لە ئەوپەڕی ئاوارەیی و دەربەدەری بردووەتە سەر وەکو خۆی دەڵی (( سی و چەند ساڵی تەمەنم دەربەدەر و ماڵانگەڕ بووم ، نزم و بەرز و پیس و پاك و بەد و چاکی زۆرم دیوە ، بەدەردی کوردە گوتەنی دونیام قونەکە و کردووە و بۆ نانە وشکی ڕۆژانە و بۆ بێ خەوێکی شەوانە لە شاگر مەیخانە چیبەتیبەوە بگرە تا عەنباڵی و قوڕەکاری و گسک لێدانی ماڵان و کاشی ماڵی و ئامان شووشتن )) .

**بەرهەمەکان**

**دیوانی هێمن بە ناوی ناڵەی جودایی (١٩٧٩).**

دیارە هێمن مردووە و لە نێومان دا نەماوە، بەڵام ئاسەوارەکانی و یادگارەکەی کاتی پیری هەر ماون و بە دیتنی ئەوان هیچ کاتێك هێمنیش لە بیر ناچێتەوە.هێمن شاعیرو زانای فەرهەنگ دۆست و تێکۆشەری ڕێگای بووژاندنەوەی کورد و فەرهەنگەکەی بوو، خاوەن بیر و تێفکرین و بیر کردنەوە بوو. هێمن دەنگی بەرزی ئازادی، ئاشتی و دیموکراسی خوازی کورد بوو. خوازیاری یەکیەتی گەلان بوو.

کوردایەتی هێمن، مرۆڤایەتی بوو. شاعیری جوان پەرەست، شاعیری بابردەڵە، کە بێبەش لە ئاو وخاک و وڵاتی خۆی، پەڕیوەی سنوور و موبتەلای دەستی ڕۆژگار، پیری هەناسە سوار، دەرکراوی بە زۆر دابڕاوی یار و ئازیزانی، بولبولی بێبەش لە گوڵزار و چەمەن، بێ ئەنیس و هاودەم، عاشقی دڵ پڕ لە ئەوین و خۆشەویستی وڵاتەکەی، هەنگاو بە هەنگاو خەم بە دوای مامۆستای ئازیزەوە بوو، وەکوو سێبەری خۆی ڕۆژێك لێی جیا نەبۆتەوە و ڕۆژی شادی ڕووی لە دڵە خەمبارەکەی نەکرد، ئەو مرۆڤە بێ ئازە خۆ لە ئاسن و پۆڵا دروست نەکراوە، بەڵکوو لە خوێن و گۆشتە، بۆیە پڕ بە دڵی خۆی ئەناڵێنێ و بە ئاوازێکی بە سۆزەوە ئەڵێت:

پارچە گۆشتێکە، دڵی من روو نیە ناڵە ناڵی من درەنگە زوو نیە

لە شیعرێکی دیکەدا دەڵێ:

شینم زۆر گێڕاوە، شادیم کەم دیوە ئەڵێن هەیە، بەلام نەمدیوە

شاعیر، شینی یەکجار زۆر دیوە، بەڵام شادی و کامەرانی بە دەگمەنیش نەدیوە و ئەزانێ شادی هەیە، زۆر کەس لە گەڵیا راز و نیاز دەکەن، بەڵام هێمنی خەمبار هەر نەیدیوە، لە لای هەر وەکوو نامۆیەکە، وەکوو دوژمنێکە، بۆ ماوەیەکی کەمیش روو لەو ناکات. مامۆستای بەڕێزمان شیعرە تەڕ وناسکە جوانەکانی، زۆربەی زۆری بە خەم زاخاوە، خەم کاری زۆری تێکردووە، بۆیە بە هیچ جۆرێ ناتوانێ خۆی لە شەپۆل لابدات.

هێمن شاعیری گەل ، شاعیری عیشق و ئازادی، دڵە گەورەکەی هەتا ئەو ڕۆژەی لە لێدان کەوت، بۆ گەلەکەی و ئازادی نیشتمان لێی دا.

بە فەرموودەی خۆی:

هەتاکوو دوا پشوو ڕێبواری ڕێگەی عیشق و ئازادیم ئەگەر بێجگە لە ناکامیش نەبینم، بەرهەمێکی تر

نمونەی هۆنراوەی نەتەوەیی

کوردم ئەمن

گەرچی توشی ڕەنجەڕۆی و حەسرەت و دەردم ئەمن

قەت لە دەست ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن

ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نیم

ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لە سەر هەردم ئەمن
من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نیە
لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا ئەڵێم کوردم ئەمن

هێمن کە یەکێك بوو لە گەورەترین شاعیران و نووسەرانی کورد لە سەدەی بیستەمدا، لە باری پاراستن و بووژاندنەوەی فەرهەنگ و ئەدەب، گەورەترین هەقی خستۆتە سەر نەتەوەکەی، چونکە لە تاریك وروونی بەیانی ژیانیدا، بۆ خڕ کردنەوەی کۆماکانی ئەدەبی کوردەواری و ورد بوونەوە لە وشەکانی، بە کەو کردن و هەڵاواردنی غەوارەکانی و سوورکردنی خەرمانی زمانی کوردی، کەوتە کار و تەنانەت گوڵ هەڵگرتنەوە و پاشەرۆکیشی بۆ خەڵکی دیکە نەهێشتەوە.

ئاسەوارەکانی مامۆستا هێمن بریتین لە:

١. تاریك و روون (شیعر و پەخشان). ١٩٧٤
٢. پاشەرۆك (شیعر و پەخشان).
٣. توحفەی موزەففەرییە(فۆلکلۆری کوردی، کە کاری ئۆسکارمانە وهێمن وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی).
٤. شازادە و گەدا .
٥. قەڵای دمدم .
٦. هەواری خاڵی .
٧. چەپکێ گوڵ، چەپکێ نێرگز.
٨. ئەفسانە کوردییەکان (کاری قەنات کۆردۆ کە هێمن وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی).
٩. ناڵەی جودایی ، شیعر ١٩٧٩
١٠. پاشەروکی مامۆستا هێمن ، کۆمەڵە وتار، مەهاباد ١٩٨٣

بە ئاوارەیی و دەربەدەری توانی کتێبی ناڵەی جودایی بنووسێ، ئەگەر بە جوانی لێی ورد بینەوە، دەبینین کە ناڵە و هاوار و فیغانی دڵە، ناسۆرییە، خول دانەوە و نزا و هاوار و ئازاری ناخ و ماندوویەتی هزر و نائارامی رۆح و بێ تاقەتی جەستەیە بەرامبەر جودایی،جودایی لە خێزان، لە خانوو، ماڵ و گوند و گەڕەك، شاخ ودەشت و دراوسێ و

کەس و کار و یادگارەکانی سەردەمی منداڵی و لانەی گەورەبوون و گەلێ شتی بە نرخی دیکە کە لە یاد ناکرێن ولە دەروون دوور ناکەونەوە.

کۆچی دوایی ...... هێمن لەو کەسانە بوو کە تەمەنی مێرمنداڵی و لاوی و پیری خۆی لە سەنگەری فەرهەنگ و ئەدەب و فۆلکلۆر و شۆڕشدا بەخت کرد و وەك مۆم سووتا و ڕێگای پاشەڕۆژی بۆ رووناك کردین. پاش دەرچوونی چوار ژمارە لە سروەی ڕەنگینی کوردستان، مۆمی ژیانی هێمن دوایین فرمێسکی هەڵوەراند و لە٢٩ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٦٥ی کۆچی هەتاوی بۆ هەمیشە ماڵاوایی لێکردین و لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی بوداق سوڵتانی شاری مەهاباد بە خاکیان سپارد.

ئەمن دەمکوت لە دونیا تا بمێنـــــم

لە بە رکە س ئەستەمبا سەر دانوێنـــــم

کەچی ئێستا لە داوی بسکی تـــــۆ دا

گرفتارم گوڵم مــــــــوو ناپسێنـــــم

ژیانم پڕ لە ڕەنجە و نامــــــــــرادی

بە هەڵکەوتیش نەهاتم تووشی شـــادی

دڵم هێندە تەنگە هەرجێی تۆ دەبێ و بەس

ئەتۆش مەحکوومی حەپســـــی ئینفیرادی

قەرار بوو بێی لەگەڵ خۆت شادی بێنی

نەهاتی گەرچی پێت دابووم بەڵێنـــــی

لەناو کوردا نەبوو پەیمان شکێنـــــــی

لە کوێ فێر بووی گوڵم پەیمان شکێنی؟

ئەگەرچی ڕۆیی قەت ناچی لە یـــادم

دەکەم یادت بە یادی تۆوە شـــــادم

کە بارگەت بۆ هەوار تێك نا عەزیــزم

شکا ئەستووندەکی تاوڵی مــــرادم

هێمن لە ساڵی ١٩٤٢ ئەم هۆنراوەی ووتوە ..

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن

قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمـــن

ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خـــاڵ نیـــم

ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمـــــن

گەر لە برسان و لە بێ بەرگی ئیمرۆ ڕەق هەڵێــــم

نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمـــــن

من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نیـــــە

لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمـــن

ئەم پارچە هۆنراوەی لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری مەهاباد وتووە ...

کۆیلەتی باوی نەماوە، کیژی کوردی خۆشەویست!

ڕاپەڕە، هەستە لەخەو، ئاخر چ وەختی خەوتنــە !

دەرکە بشکێنە، پەچە بدڕێنە، ڕاکە مەدرەســـە

چاری دەردی کوردەواری خوێندنە، هەر خوێندنـە

...دایکی زانایە کوڕی ئازا دەنێرێتە خەبـــات

من گوتم تۆش تێبگە(ئاگاتە دەریایە زنـــــە)

گوارەکەی زێڕت بەکار نایە، لە گوێ بگرە قسەم

لایقی گوێی تۆ عەزیزم شیعری سادەی (هێمنـە)

چارە نووسی شاعیر

بەهاربووفەسلی زستانم،ئەگەر یارم لەگەڵ بایـــە

درویەگەرگوتوویانەیەخونچیکی بـــــەهارنایـــە

لەبارانی مەپرسەتاهەوریکری بــــــەری ڕوژی

...دەبی بگریم هەتارووی تولەژێر چارشیوی رەش دایە

هەناسەم لادەداچاشیوو رووبەندی رەشت ئـــاخر

هەورهەرچەندەبریی کواحەریفی قودرەتی بایـــە!

## بێسارانی
## ڕۆژهەڵاتی کوردستان
## (١٠٥٣ -١١١٤ ك) (١٦٤٠-١٧٠٢ ز)

مەلا مستەفای بێسارانی هۆنراوەنووسێکی بەناوبانگی کوردی شێوەزاری هەورامی بووە.

### کورتەی ژیان

مستەفای بێسارانی کوڕی مەلا قوتبەدین کوڕی مەلا شەمسەدین ساڵی ١٠٥٣ی کۆچی (١٦٤٣ یان ١٦٤٤) لە گوندی بێساران لە ناوچەی ژاوەرۆ (ئێستا لە شارستانی سەوڵاوادایە) لەدایکبووە. سەرەتا لای باوکی و پاشان لە نۆدشە و پایگەلان و سنە دەرسی مەلایەتیی خوێندووە. دوای وەرگرتنی ئیجازە گەڕاوەتەوە بۆ بێساران و تا دوایی هاتنی ژیانی لە ساڵی ١١١٣ی کۆچیدا (١٧٠١ یان ١٧٠٢) وەك مەلای گوندەکە لەوێ دەمێنێتەوە لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی پیرەهەژار لە نزیکەی سەوڵاوا بە خاکی ئەسپێرن.

بە زمانە شیریەکەی کوردی شێوەی هەورامی گەلێ هۆزانی ناسك وبەرزو پڕ لە ماناو سەروەریدا نوسیوە بێسارانی لێرەدا دەڵێت.

قیبلەم بە حەیفەن وێنەی تۆ سایـــی    بگیرۆ نە دڵ خەشـــمی جودایـــی
ئەگەر گوناهێ وەنمەگەری بـــــارا    یەسەر ، بەشمشێر، بە تەناف بە دارا
وەگەر نەحەیفەن بە واتەی بەدگـــۆ    نە پەردە مانۆ رازی مـــن وتـــۆ

چەندە بە مەزنی وجوانیوە گازاندەی خۆی دەکات و بەو شیوەیە جوانی و زۆر لە بار وگەواراوە دەردی دلی خۆی بۆ پادشای ئەو سەردەمانەوە هەڵدەڕێژێت و دلی خۆی زۆر بە گەورییوە شاد دەکات.

لە پارچەیەکی تری هۆزانەکانی ئەو مەلاو سەیداو سەروەرە، خامە ڕەنگینەکەی لە دەست دەگرێت و بە دڵێکی پڕ لە مەزنی و گەورەییەوە ڕوو لە یارەکەی خۆی دەکات و دەڵێت:

شیرین زولف لول... شیرین زولف لـول    فیدای زولفت بام، گا، گرژەن گا لـول
گا چوون سیاو مار پەشێوەن مەلــول گا وێنەی لاولاو مەپێــچوون نە تـــول
گا، تــاتان نە دەس گەردش سەمــال    گا خـەفتەن ســاکین نە دەوران خاڵ
گاهێ پەشـــیوەن، گاهێ گرنجـــەن    گاگا گـرە بەند ملە مای ڕەنجـــەن

دەبینین چەند بە جوانی و هەستی پڕ لە خۆشەویستیە باس لە سیمای یارە خۆشەویستەکەی خۆی دەکات و چلۆن پیی دا هەڵدەڵێت، کە لە گەلێ لە هۆزانەکانی کالسیکی پیدا هەڵگوتن بە ئەوین وخۆشەویست و کەسایەتی زۆر باو بووە .

بێسارانی لە دووری یارەکەی خۆیەوە دەردی دڵی خۆی ئاوا دەربڕیوەو لە پارچە هۆزانێکی تریدا ئاوا و دەلیت:

قیلەم چیس مەبۆ تایی جــەو زولفە

جەو زولف، وەشـــبۆ لول سـەر کلفە

وەزیم لە گەردەن، عەمرم وەبرە دەم

تەجدید بپ، دەفــع هوناوان وەردەم

لە پارچە هۆزانێکی تری دا لەو دەمەوە کە لە بیساران دوور دەکەوێتەوە، باس لە زێدی خۆی دەکات و لە دووریدا دەلێت: هەمیشە چاوم تەژی ئەسرینی دووری تۆیە و دەفرمەێت:

چەوساو دیدەم دوور کەفتەن جە تــۆ

لێـــــلاویش لێکەن لێـلاوتر مەبــۆ

ڕۆشـــنی بسات، وەنەم. بیەن تـــار

زنـدەگیم تاڵەن وێنەی ژاری مـــار

کەسێ بەیتەور حاڵی جەستەش بــۆ

پێشـــە جۆیای تۆ ئاوات واتەش بــۆ

خاسش هـەرئێدەن مەرگش میهمان بۆ

مەگەرئەو مەرگ دەردەش دەرمان بـۆ

لە هۆنراوەیەکی تردا چەند بە ناسکی هەستی خۆی دەر دەبڕێت و لەم هۆزانە کلاسیکیەی دا، ئاوا دەڵێ ...

چلێ بە پـــەنا چلێ بە پـــەنا

چلێ چون ڕەقیب مەدران بە پەنا

هورئامان مەدران نەروی تەمەنــا

مەرباد بە قودرەت بدەرۆش فەنــا

وەبار قـودرەت لە تار لە تار بـۆ

نـاز و بالای قیـلەم دیار بـــۆ
بسووۆزی باهەر بازدیی سـەحـــەر
ریشەش جە زەمین بەرباروٚ وەبـەر
تابالای قیلەم چون شەمع خانان
بویـــنۆ وەچـەم نە بەرزە بـانان

ئەم شاعیر مەزنە واتە سەیدا بیسارانی مامۆستایەکی زاناو بلیمەت و زۆر بە توانا بووە دەتوانین بلّێین کە ئەو زاتە گەورەیە دلّدارێکی دلّ پر جۆش و هەستی پاك وبێگەردی زۆر بلّندی هەبومو فەیلەسوفێکی ئاینی بووە ، کە مامۆستای گەلێ لە هۆنەرانی بەرزی کورد بووە، کە دیوانە نایابەکەی پڕ لە هەستی ناسك وجوان و مانای قول لە خۆشەویستی و پیاهەلّگوتنە.

**مانیفێستی هونەری-ئەدەبی لیریکای بێسارانی**

بێسارانی شاعیری مەزن و ناسراوی سەدەی هەڤدەی زایینی، میراتبەری «کرکەی هورمزگان» و پەرەپێدەری مۆسیقای رەسەن و مامۆستا و «بەستەی فەرد»ی مەولەوی .

وەك ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە نێو ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا دەدرۆشێتەوە. زوان و ئەدگاری هۆنراوەکەی نەرم و پاراو و فولکلۆریکە، ئەندێشە هونەرییەکەی سادە و پڕواتا، مەدلوولە هۆنراوەکانی پرشۆر و هەست ئامێزن.

ئەوەی بۆتە هۆی مەزنی و ماننەوە و دەگمەنیی و جیلوەبەخشی ئەم هۆنەرە لە حەوزەی لیریکای کوردیدا، هەندێ ئەدگاری ئەدەبی و چەپکێ شێوازی هونەرییە، کە ئەم هۆنەرە لە رەوتی ئەدەبی باو و ژاواندنەوەی فورم و ناوەڕۆکی ئەدەبی زالّی وەخت بە سەر شیعر و ئەدەبی بندەستی کلاسیکی کوردیدا جیادەکاتەوە. لەم وتارەدا بە شێوەی دێڕنامێز و بابەتیانە ئاماژە ئەکەینە ئەم مێتۆدە ئەدەبی و شێوازیانە وەك مانیفێستی هونەری – ئەدەبی بێسارانی:

(١) پەرەپێدانی بزاڤێکی هەمەلایەنەی ئەدەبی لە سەر ساکاری زوان و واتای فۆرمی «کرکە» -خێرایی دەنگ و هێشوە دەنگ intensite توخمی تەکیە accent لە سیستەمی مۆسیقایی برگە- کە پێشتر لە «هورمزگان» و «ئورامنەکانی بابا تاهێر» و دەقە «یارسەکان»دا سەریهەلّدابوو.

(٢) کاردانەوە و کاریەخشی لە شێوەی دەربڕینی شاعیرانی پاش خۆی، وەك رێچکە و مەنهەجی فیکری ئەدەبی. مەولەوی هونەرەکەی بێسارانی وەك «بەستەی فەرد» ناو دەبات وەك دەڵێ :

(بێسارانی) یەن نە تۆی فەرد مـــــن
خەم چەنی خەمان زوو مەبۆ ساکـــن
نەوات وێرانەی دڵ کەرۆ ئــــــاوا
چەنی «بەستەی فەرد» بێساران مـاوا

(٣) دەستپێشخەری لە رسکان و فراژوێ کردنی هونەرێکی ئەبستراکتی(زەینی) لە سەر مێتافیزیکای زوان و هەستامێز لە هەندێ موتیڤ و وێنەدا بە دەست بردن بە چەشنێ وەسف و گیانبەخشی شتەکان.

٤ -خورپە و قۆستنەوەی دیاردە سروشتییەکانی هۆرامان و بەشتکردنیان لە رێگای پرۆسەی داهێنان لە مێکانیزمی خەلاقدا.

٥ -وەلاوەنانی چەمکە فۆرم و ناوەرۆکییەکانی ئەدەبی باو و زاڵی سەردەم و وەرگرتنی جەوهەرە ئەدەبییەکانی خۆماڵی.

٦» -خەزانییە» وەك دیاردەیەکی تاکی و شێوازی هونەری و بە گەڕخستنی چەپکێ وێنەی پاییزی، ئاوێتە لە گەڵ نۆستالۆژی و لاواندنەوەی پیری و پەککەوتەیی دەروونیاتی خۆی کە رووبەری ئەم کارە جاڕدەرە بۆ چەشنێك رووکردی رۆمانتیکی.

٧ -خولقاندن و کەشفی هەندێ واژە و دەستەواژە و لێکدراوە و مۆتیڤە شیعر لە چنراو و تان و پۆ و بەکگراوندی دەقەکەیدا کە رێگا خۆشکەرن بۆ شێوازێکی تاکی بە ناو ((شێوازی بێسارانی)) .

٨ -بەزاندنی بازنەی قۆرخکراوی بڤەکان بە دەس و باڵی ئاوەڵا و رەها لە رسکاندن و داهێنانی زمانێکی جیاواز و بەرخوردی نامۆ و ناموتەعارف لە گەڵ توخمەکان لە وێنە لیریکییەکان و لادان لە هەندێ رێسای چوارچێوەدار و توتالیتەی بازنەداری زوانی زاڵ، واتە کەڵك وەرگرتن لە واژەگەل و توخمگەلێك کە نین لە ناو بازنەی ئەدەبی پاوانکراودا" کە بە جەسارەتەوە رۆ چوەتە نێو دڵی فەزای ئێرۆس ئامێزی پاوانکراو. کەچی ئەم گوربزی و جەسارەتە دوای بۆتە ئەدگارێك بۆ شاعیرانی کورد بە تایبەت شاعیرانی هەورامی بە چەشنێك کە دەسەڵاتی ویراژدانی زوانییان زۆرتر هەبێ. با ئەوە بزانین ئەم رووکردە

حكمەنە لە سەرتاسەری ئەدەبی زاڵی فارسی و عەرەبیدا. بەڵگەی توكمە" چامە لیریكا ـیرۆس ئامێزەكانی بێسارانی و مەولەوی و سەیدی و هەردی و هتد... لە ئەدەبی كوردیدا ، ـوەك دەڵێ...

| | |
|---|---|
| چراغ جەی دنیا، چراغ جەی دنیـــا | ئەوەند ئاواتم، مەندەن جەی دنیـــا |
| وەرتەر جە مەردەیم، بە دیدەم بـدیا | لەب وە بانی لەب لاڵی تۆم بنـــیا |
| هەردوو بنیامان سەر وە یەك سەرین | گەرداماں رازی ویەردەی وەریـــن |
| بۆ بنیام نە بۆی زوڵف مشكینـــت | بكەردام تەواف، كەعبەی جەمینـــت |
| بدیام دەستی تۆم شیەن نە گەردەن | دەرسات مەواستم، ئاوات وە مەردەن |
| باڵای وێم پەخشان باڵات بكـــەردام | حەسرەت نەمەنێ ئەگەر بمــــەردام |

٩ -ئاشنایەتی لە گەڵ دنیای ئەدەبی فارسی سەردەمی «سەفەوی» وكاردانەوەی بنەما فیكری و ئەدەبییەكانی شێوازی «هێندی» لە سەر ئەم شاعیرە و قۆستنەوەی چرپە هەستئامێزەكان و وێنە كەسێتیبەخشەكانی ئەم شێوازە نەك خاڵە سست و بێ مایەكانی ئەم رەوتە كە لێوانلێون لە عەوام ئەندێشی و رووكردی ناواقیعی هەندێ لەو شاعیرانە.

١٠ -پێشاهەنگی و دەسپێشخەری و پراكتیزەكردنی تیۆری خۆماڵی «رۆمانتیزم» لە رەوتی شیعری كلاسیكی كوردیدا. لێرەدا مەبەست ئەو فاكتە ئەدەبی – هونەرییەتە كە لە دەقەكەیی بێسارانیدا بەدی دەكرێ و دێنە هەڵێنجاندن، پێشتر لە ئەدەبی كلاسیكماندا بەو خەسیەتە بەرچاو ناكەوێ، نەك رەوتە فیكری و ئەدەبی و هونەرییەكەی ئەورووپا، كە پەیوەستە بە هەندێ پێش زەمینەی فیكری و فەلسەفی و پەیلواكانی بیرمەندانی رۆژاوا كە وەك قوتابخانەی رۆمانتیزم باسی لێو ە دەكرێ.

١١ -پێداگری لەسەر فۆرمی «مەسنەوی»-كە فۆرمێكی رەسەنی كوردییە- و جەخت لە سەر مێتۆدی(هێڵی ئەستوونی) لەم قاوغە شیعرییەدا و لە ژێر تیشكی ئەم تەكنیكەدا، باشتر دەتوانێ ویراژی هونەری بدات و وێنەیێكی گشتی و هارمۆنیایی بكێشێت. ئەمە نەریتێكی بەجێماوە لە ئەدەبی خۆماڵی و تەسلیم نەبوونە لە بەرامبەر مەنهەجە شیعری فارسی و عەرەبی كە زۆرتر «قەسیدە و غەزەل»یان-لە مانا رواڵەتیەكەیدا- بەكار هێناوە و كایە زمانیەكان زۆرتر لە هێڵی ئاسۆییدا سەریگرتووە كە ئەمە قۆرخێكە بۆ بەستنەوەی مانۆڕ و خۆنواندنی شاعیر كە نەتوانێ لە بازنەی وێنە و خەیاڵی پێشوەخت دەرباز بێ و باڵەكان ببەزێنێ. پێشتر باسم لە سەر ئەكتیوی و دینامیزمی ریتمی شیعری گۆران و «تەكنیكی

هێڵی ئاسۆ و ئەستوون» کردوە و لێرەدا باسەکان دووپات ناکەمەوە. لەم نموونەدا، شاعیر لە ڕێچکەی بەختی ناڵەباری خۆی باس دەکات، کە چۆن گڕەتاوێك نیشتۆتە هەناوی و پرووزەی لێ نیشتوە، بۆ کوژاندنەوەی گڕەکە، داوای ئاو دەکات بەڵام لە جێی گۆزەی ئاو نەوتی ئەدەنێ و تا بەیان دەسوتێ و جەستەی ئەبێ بە سفتە کۆ و با وەك تۆز دەیبا و مەحفی دەکاتەوە. ئەم وێنە هەر لە ئەوەڵ بەیتەوە تا دوایی شیعرەکە لە ئەستوونی دێڕەکاندا (ریتم)ی زوان و (تێم)ی بەیان دەبینرێ.واتە شاعیر تەنیا لە یەك مەبەست و وێنەی سەرەکی کە لە توخمی گێڕانەوە و چیرۆك کەڵکی وەرگرتوە، باس دەکات، نە ئەم لق و ئەو لق کردن.

ئیمشەو ئایرێ گرِبەست نــــە دەروون          بڵێسەش یاوا وە سەقف گـــــەردوون

جە گڕەی ئایر، جە بڵێسەی نـــــــار          ستێزام چوون بەرق، ئاو کەردم هـــاوار

جە هاوار هاوار، شفا و لاڵەی مــــــن          جە هەی ئاو هەی ئاو، شین و زاڵەی من

تەمز مەژنەوۆ یەك خودا تەرســـــــــێ          موسڵمان سفەت رای خودا پەرســـــێ

مەشۆ ماوەرۆ گـــــۆزەی بیـــت المالْ          مەشانۆش وە رووی گرِبەستەی شەمـــالْ

پێسە مەزانۆ یە گـــــۆزەی ئـــــاوەن          تەمز خۆ یە نەفت گۆی تەوەن تـــاوەن

گۆزەی نەفتش کەرد وە بڵێسەمـــــدا          قرچەی گۆزەی نەفت وە ستێزەمـــدا

هەرتا سەحەر بی، هەر سۆزام بە ســۆز          سەحەر سفتە کۆم، با بەردش چوون تۆز

هەر کەس وێنەی من ئیقبالش چەفتـەن          نەواچۆ هەی ئاو، نەسیبش نەفتـــــەن

١٢ -تەوژمی خەیاڵ لە شیعرستانی بێسارانیدا: بێسارانی لە داهێنانی شیعردا گەلێك لێهاتوانە و زانیارانە لە گەڵ «خەیاڵ»دا دانووستاندنی هونەری کردوە. لە سەر لۆژیکی هونەری زانیویەتی چۆن خەیاڵ لە میکانیزمی خەلاقدا، بوروژێنێ و لە هەمبەر واقێعیەتە دەرەکیەکان، ببێتە خالقی بزێوترین شاعیری وێنەکار لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا. یەکێك لەو هۆکارانە کە من بێسارانیم بە «قوتابخانە» و خاوەن شێواز داناوە ئەم ڕێچکە هونەری-ئەدەبیەتە. بێسارانی لە سای ئەم رووکردەدا دوو دنیای «ئەنفوس و ئافاق« یان «خەیاڵ و واقێع»ی پێکەوە گرێداوە و بۆتە خاوەنی ئەدگار و شێوازی ئەدەبی ئەویش لە پانتایی ئەدەبی بزاوتووی گۆراندا. چما پرۆسەی داهێنان هەر لە پەیوەندی لە گەڵ دنیای دەرەك و ئۆبژێکت تا هەڵسووڕاندن لە نێو میکانیزمی خەلاق تا ژانی شاعیرانە و ئەنجا لە دایکبوونی کۆرپەی شیعر و بە ئەنجام گەیاندنی دەرەوەستی(تعهد)ی شاعیرانە و سەربەخۆیی دەق و ... لەم چامە شیعرییەدا دێتە هەست پێکرن: خەیاڵ بە مانای بیرکردنەوە و رامان، imajinairy، واتە: (خەیاڵبەندی ، نەخشی زەینی) لەم پرۆسە زەینییەدا و داهێنانی

حقێکی «فۆرمالیستی»: ئەم دێڕە شیعرییە بە لایەنەوە، دەبێتە «مانیفێستی» وزەی داهێنانی بێسارانی لە پرۆسەی لیریکای کوردیدا:

سەرم داغ کەردەن یە کام «خەیاڵ»ەن         سپی سەنگــــیٚ دیم واتم یــــە لاڵەن

دەڵێ: نازانم ئەمە کام (خەیاڵ)ە کە هۆش و فامی لێ ئەستاندوم و کەوتوومەتە نێو دنیای لاشعوور و ناوشیارییەوە" تەنانەت توانای هەڵاواردنی بەردی سپی و لەعل و (گەوهەر)ی سوورم لێ زەوتکراوە. یان:

ئێمشەو خاری یاو، زەمانەی وێســـاڵ

بەردش بە دڵما جە دەستی خەیـــاڵ

وەختیٚ جە تەخت دڵ گێرتش قـــەرار

شکۆفتنا نەرووم، گۆڵ هەزار هـــەزار

جە پەی زامی خار دەست نیشانی دڵ

خەم بی وەگۆڵزار من بیم وە بڵبــــڵ

ناڵـــەی بڵبڵیم بوڵند پایــە بـــی

جە پەی شووم بەختیم ئایر مایەبـــی

جەستەم هەر گریا تا سوب بەیــان دا

ســــوب باڵام نیشان، سفتە دڵان دا

لەم چامەدا، «خەیاڵ» پاڵنەر و بزوێنەر و خورپەبەخشی هەستی شاعیرانەی بووە، شاعیر پرۆسەی زەینی لە ناخۆئاگادا، دەخاتە بەرچاو دەڵێ: ئەمشەو لە دۆخی ناوشیاریدا، خورپەی شاعیرانە بەرۆکمی گرت، خەیاڵ چما چقڵێك چەقیە هەناوم، ئازاری ئەم ژانە روومەتمی وەك سوورەگوڵ، وەرگەڕاند و لە نەخشی زەینمدا رەنگی دایەوە و دەروونم وەك بڵبڵ هاتە چریبنی«کرکە»ی لیریکایەك، جەستەم لەو گڕەتاوە تا بەیان هاتە سووتان، بەیانی جەستەی پرووز لێنیشتەم نیشان دڵسووتاوانی تر(شاعیرانیتر)دا. بە واتایەکی سادە لەم دانووساندنە رۆحیە و لەم مکاشفە شهوودیەدا، یانیٚ: ئاوەها دۆخێك کورپەی شیعرم لە دایك بوو. یان لەم تابلۆ شیعرییەدا، (خەیاڵ)ی هیجرانی ماشووق وەك تیر نیشتۆتە دڵی و ئەنگاوتراوە و وەك سەرسامی و سەرگەشتە و هەڵەتە لە ژیان، وێڵ وێڵ و دەردمەند و

ئازارکێشان لە حاڵێکدا نووزەیەکی تیا نەماوە، مل ئەنێ بە پێڵەوە، جگ لە مردن چی بۆ نەماوەتەوە:

وێنەی سەرسامان، نەزان هـــــەواڵان
زەدەی زامی سەخت، (تیری خـەیاڵان)
وێڵ وێڵ مەگێڵو، بێزار جە ژیــــــان
خەمی فەراوان، کەم مەندەن جە گیان
یانێ های دووریت نەکەردەن کــاریٚ
وەرنە مەر گڵکۆم بونان جـــــــاریٚ

یان ئەم دێڕە: (خەیاڵ) چوون نەشتەر(چڤڵ) نیشتۆتە هەناوی و دڵیی لەت لەت کردوە و لە هەناوییەوە بۆ نێو چاوانی لافاوی زۆخ دەقوڵێ.

(خەیاڵ) چوون نەشتەر دڵ مەکاونۆ
دڵ جە دیدەم، سەیل زۆخ مەتــاونۆ

یان لەم دوو بەیتەدا: ئەمە خەیاڵە کە دەبێتە مایەی جەوهەری هەر دوو جەمسەری ژیان" هەم قنیاتی مادی و هەمیش رۆحانی و سۆسکەی شاعیرانە:

چراخ قنیاتم بە (خەیاڵ) تــــەن
بە (خەیاڵ)ی لاڵ مشکین خاڵتـەن
دایم جە تەندا (خەیاڵ) گیانمــەن
هەر بەو زیندەنان، بەو ژیانمـــەن

بە هێنانەوەی ئەم نموونانە، بۆمان دەرکەوت کە هۆکاری چێکردنی وێنە لە پرۆسەی داهێناندا لە تەنیا خەیاڵە کە دەوری سەرەکی دەبینێ. خەیاڵ بە مانای نەخشی زەینی و ئیماژ Image کە توخمی سەرەکی کاری (فۆرماڵیستە رووسی)یەکان و (رۆژاواییەکان)ە کە داکۆکی ئەوتۆیان دەکردە سەر ئەدەبییەتی زمان. بایەخی بێسارانیش لەم گرێبەستە هونەرییەدایە کە دەبێتە خاوەن رێچکە و شێوازی هونەری-ئەدەبی لە بە دنیا ئانینی دەقێکی ساکار و رەوان لە دوو توخمی»خەیاڵ و واقیع.»

١٣ -ئەفسوونی واژە(واچە): رووکردی شاعیری رۆمانتیك بۆ واژە رووکردێکی هونەری و بایەخدارە. واژە و وتە تا رادەی تەقدیس و کورنوش، پیرۆزکراوە. هونەرمەندی رۆمانسی پێیوایە" واژە تەنیا بۆ دەربڕینێکی ساکار و مەبەستێکی سادە نییە: بەڵکوو واژە لە فۆرماسیۆن و تان و پۆی شیعردا تێزێکە بۆ ئیدیالیزەکردنی واتایەکی خەیاڵاوی و ئیماژێك بۆ نەخشاندنی، تەختەنیگارێکی هونەری و موهەندێسی زوان. «ڤیکتۆرهۆگۆ» تا رادەی پیرۆزێتی و سەردانەواندن بۆ وتە و واژە دەیگوت: «واژە بریتییە لە وتەیەك و وتەیش هەمان خودایە». (حسێنی سید رەزا، مکتب های ادبی: ل٧٧) زەوقی هونەری و رێبازی داهێنانی بێسارانی لەم مێتودە قوتار نییە، دەرکی بە نەرزشی واژە کردوە. دەستی بردوە بۆ هەندێ واژە و دەستەواژە و وتەی ئیستەتیکی، ناتوانین بڵێین رێکەوت بووە، بەڵکوو بە زانیاری و توانای هونەرییەوە لە هەمبەر ئەم دیاردەدا دانووستاندنی کردووە" شتوومەك و کەرەسە زوانییەکانی لە دنیای دەرەك و کەونیدا وەك «خوداگا» وەریگرتووە لە پرۆسە زێهنییەکەیدا، لە «ناخوداگا» و میکانیزمی خەلاقدا، بە پێودانگی وێنەکاری هەلیخولاندون، ئەنجا وەك دەقی شیعری هاتۆتە رێچکەی هەبوون، بەم شێوە بووەتە خالقی تەشکێکی رۆمانتیکی و مانیفێستی شیعری بۆ ئەدەبی کلاسیکی کوردی. ئەم بەستە فەردانە کە پیرەمێردی نەمری هێنابووە سۆسکە و لەژێر کاردانەوەیکی ئەوتۆدا وەریگێڕاون بە کوردی سۆرانی:

چراغ دا جارێ بۆ وە خاوەـــــــدا یا بنیە وەبان هەر دوو چاوەـــــــدا

مەواچە موژەت تیژتەرەن جە خـــــار پای گولێ ئەندامم مدمرۆ ئـــــــازار

من موژەی خار یە خەیلێ وەختـــــەن بە جارووکاری نەرای تۆم جەختـــــەن

شەو و رۆ نەرات، پەرێ ئی ســـــەودا یەك یەك بینێ شکستەی مـــــەودا

بۆ وە بێ ئەندێش، یا بنیە لێشـــــان بدیە بینایی، هیچ مەندەن تێشتـــــان؟

ئەگەر تێشان بۆ، غەیر جە هوون نێشتەر هیجرانت فیشتەر، لێش مەدۆ نێشتــــەر

سەحەر مەزانی بالاّ زەرستـــــــوون پات وێنەی حەنا رژیا بۆ بە هـــــوون

ئەم پارچە هەڵبەستە لە لایەن مامۆستا پیرەمێردەوە وەرگێڕراوەتەوە سەر شێوەی سۆرانی بەڵام تەنیا ئەم چوار بەیتە لە دیوانەکەی لە لایەن کەیۆمەرس نیکرەفتارەوە ئامارەیان پێکرابوو. ئەمە ئەو چوار بەیتە:

| | |
|---|---|
| گیان له پرخەی خەوی خاومـــــا | پێت بنیٚ وه بان هەردوو چاومـــــا |
| مەڵیٚ برژانگت تیژە وەك چــــقڵ | ئەچەقێته پێی ناسکتر له گـــــوڵ |
| به برژانگی تیژ بۆیه خۆشحاڵـــــم | که بەر دەرگاکەی تۆی پیٚ ئەمـــاڵم |
| هەر چەند تیژیش بیٚ بۆ پێی تۆ نەرمه | بۆ تی هەڵویسنی جەستەت دڵ گەرمه |

١٤ -رەمزی چراغ: له هەرێمی ئەندێشەی هونەری بێسارانیدا، چراغ دەورێکی بەرچاو دەبینیٚ، تا رادەیەك ئەو توخمه بۆته بەرجەستەیی بۆ شێوازی ئەم شاعیره. ئەم دیارده شێوازییه، به داهێنانی وێنەگەلێکی جۆراوجۆر و خولقاندنی فەزاگەلێکی فره رەهەند و چەن لایەنه -پتر له هەفتاد جار دووپات کراوەتەوه- تا رادەیەك بۆته بوونەوەرەی سەرەکی بۆ خورپەبەخشی و داهێنان له پرۆسەی شیعردا بۆ بێسارانی. وەك ماشوقەیەکی ئوستوورەیی و خەیاڵی" ئەمادێك بۆ یۆتۆپیا و مەدینەیەکی فازڵه. چما(شاخ نەبات و حەبیبه) ماشوقه ئایدیالی و ئوستوورییەکەی (حافز) و نالی شارەزووری که سەرچاوەی بارگەدەلالی و هونەرییەکانی ئەم دوو شاعیره بوون. ماشوقەیەك که نزم و زەمینی وناسووتی نییه بەڵکو خاوەن تەشکێکی پله باڵا و ئاسمانی و لاهووتییه، بیٚ ئەوەی حزوورێکی فیزیکی هەبیٚ. بۆته هێمایەکی بەرزەفڕ بۆ دەقه سەرچڵەکانی ئەم شاعیره.

-چراغ قوربانەن، چراغ قوربانـــەن
غەیری تۆ پەی کەس قوربان نیەنـــان
-چراغم به چین، چراغم به چیـــن
ئەرچینی زوڵفت بدەو به ماچیـــــن
-چراغم شەندی، چراغم شەنـــــدی
تو توخمی هیجران وه بەختم شەنــدی
-چراغم بیٚ تۆ گولاٚنی وەهــــــار
مەیان وه دیدەم چون نەشته هـــەزار
-چراغ یانیٚ چێش، چراغ یانیٚ چێش
ئی چەم ئێشایته پەی تۆ یانیٚ چێــش
-چراغم شەهید، چراغم شەهیـــــد
وەختیٚ وەنیگات مەگەریم شەهیـــد

١٥ -خەزانیه: هەروەها که خاقانی شروانی شاعیری به ناوبانگی سەدەی شەشەمی کۆچی مانگی له ئەدەبی فارسیدا به خولقاندنی وێنەگەلی جۆراوجۆری هونەری ناسراوه به

«شاعیری بەرەبەیان» و لێرمۆنتۆف شاعیری مەزنی رووسی ناسراوە بە شاعیری نەخشاندنی «ئاسۆی رۆژ» و توانیویانە هەلاتنی رۆژ لە ولاتی قەفقاز و ئاقاری شروان و ئەران بە باشترین دیمەنی هونەری نومایش بکەن، بێسارانیش بە توانستی هونەرییەوە دیاردەی «خەزانییە»ی کردوە بە مۆتیڤە شیعرێکی تاکی دەگمەنی خۆی. ئەم رووکردە زادەی رەفتاری زەینی و پەژواکی دەروونی ئێش و ئازای خۆیەتی: لەم چامە هونەرییەدا، بێسارانی لەگەلّ وەلّگی خەزان (گەلاخەزان) لەسەر شێوەی کەسێتی بەخشی وخوازە و مێتافۆر دێتە دواندن و دیالوگ، لە دیتنی سیمای زەرد و لاوازی وەلّگ زویر دەبیّ، دۆخی دەرونی و جسمی و پیری خۆی دێتەوە یادی. هۆکاری ئەم زویرییە لە گەلا دەپرسیّ و وەلامی دراوەتەوە: من لە خەومدا لە چلّی دارە مێو جیا بوومەتەوە و ئاوا کەوتومەتە دیاری غوربەت، زەردیم لە هیجرانی یارە و بڕان لە وەتەن و ماوای سەرەکی(کاردانەوەی مەولەوی رۆمی لە سەر بێسارانی لە نەی نامەدا: بشنو از نی چون شکایت می کند- از جداییها حکایت می کند. بڕوانە مەسنەوی مەعنەوی مەولەوی). بێسارانی وەلام دەداتەوە کە هەردوو زەدەی دەستی هێجرانین تو لە تەرزێك بڕاوی و من لەسەروی بالایەك، بەم جیاوازییە تۆ لە خەودا ئازاری هیجرانت چەشتوە و من بە کردە سەرمدا هاتوە.

-ئارۆ شیان دیم، رەنگی خەزانـــــان
حالّی شان نیەن، ئێمە نەزانـــــــان
-دیم بە تەرزەوە خەزانیّ بیّ تـــەرز
تەمام حالّی وێش پەرێم کەردش عەرز
-پەرسام یە چێشەن ئی زەردی خەزان
وات: مەیۆم نە خاو تەناکی تـــەرزان
-واتم: ئێمە و تۆ هەر دوو جەستەمـــان
ئێش مەکەران زام ماران گەستەمـــان
-تو جیا جە تەرز، من جە بالایـــــیّ
تەرتەر جە نەرگس سەولّی ئالایـــــیّ
-داخی جیایی نەو توولّ نەمامـــــان
تۆ جە خاوت دی، من پەنەم ئامـــان

## مــەحــوی

## باشــوری کــوردستان

## ( ١٨٣٦ – ١٩٠٦ )

مەلا محمد کوڕی عوسمان بەڵخی ناسراو بە مەحوی مامۆستای ئاینی و یەکێك لە دیارترین هۆنراوەنووسەکانی کورد بووە ، وە بە یەکێك لە چڵەپۆپەکانی شیعری کوردی دادەنرێت ، هۆنراوەکانی لە دەوری چەند تەوەرێکی جیاواز ئەسوڕێتەوە و سەرجەمی هۆنراوەکانی لە دیوانی مەحویدا کۆکراونەتەوە .

ناوی موحەممەدە ، کوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە، لەنەوەی پیر و زانای ناودار ، شێخ ڕەشە ..باپیریشی وەکو باوکی ناوی مەلا عوسمان بووە وەکو شێخ مارفی نۆدی لەگەڵ دروست کردنی شاری سلێمانیدا هاتۆتە شاری نوێوە ، ( باڵخ) دێیەکە لە ناوچەی (ماوەت) لە شاریستانی سلێمانی .

مێژوونوسی کورد ( محمد ئەمین زەکی بەگ) دەڵی لە ساڵی ١٢٥٢ ی کۆچی بەرامبەر ( ١٨٣٦ – ١٨٣٧ ی زاینی لە دایك بووە .

مامۆستا علائەدین سوججادیش دەڵێ لە (١٨٣٠ زاینی – ١٢٤٦ ی کۆچی) لە دایك بووە ، وە (کاکەی فەلاحیش ) دەڵێ (١٨٣١ – ١٨٣٢زاینی – ١٢٤٧ ی کۆچی) لە دایك بووە .

باوکی خەلیفەی شێخ عوسمانی سیراجەدینی تەوێڵە بووە ، حەوت ساڵان بووە خراوەتە بەر خوێندن و ماوەیەك لای باوکی خوێندوویەتی ، بۆ خوێندن چووتە سنە و سابلاغ و لای مەلا عبداللە پیرەباب خوێندوویەتی ، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لای مەلا ناودارەکانی ئەو ناوچەیە خوێندنویەتی ، ئەوجا چووە بۆ بەغداد و بووە بە فەقێ زانای بەناوبانگی کورد موفتی زەهاوی ئیجازەی زانستی لای ئەو وەرگرتووە .

وە دیسان عەلائەدین سوججادی دەڵێ پاش ئیجازە وەرگرتنی لە یالی ١٨٥٩ ی زاینی بووە بە مەلای مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە بەغداد ، بەڵام لە ساڵی ١٨٦٢ دا بەغدادی بەجێ هێشتووە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و بووە بە ئەندامی دادگا .

لە ١٨٦٨ دا بە هۆی مردنی باوکییەوە دەستی لە کاری میری کێشاوەتەوە و بووەتەوە بە مەلا و دەستی کردەوە بە وانە ووتنەوە بە فەقێیە و قوتابییان .

ئەو فەقێیانەی کە دەرسیان لای مەحوی خوێندووە و فەقێی بوون لەوانە :

– مەلا حەسەنی کوری مەلا عەلی قزڵچی .

- مەلا محمودی مەزناوەیی .
- مەلا سەعید ئەفەندی نایب ئۆغلی کەرکوك .
- مەلا عەزیزی موفتی سلێمانی ... له ناوبانگترین فەقێکانی مەحوی شاعیر بوون .

بە ڕێچکەی باوکیدا تەریقەتی گرتووەتە بەر و بووە بە خەلیفەی شێخ بەهائەدینی کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵە ، وەکو مامۆستا شێخ محمدی خاڵ لە ( موفتی زەهاوی) یەکەیدا نوسیویەتی ، مەحوی لە ساڵی ١٩٢١ ی کۆچی بەرامبەر ١٨٧٤ -١٨٧٥ ی زاینی لە گەڵ چەند مەلایەك لە سلێمانیەوە نەفی کراون بۆ بەغداد ، بەڵام نوسەر هیچی تری لەبارەی ئەم نەفی کردنەوە و هۆیەکەی و چۆنیەتی گەڕانەوەی مەحوی بۆ سلێمانی نەنوسیوە .

مەحوی لە ساڵی ١٨٨٣ دا بە پێی وتەی مامۆستا سوججادی چووە بۆ حەج و لەوێوە چووە بۆ ئەستەمبوڵ و لە ڕێگەی پیاوماقوڵانی کوردەوە لە ئەستەمبوڵ چاوی بە سوڵتان عبدالحمید خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانی کەوتووە ، سوڵتان ڕێزێکی زۆری لێگرتووە و فەرمانی داوە خانەقایەکییان لە سولەیمانی بۆ کردوەتەوە کە ئێستا بە ( خانەقای مەحوی) بەناوبانگە ، موچەیەکیشی بەناوی خزمەتکردنی هەژارانەوە بۆ بڕیوەتەوە ، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی ، تا مردنی لە سەرەتای شەشەڵانی ساڵا ١٣٣٤ بەرامبەر ١٩٠٦ ی زاینی .

**خانەقای مەحوی**

ساڵی ١٨٨٣ ی زاینی چووە بۆ ئەستەمبوڵ کە ئەو کاتە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، لە ڕێگەی پیاوە ماقوڵەکانی کوردەوە بە دیداری عبدالحمید ی دووەك ئەگات و سوڵتان زۆر بە زانست و عیلم و تەسەوفی مەحوی بەدڵ دەبێت هەر لەبەر ئەمەش بو بڕیاری دا خانەقایەکی بۆ بکرێتەوە لە سلێمانی ، کە بەقانەقای مەحوی ناسرا ، وە مەحوی لە دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی لە ئەستەمبوڵەوە لەو خانەقایەدا کە دروستی کرد بە بەردەوامی بە وانە وتنەوە و رابەرایەتی کردنی تەسەوف بەردەوام بوو .

مەحوی لەو خانەقادا کاتەکانی بۆ سێ بەش دابەش دەکات ، بەشێکی بۆ وانەوتنەوە و بەشێکی بۆ دانیشتن لە گەڵ خەڵك و ئامۆژگاری کردنیان و بەشێکی تری بۆ نوێژو یادی خواو بیرکردنەوە.

**کەسایەتی مەحوی**

مەحوی پیاوێکی باڵابەرز و سوور وسپی و چاوگەورە بووە ریشێکی درێژی هەبووە و بە نەرمی قسەی کردووە ، مێزەری سپی و کەواو سەڵتەی لە بەرکردووە ، و لە سەرەتای ژیانییەوە خولیای گۆشەگیری بووە و گەرمی هەست و سۆزەکانی دەرگای شیعری بۆ ئاوەلا کرد ، هەروەها ئەو ژینگە و خێزانەی مەحوی تێیدا پەروەردە بووە کردوویەتی بە شاعیرێکی تەسەوف ، هەروەها شاعیرێکی وردەکار بوو و تەواوکردنی هەندێك لە قەسیدەکانی لە مانگێکەوە تا ساڵێکی خایاندووە .

**ناوەرۆك و رووخساری هۆنراوەکانی**

شیعرەکانی مەحوی لەسەر مانا و بیرکردنەوەیەکی تەواو قوڵ ئەوەستێت و بەگشتی هۆنراوەکانی لە سەر چەندین تەوەری جیاواز ئەدوێت ، لەوانە شانازی کردن بە نەتەوەی کورد و زمانی کوردیەوە لە هەندێك لە شیعرەکانییدا ، هەروەها هەڵوێستی توندی شاعیر بەرامبەر ستەمکار و زۆرداران لە شیعرەکانیدا رەنگ دەداتەوە لەگەڵ بەگژداچوونی ئەوانەی بازرگانی بەسەر ئاینەوە ئەکەن و زۆرترین بەشی شیعرەکانی لە چوار چێوەی جوانی و خۆشەویستی و عەشق دەسورێتەوە ، هەروەها چەندیین شیعری هەیە لە بواری راستی پەرستی و فەلسەفەدا و لە ستایشی ئاینی و تەسەوفدا .

مەحوی وەکو شاعیرێکی سەردەمی و پێشووتر لە خۆی ، کێشی عەرووزی عەرەبی بەکار هێناوە ، هەروەها یەکێتی قافییەی پاراستووە ، بەواتایەك کە سەرانسەری هۆنراوەکە لەسەر یەك قافیەیە ، بە هۆی ئەوەی زمانی کوردی لەو سەردەمەدا هێز و توانی ئێستای نەبووە . مەحوی وشەی فارسی و عەرەبی زۆر بەکارهێناوە ، هەروەها وشەکاری و وردەکاری زۆری بەکارهێناوە و بەدوای وشە دەربڕینی گراندا گەڕاوە .لە هەمان کاتتدا مەحوی لەگەڵ زمانی کوردییدا بەزمانی فارسی و عەرەبی چەندین هۆنراوەی نوسیوە .

**چەند نمونەیەك لە هۆنراوەکانی**

**زۆر لە شیعرەکانی مەحوی لە چوارچێوەی غەزەلیاتتدایە ئەمەش نمونەیەکە :**

**بەنوری بادە کەسفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم ، چ بکـــــەم !**

**بە شەمعیکی وەها چاری شەوێکی وانەکەم ، چ بکــــەم !**

**لە خەزنەی دەڵمدا هەرچی هەیە ، هەر داغی سەودایـــە**

**دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم چ بکەم !**

**لە گەڵ دەستی مەلا رێ ناکەوێ زونافی زوڵفی یـــــار**

وەکو "شێخ " ئیختیاری مەزهەبی "تەرسا" نەکەم چ بکـەم !
لە ڕێی ئەو شۆخەدا خۆم کردە خاك و پێی نەنا پێمــــا
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم ، چ بکـەم !
دەمێکە شاری پڕ شۆری مەحەبەت مات و خامۆشــــە
بە قانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم چ بکــــەم !
لە چاوانم نەما بۆ گریە ، نۆبەی سەجدە بەردەریــــــە
سیا ساڵم نەبارە ، نوێژی ئیستیسقا نەکەم ، چ بکــــەم !
لەسەر تۆم دوشنەمە دنیا قەزیەم " مـــانـع الجمـع " ە
کە تەرکی تۆ نەکەم ، تەرکی هەموو دنیا نەکەم ، چ بکەم !
بەجێ ماوم لە یاران ، تا بەجێ ماوم ، ئەجەل زوو بـــە
بەمردن لەم قوسووری ژینە ئیستیعفا نەکەم ، چ بکــــەم !
ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا مەحـــــوی
هەتا قامی قیامەت ، ئاە و واوەیلا نەکەم ، چ بکــــەم !

**ئـایـنـی**

ئەم چەند دێڕەی خوارەوە نمونەیەکن لە هۆنراوە ئاینییەکانی مەحوی ، لەم بەشەدا مەدح و ستایشی پێغەمبەری ئیسلام محمد درودی خوای لەسەر بێت دەکات کە لە ١٢٤ دێر پێك هاتووە ئەم بەشێکیەتی :.... مەحوی بۆ پێغەمبەر (درودی خوا لەسر بێت) دەڵێت:

و صلی الله علی" ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفــــانە
کە دەرکی غــەوری ناکا "غیـــر علـم الله سبـحان"ە
"و صلی الله علی" ئەو زاتی پاکی قودســــــی ئایاتە
کە ئەخلاقی پەسەندیدەی جەنابــی حەیی مەننانــــە
"و صلی الله علی" ئەو حەزرەتـــەی ساحێب کەمالاتــە
کە ئەعلا و موعجیزەی، قوربانی بم من، نووری قورئانــە
لە تاریکـــی شــــەوی کوفرا بە یەك دەم لەمعێــکی دا
هەزار و سێ ســــەد و بیســـت و دووە، دنیا چراخانــە
چرایەك نووری بێچـــوونی مومیـــددی بێ، دەبێ وا بـێ
چرایەك دەستی قودرەت خۆشی کا، بۆ تا ئەبەد مـــانە

"تعالی الله" به دوو دەە بوو کە هەردوو عالەمی داگـــرت

بنازم بەم کەماڵی عەزم و حەزم و شەوکەت و شـــــانە

لەگەڵ ئەم ئیحتیـــــشامە زوهـــدی دنیایـــی تەماشا کە

کە یەك لەت نانی جۆ بوو قوتی، یا خورما دوو ســیّ دانە

فەلەك جاهیّ سەری خەرمانی تا عەرش، ئەڵبەتە نابـــیّ

تەنازوول کا عولـــــووی هیممەتـی بۆ دەنکە زیزانــــە

موهیمیّ غەیری زاتـــی حەق لە هیمەتیــــا نیە، ئیللا

لەبەر ئەم ئوممەتە بیّ هیممەتـــــە دائیـــم بە ئەحزانــە ...ئەم قەصیدە لە ١٢٤ دیّرە

لە بارەی مەحوییەوە وتراوە ....

مەحوی یەکێکە لە دیارترین و ناسراوترین هۆنراوەنوسانی کورد و کەم تا زۆر نوسەر و رەخنەگر و شاعیرانی کورد لە بارەیانەوە نوسیوە هەروەها زۆر لە شاعیران لە هۆنراوەکانیاندا بە شانی مەحوییدا هەڵیانداوە ، لەوانە ::: سالمی ساحێبقڕان ، مەلا محمد خاکی ، حاجی قادری کۆیی ، مەلا کاکە حەمەی ناری . سەیید ئەحمەدی نەقیبی ، و فەوزی ، عەلی کەمال باپیر ئاغا ؛ حەمدی و زۆر لە شاعیر و نوسەر و رەخنەگرانی تر ستایشی مەحوی وشیعرە قوڵەکانیان کردووە.

وەك نمونەیەك لە سەر ئەو هۆنراوانەی لەسەر مەحوی نوسراوون ، شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی ناسراو بە فەوزی نوسیویەتی :

گەرچی نالی و کوردی و سالم لە دەوری " ماضی " یا – خاوەنی دیوانی عالی بوون لە شیعری کوردییا

گۆیی سەبقەت هەر لە ئاوا مابوو " مەحوی " پێی گەیشت – خستیەوە مەیدان بەجێی هێشتن لە عەسری " پانی " یا عەلی کەمال باپیر ئاغاش نوسیویەتی لە مەدحی مەحویدا :...

چونکە بەندەی حەزرەتی " مەحوی " م و شاگردی ئەوم – وائەزانم واریسی تەختی شاهی کەیخوسرەوم داخەکەم ئەولادەکانی دەرحەقی من بیّ وەفان – وا ئەزانن بەندە مردووم یاخۆ سەرمەستی خەوم .

دیوانی مەحوی

کۆمەڵە شیعرێك لە خۆ دەگرێت کە مەحوی شاعیر نوسیویەتی ، هاوکات لە گەڵ زۆر لەو ووتار و بابەت و شیعرانەی لە بارەی مەحوییەوە نوسراون وەك پاشبەند لە کتێبەکەدا هەن ،

وه شیعرەکانی مەحوی دابەشکراوە بۆ غەزەلآت و شیعری ئاینی و چوار خشتەکییەکان و تاکەکان و بەشی عەرەبی و بەشی فارسی هاوکات هەر یەکێ: لەم پۆلێنانە بە پێی ریزبەندی ئەلفبێی کۆتایی دێرە هۆنراوەکان ریزبەندی کراون .

ئەو سەرچاوانەی دیوانەکانی مەحوییان لێ وەرگیراوە لەسەرەتادا نوسراوەکانی دەستی شێخ مەلا عومەری مەحوی کوڕی شاعیر و هەندێك دەستنوسی تری بنەماڵەکەیان بوون و پاشان شێخ محمدی مەحوی بە بەراوردکردنی دیوانەکەی چاپی ١٩٢٢ لەگەڵ دەستنووسەکاندا دیوانەکەی نوسیوەتەوە و لە ساڵانی ١٩٦٠ و ١٩٦١ دا لە گەڵ گۆران و کاکەی فەلاحدا راستیان کردووەتەوە و خستویانەتە سەر رێنوسی نوێی کوردی . پاشان هەریەك لە مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەریس و محمدی کوڕی مەلا عبدالکریم شیعرەکانیان لێکداوەتەوە و هەروەها بەهاوکاری کاکەی فەلاح و شێخ محمدی مەحوی دیوانەکەیان بە شێوەیەکی جوان بە چاپ گەیاندووە .

مەحوی لە تشرینی یەکەمی ١٩٠٦ دا کۆچی دوای دەکات و لە یەکێك لە ژوورەکانی خانەقاکەیدا بە خاك سپێردرا .

**عیشق لە تێڕوانینی مەحویدا ....**

عیشق روحیەتی روحە.رووباریکی خوینینە کە تەنیا دل مەلەی تیدا دەکات و کەشتییەکانی هەستیش خوین بۆ کەنارەکانی موحیببەت دەگوازنەوە ،جەنکیکە بەبێ سەرباز و تانك و تۆپ وبێ هەرەشە وبێ جرپە ، دەشێ کەس نەدۆڕیت و دەشێت هەمووش دۆڕاوبن تۆبلیێ سەرابتانیك نەبێت و لە دواجاریشدا ئاوی کولاوی عیشق تینویتی سەرابیش بشکینیت عیشق گەرمە وەکو ئامیزی دایکیکی زۆر گەرم .سەوزە لە سەوزایی بەهار سەوزترە، زەردە لە زەردی گەلاکانی پایز زەردتر،ساردە لە بەستەڵەکی دڵی خیانەتکارێکی ناموحیببەت ساردتر...

عیشق گەردەلوول و وزە و رەشەبایە . بەلام بێ تۆز ریزی لە ناسکیتی و تەنکیتی دڵی عاشق دەکرێت ،عیشق هەندێ جار درۆزنیکی راستگۆیە و دەوێت لە رێگەی جەستەوە رۆحەکانی خۆش بوێت و بەبێ جەستەی بڕوای بە لێدانی دەرگاکانی روح نابێت لە نیشتمانی عیشقدا عەقل کۆیلەیە ، زمان دیکتاتۆرە ،بزە و نیگا زەهری مار و مەستی نێو مەشروب خۆرەکانی هەستە و تەنیا نیچیر و جیزی تالی قاوەخانەکانی مەستە ، ئەوەی دەست و بەنجە و مەجەکی عاشق دەژمێرێت لە یەکەوە تا هەتا هەتا عیشقە، ئەوەش کە

دەیانشکێنێ هەر عیشقە، عیشق بەرلەوەی مۆم بیت رووناکییە . بەر لەوی بەروانە بیت سووتانە، بەرلەوەی بپژێ هەڵقوڵانە. بەرلەوەی ببورێ گوزەرە، عیشق زنجیریکی جەنداز سەرە سەریك خوێنین ، سەرێك برژاو، سەرێك سووربلو ، سەرێك زاکاو ، سەرێك داماو، ئاهە وئەسەف و هەناسەشە وئاسك و بەیرەشە ئاوهەوای و دووکەلیشە .کووچە و کۆلان و لانەشە، شەوکێڕان و ڕۆژگێرانیشە . مامانی لە دایکبوونی هەمیشە زانی.......

یەکێ لە هۆنراوەکانی مەحوی شاعیر دەڵێ .

خەتی دەوری لیوی ئالت ئەی مەسیحا لامو بــــــی
هەر لە جا...مەی سەبزەجی بو غەین وجیم وواو هــی
خونجە بازاری نەزاکەت تەنکیی وداری شکــــــاند
هەرکە زایر بە لەدەوری باخی حوسنت لام و بــــی
لەب شەککەر تاکەی لەحەسرەت خالی موشکینت دلم
داغدارو خەستەبی وەك لامو ئەلف ولامو هـــــــی
لالە روخسارم لەسایەی ئەشکی خوینین رەنکــــەوە
جونکە روسورم لە قابی عەین وشین وقاف وتـــــی
عیشقت ئەی جانا منی رسوای عالەم کــــــــردوە
جاکە ئینسافت ببی بو ئەلف و سین و تاوهـــــــی
ئیستە بو لاف و کەزاف هەرکەس دەبینی عاشقــــە
نەك هەموکەس جان فیدا وەك میم وحاو واوو یـــی
(مەحوی) ئەمرو زور نەخوشە قەت شیفایی نایە بە هیج
کەر شیفایی بیتن لە بوی زولف و ئەو ئەکریجـــە دی

مەحوی دەربارەی خودا پەرەستی و تەزکیەی نەفس دەڵێ ....

عیبادەت فەلسەفەی عومرە هەتاکو ماوی وریابــە
خەریکی تەزکیەی نەفس و ڕەفیقی ئەهلی تەقوابە

ستایشی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی

دڵم ئەمشەو نەخۆشی نیسبەتی چاوێکی بیمـــارە
جگەر غەڵتانی خوێنی حەسرەتی لێوێکی خوونخوارە
سەرم شێواوی شێوەی فیتنە هەڵگیرسێنی شۆخێــکە

حەواسم تەفرەقەی عیشوەی دڵ ئاشووبێکی عەیارە
خەیاڵی زوڵفی دەر ناچێ لەدڵ تادەرنەچێ ڕۆحـم
سپێراوە خەزێنەی بەختی ئێمە بەو سیا مـــــارە
لەشینی فیرقەتی ئەودا ئەوەندە ئەشکی سوورم ڕێت
بەدەوری جێگەما تاپڕ دەکاتن دیدە گـــــوڵزارە
لەبۆ سەیرانی با غ و سەبزە تەکلیفم مەکەن یـاران
کەسەبزەو گوڵ لە چاوەمدا بەبێ ئەو هەر خەس و خارە
نەمامی قامەتی پەروەردەی ئاوی دیدەکەی من بوو
کەچی گوڵچینی باخی وەسڵی ئەو ئێستاکە ئەغیـارە
بەدەردی خۆمەوە کەر گۆشەیەك دەگرم بەبێدەنگـی
بەلاما دێ بەخەشم و ڕق دەڵێ : خۆ نەقشی دیــوارە
کەدێم ئیزهاری شۆر و شینی دڵ کەم، بەڵکی ڕەحمێ کا
بەخەندە دێ دەڵێ: خۆڵی بەسەردا بێژەن ئەم هـارە
وتم بابەس وجودی بێ وجودم باری خاتر بـــــێ
لە گەڵ دڵ گۆشەیەکم گرت ئەوم بەردا بەیەك بـارە
لەکونجی بێکەسیدا مودەێکم بردەسەر ،ئاخـــــر
شوێ دڵ کەوتە بەحسی بێ وەفایی ئەو ستەمکـــارە
وتم ئەی دڵ لە دولبەر شەکوە کردن حەیفە دڵ دەیوت
ئەمە بۆ دولبەرێکی دڵ نەوازە ،ئەو دڵ ئـــــازارە
وتم خۆشە بەئومێدی وەفا جەورو جەفا ،دەیــــوت
بەسەر چوو عومرم ونەمدی وەفایێك لەو جەفاکــارە
وتم بەنهانییە دەرهەق بەعاشق لوتفی مەعشووقـــان
وتی:ئەو زاهیر و باتین لەزورمرەی ئێمە بێـــزارە
وەکەر نا دەفعەیەك لەم بەینە بۆ دەفعی گلە دەیوت
هەواڵێکی ببرسن، چۆنە ئەو مەزلومی بێچـــــارە!
لەپڕ بائێك لە کەلح بۆی ئاشنا هات و وتی: مەحـوی
بەشارەت بێ ئەئیقباڵت موبارەك، تالیعت یــــارە
کەهاتم شۆخەکەی غارەتکەری دین و دڵت دەیــوت

پرسە حاڵی ئەو سەودازەدەی بەدبەختی ئـــاوارە
دەبێ بێ ئافتابی رووەمت و سوبح و جەبینی مـــن
چ فەرقێکی بێ رۆژی لەشەو سوبحی لە ئێـــوارە
وتم: واسەرفەرازت کردم ،ئەمجا سا دەخیلت بـــم
لەباتی من،سەبا، تۆ دەچییەوە عەرزی کە ئەمجـارە
ئەگەر جی موددەییکە من لەزوڵماتی سیا بەختــی
ونە زەڕڕەی وجودم رۆژی رووناکم شەوی تـــارە
لەفەیزی ناوی (مەولانا چیا و الدین)ە وە ئێستـــە
هەموو رۆژە شەوم ، قەترەی وجودم بەحری ئەنوارە
هەتا ئەو ناوە پاکەم کردە زیکرو فیکری رۆژو شـەو
هەناسەم بۆنی میسکی گرتووە لێوم شەکەر بـــارە
بەیومنی ئەو، بەهارە پاییز و زستان و هاوینـــــم
کەهەر کایی بکەم بەحسی لەدەورم گوڵ بەخەروارە
بەئیخلاسی ئەوم ئاوینەکەی دڵ وا جـــــەلا داوە
کەچیهرەی شاهیدی مەقسودمی تێدا نمـــــوودارە
جەمالی رابیتەی وادلبەرە بەختی خواڵـــــووشم
بەئومێدی تەماشایەك هەمیشە چاوی بێـــــدارە

یەکێکی تر لە هۆنراوەکانی مەحوی ...

بە دەم مەوجی ئەشکی خوینەوەم، بڕوانە چۆنم بـــۆت
دەروونم کەیلی زووخی دەرد و غەم، بڕوانە چۆنم بـــۆت

ڕەقیبی سەگ حەزی بو، کوشتمت ، سەیری کە چۆنی بۆم
دوعا بۆ دەست و تیغت من دەکەم ، بڕوانە چۆنم بـــۆت

بە غەدداری نەوەك ناوت بەرن ، بەئەنجنی وەك مـــــن
شکاتی جەوری تۆ بەر کەس دەبەم ؟ بڕوانە چۆنم بـــۆت

هەناسەی ئاگرینم بردەوە بە ر ، تا دەروونم ســـــوت
بە ناڵە تا دڵت سەخڵەت نەدەم ، بڕوانە چۆنم بـــۆت

بیانوو بگرە ، شێوەی خۆت بشێوێنە بە من کوشـــــتن

وەها چاوی بەدتێ لادەدەم ، بڕوانە چۆنم بــــــۆت

بە ئاوی گریە هەردەم ناوی چاوم شتوە ، نەك جێـــت

بە خوێن ئاغوشتە بێ تۆ ، چاوەکەم ، بڕوانە چۆنم بــۆت

غەمی خۆشی نیە ((مەحوی)) لە دڵیا ، هەر خەمی تۆیــە

لە عیشقدا دەکەم غەم بۆ بەغەم، بڕوانە چۆنم بــــۆت

هۆنراوەکیەکی تر لە هۆنراوەکانی مەحوی شاعیر و ناوداری کورد.....

ئافریبی دڵبەری دڵـــــدار ، هـــــەی !

فیتنەگەر ، هەی! رەند هەی! عەیار هـــەی!

بوویە یاری غەیر و من بێگانە مــــــام

بێ وەفا ، هەی!هەی جەفا کردار ، هـــەی!

خۆ موسوڵمانم ، بەناحەق خوێنی مـــــن

بۆ دەرێژی ، کافری خوونخوار ، هـــــەی!

چا نیە رەفتاری وا بەد بەس بکـــــــە

دەرحەقی من ، شۆخی بەدرەفتار ، هـــەی!

تۆ دڵت دێوانە کردم ، ئێستە کـــــــەش

ئانوێنی روو ، پەری روخسار هـــــــــەی!

قەت لەتیری ئاهی مەزڵوومانی عیشـــــق

تۆ نەترسی ، زاڵمی غەددار هــــــــەی!

غەیری بەد نەیدی لە تۆ ((مەحوی)) ، ئەتۆش

هەر بەدت رێ بێ ، بەدی بەدکار هـــەی!

بەشێکی تر لە هۆنراوەکانی مەحوی ......

بۆزین بە دەم مەوجی خوێنی ئەشکەوەم، بڕوانە چۆنم بۆت!

دەروونم کەیلی زووخی دەرد و غەم، بڕوانە چۆنم بـــۆت!

رەقیبی سەگ حەزی بوو، کوشتمت، سەیریکە چۆنی بـــۆم

دوعا بۆ دەست و تێغت من دەکەم، بڕوانە چۆنم بـــۆت!

بە غەدداریی نەوەك ناوت بەرن، بەنەنجنی، قەت مــــــن
شکاتی جەوری تۆ بەر کەس دەبەم! بڕوانە چۆنم بــــۆت!

هەناسەی ئاگرینم بردەوەبەر، تا دەروونم ســــــــووت
بە نالّە تا دڵت سەخڵەت نەدەم، بڕوانە چۆنم بــــــۆت!

بیانوو بگرە، شێوەی خۆت بشێوێنە بە من کــــــوشتن
وەها چاوی بەدت لێ لادەدەم، بڕوانە چۆنم بــــــۆت!

بە ئاوی گریە هەردەم ناوی چاوم شتوە، نەك جێـــــت
بە خوێن ئاغوشتە بێ، تۆ، چاوەکەم، بڕوانە چۆنم بــۆت!

غەمی خۆشی نییە ((مەحوی)) لە دنیا، هەر غەمی تــۆیە
لەعیشقتدا دەکەم غەم بۆ بەغەم، بڕوانە چۆنم بـــــۆت!

## پارچە هەڵبەستێکی تری مەحوی ...

کە لێوی خوێنمی نۆشی ، شەوی خەت گرتی دەوری ئەو
بــە قــوربــانی خـوێنێکم کەوا ڕۆیـی بـەسـەریا شەو

لە ئەشك و ئاهما جۆش و خرۆشـی حەولی تـەئسـیرە
دەزانن ڕێیەکی دوورە لە پێش ، ئەڵبەت دەکەن سەرڕەو

بلا ڕۆحت موقەددەس بێ ، ئـەم و ئەو کردنت بـەس بێ
هـەتـا ئـاخـر هـەنـاسـە ئـەو بناسە ، هـەر بنازە بـەو

شـەوێ لەیـلا بە مەجنوونــی وەها وادەی تـەمـاشا دا...
دەبـێ ڕۆژێ ببینی من کــە تـۆ ڕێ خەیتە دەشتــی خەو

لە نـاڵـینــی منــی ئیفتادە زاهــید بــۆ ڕقــی هەستا !
حــوزووری ئاە ئـاهــی بوو بە غەیبەت ئـەو دەکا عەو عەو

خـودا بـیدا ئەدەب "حِــرزُ الأمــان"ێکـە عـەتـیـەی ڕەب
چ بوو جەرگـــی بڕی غەیـری ئەمەی نامەی دڕی خوسرەو !

وتی من بێـم و " مەحوی " وا بمـێنــێ ، ناکـرێ ، نـابـێ
هـەتـاو و سێبەرین ئێمـە ، دەبـێ یـا من بـم یـا ئـەو !

# بێخود

## باشوری کوردستان

( ١٨٧٥ — ١٩٥٥ )

(بێخود)، ناوی (مەحموود) ە و کوڕی موفتی حاجی مەلا ئەمینی کوڕی موفتی گەورە حاجی مەلا ئەحمەدی چاومارە کە ناوبانگی بە (پیرحەسەن) دەرکردووە. ئەمیش کوڕی مەلا مەحموودی دێلێژەیی پیرحەسەنی کوڕی مەلا ئەحمەدی دێلێژەییە کە لە ساڵی (١٢٠٦)ی کوچیدا کۆچی دوایی کردووە. ئەمیش کوڕی مەلا محمدی دێلێژەییە کە بەناوبانگ بووە بە مەلای گەورە) و لە ساڵی (١١٧٣)دا لە دێلێژە وەفاتی کردووە. ئەم زاتە خوێندنگایەکی گەورەی هەبووە لە دێلێژە و هاوچەرخی شێخ (رضا)ی دێلێژە بووە.

مەلا (محمود) پیر حەسەنیی کوڕەزای مەلا محمدی گەورە، لای زانای بەناوبانگ (ابن الحاج)ی جێشانەیی خوێندوویەتی، وە پاش ئیجازە وەرگرتنی خوێندنگایەکی گەورەی کردووەتەوە لە دێلێژە، وە پاش دروست کردنی شاری سلێمانی لە ١١٩٩ دا، چووەتە ئەوێ، وە لەگەڵ شێخ معروف نۆدێییدا پێکەوە لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی دەرسیان وتووەتەوە. وادیارە پێکەوەش فەقێی لای (ابن الحاج) بوون.

ئەم زاتە سێ کوڕی زانای پایە بڵندی بووە: (مەلا حسن)، (مەلا حسین)، مەلا أحمد). مەلا حسنی ناردووەتە (مەرگە)ی پژدەر، وە مەلا حسینی لە دێلێژە بەجێ هێشتووە(١)

وە مەلا ئەحمەدی لەگەڵ خۆی بردووەتە سلێمانی. وە بەم جۆرە باڵی زانستی بەسەر ئەو ناوچانەی کوردستاندا کێشاوە. ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٣٩ کۆچی دا کۆچی دوایی کردوە.

مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محمودی پیر حەسەنی، کە بەناوبانگ بووە بە (چاومار)، لای باوکی و لای شێخ معروف نۆدێ و مەلا عبداللەی ڕەش خوێندوویەتی کە بەناوبانگ بووە بە (مەلا ڕەش) وە (شێخ الاسلام)ی بابانەکان بووە. ئیجازەشی لای شێخ معروف نۆدێ وەرگرتووە. ئەم زاتە لە مزگەوتی مفتی دا دەرسی وتوەتەوە لە خۆی دروستی کردووە، وە ئەکەوێتە نزیکی بەردەرکی سەرای ئێستای سلێمانی.

وە خوێندنگایەکی گەورەشی بووە. ئێستا جێگای ئەو خوێندنگایە و ماڵی مەلا ئەحمەد خۆی، ئوتێل و دووکانەکانی (حاجی برایم ئاغایە)، زانایانی بەناوبانگی وەك مەلایی پێنجوێنی و مفتی زەهاوی و شێخ ئەحمەد فائز لای ئەم زاتە خوێندوویانە. لە ساڵی ١٢٥٥

کوچی دا بووه به ( رئیس المدرسین)ی سلێمانی، وه له ساڵی ١٢٧٩ کوچی دا پایەی مفتی‌یەتیی دراوەتیّ، وه له ڕەجەبی ساڵی ١٢٨٨ کۆچی دا له حیجاز کۆچی دوایی کردووه

له پاش وەفاتی (چاومار) حاجی مەلا ئەمینی کوڕی جێگای ئەگرێتەوه، وه له ١٣٠٣ ـ بووه به حاکمی سلێمانی، وه له ساڵی ١٣٠٧ کۆچی دا بوه به مفتی و مەدالیەی مەجیدیی دراوەتیّ و، کراوه به وەکیلی دائیرەی مەشیخەتی ئیسلامی له سلێمانیدا. ئەم زاته له ٣١٥ کۆچی دا کۆچی دوایی کردووه. گەلێك نووسراوی بەنرخی هەیه.

پاش حاجی مەلا ئەمین، مەلا عبدالعزیزی کوڕه گەورەی ئەبیّ به مفتی سلێمانی، که لەوکاته دا تەمەنی ٢١ ساڵ بوو، بەڵام پایەیەکی زانستیی بەرزی هەبووه. وه هەر بەهۆی ئەو پایەی زانستییەوه کراوه به ئەندامی کۆڕی زانیاری( المجمع العلمی)ی دەوڵەتی عوسمانی و مەدالیەی مەجیدی پێدراوه، وه گەلیّ ئەرکی گەورەی تری پیّ سپێراوه وەك سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی مەعاریفی سلێمانی و، حاکمیەتی و وەکالەتی دائیرەی مەشایخەتی ئیسلامی له دەوڵەتی عوسمانیدا که مەرکەزەکەی له ئەستەمبوولّ بووه، هەروەها بەهۆی پایەی زانستییەوه کاربەدەستانی دائیرەی مەشایخەتی ئیسلامی ویستوویانه له خۆیانی نزیك خەنەوه، وه له ساڵی ١٣١٨ کۆچی کردوویانه به مفتی (بۆرسه)، بەڵام نەچووه. وه له ساڵی ١٣٢٠ کۆچیش دا کردوویانه به مفتی (ئەدرنه)، بەڵام ئەوەشی نەویستوه.

که ئینگلیزەکانیش سلێمانی یان داگیرکرد، مفتی بەربەرەکانیّیەکی توندی کردن. لەبەر ئەوه بەتوندی لەگەڵی جووڵانەتەوەو هەموو ئەو فرمانانەیان لێسەندووەتەوه که پێی سپێرابوو.

پاش دامەزرانی حوکوومەتی خۆماڵیش، مفتی هەر بەردەوام بوو له بەجێهێنانی ئەرکه ئاینییەکانی سەرشانیدا بۆ خزمەتی ئیسلام و موسوڵمانان، وه سەردەمێك سەرۆکی لقی کۆمەڵی (الهدایه الاسلامیه) بوو له سلێمانی.

ئەم زاته له(٥ ی شوال)ی ١٣٦٦ کۆچی، ڕێکەوتی ١٩٤٧/٨/٢٠ دا ئەم جیهانەی بەجێهێشت.

(بێخود) یش له ساڵی ١٢٩٦ کۆچی دا هاتوەته دونیاوه(٢)، وه لای زانایانی ناوداری ئەو سەردەمەی سلێمانی خوێندنی تەواو کردووه. وه له ساڵی ١٩٠٠ زاینی دا کراوه به حاکمی هەڵەبجه، وه لەگەڵ مامۆستایان (رفیق حلیمی) و (زێوەر) دا خوا لێیان خۆش بیّ دا مامۆستایەتیی کردووه، بیّ ئەوەی بەرانبەر بەوه هیچ مانگانەیەك وەربگریّ.

پێش کۆچی دوایی مفتیی کاکی، چەند ساڵێکی لە هەڵەبجە بەسەربردووە. ئەوجا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، وە تا مردنی لە جێگاکەی ئەودا مفتی بووە.

کاتژمێر سێ و چارەکی پاش نیوەڕۆی ١٩٥٥/٨/٢٥ بەرامبەر بە (١٣٧٦ی کۆچی) بۆ یەکجاری ماڵئاوایی کرد. بە کۆچی دوای ئەم زاتە سەرچاوەیەکی تری شیعری کلاسیکی کوردی وشك بوو..

**چەند پارچەیەك لە شیعرەکانی:**

**دەفەرموێ:**

ئەو سینە لە غەش خاڵی یە، ئەو بێ ڕق و کینە ئەو خادیمی شەرعی نەبەوی و میللەت و دینە
مەعلووم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینـــە وام زانی کە فەوتاوە نەفەوتاوە دڵی مـــن

**یان دەفەرموێ:**

ئەی خودا ، ئەی رافیعی نۆ سەقفی گەردوون بێ عەمەد
نیعمەتت بۆ ئێمە (لا یحصی)، صیفاتت (لا یعـــد)
(شکر لله) تا دەوامی بێ لەگەڵ ڕۆحا جەســـەد
پڕ زمان و دڵمە یارەب (قل هو الله أحـــد)
ذیکر و فیکري ظاهیر و باطینمة (الله الصمـــد)

**هەروەها خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر (درودی خوا لەسەر بێت) دەردەبڕێت و دەفەرموێ:**

هەموو ڕۆژێ بە باوباپیر و خۆم و کەسەوە صەدجار لە سەر تا پایی من قوربانی سەر تاپایی پێغەمبـــەر

سالّی لەدایکبوونی (بێخود)، بە حیسابی ئەبجەد، دەکاتە ئایەتی (عسي ان یبعثك ربك مقاما محمودا).

بێخود لە هەڵبەستێکدا بۆ پێغەمبەر ( درودی خوای لەسەر دەبێت ) دەڵێ ...

دەخیلت بم نەرەنجینی دڵی ئەولادی پێغەمبەر
لەدنیا و قیامەت خۆت نەکەی رسوایی پێغەمبەر
رەسوولاللەو عاجز کردنی ئەولادی ئەو هەیهات
(معاذالله) لە گەردی خاتری مینایی پێغەمبەر
زمانت بگرە تا پاپۆڕیئیمانت سەلامەتبێ
پەنا بە خوا لە گیژی حیددەتی دەریای پێغەمبەر

**ئەبێتە مانگی گیراو تا ئەبەد رورەش ئەبیٚ باللە**

**بە وەرچەرخاندنی رووی رۆژی حەشر ئاوایی پێغەمبەر**

**کە ئیمرۆ کوندەبوی ئەملالەو خانووی عیترەتی ئەوبیٚ**

**سبەی چۆن ئەچێتە ژێر سایەی هوما ئاسایی پێغەمبەر**

**هەتاکەی هەر خەریکی مەحوی ساداتی کە ناترسی**

**لە قەهری حەیدەرو کوورەی دڵی زەهرایی پێغەمبەر**

**بە شارەت بیٚ جەهەننەم جێگەتە ئەی باعیضی سادات**

**بە گووبای قامەت و رووی (جَنَّةُ الماوا)یی پێغەمبەر**

## حەمدی

## باشووری کوردستان

## (١٨٧٦ - ١٩٣٦)

ئەحمەد بەگی کوڕی فەتاح بەگ (١٨٧٦ - ١٩٣٦) ناسراو بە حەمدی ناوی تەواوی ئەحمەد کوڕی فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگی مەحموود بەگی ساحێبقڕانە. شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە و لە شاری سلێمانی لەدایك بووە. مرۆڤێکی خاوەن بیر و باوەڕ بووە و ڕێبازی تایبەتی خۆی هەبووە. حەمدی لە بنەماڵەی ساحێبقران بوە و برازای مستەفا بەگی ساحێبقرانی کوردی بوە و هەر وەها لەگەڵ سالمیش دا خزمایەتیی هەیە. حەمدی لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا ماڵەکەی داگیرکراوە، کتێبخانە گەورەکەی سووتێنراوە، بەمەش هەوڵ و تەقەلای ٢٤ ساڵی دەفەوتێت.

حەمدی لە منداڵییەوە دەستی کردووە بە خوێندن، لە قوتابخانەی سەرەتایی و ڕوشدییەی عەسکەری و مزگەوتەکاندا خوێندوویەتی. لە خوێندندا زۆر زیرەك بووە. هەر لە منداڵیەوە ئارەزووی شیعری هەبووە و حەزی لە شیعروتن کردووە و ساڵی ١٨٩٢، لە تەمەنی ١٦ساڵیدا یەکەم شیعری وتووە و بەردەوام بووە لە سەری تا ساڵی ١٩١٥ کە ساڵی داگیرکردن بووە.

ئۆخەی ئۆخەی چەندە یارم نازەنینە شۆخ و خـــۆش
وەك کری دارە بەخەندە وا بەغــــمزە خـــۆفرۆش
ئەوشـــەکر گوفتارە وەکو تووتـــی منی خستە قســـە
نوخشەبێ ئـەوجا لەخونچە موژدە بێ بولبول لـــەتۆش
ئەو گوڵە دەمووتم کـەبــــێ داوێنی ئەگـرم وەك درك
نەم ئـــــەزانی ئـــەوکەبــــێ نابێ بمێنێ ئەقڵ و هۆش
دڵ پـــر و خـــــاڵی دەرونن عاشقانت مسلی نـــەی
گەر رەقیب دەمیان لە دەم نێ جامەگــەر بێنە خـەرۆش
تۆکە پڕ مەغزە بــــــرا کاسەی سەرت دەست هەڵگرە
نۆبەیانە باپــری کەن کـــاسە خاڵی کـــەن لە بـۆش
من کە مەی خوارم لەگـەڵ شێخ وادەمــان ڕۆژی حەشر
نۆشی گیـانی بـێ بنۆشێ خوێنی جەرگی بـادە نۆش
ئـەو ئـــەوا دەرکەوت و رۆژئـاوا ئەزانی بۆچــــی بوو

عەیبی بوو چێشای بەسەریا شەو وەکو سەر پۆش پــۆش

(حەمەـــدی) ا ئەمڕۆکە کە عالەم گوێ قوڵاغی ناڵەبن

دەس بە دەمتۆ بگرە تۆ دونیایە نابێ قـــەت خـــامۆش

## سالم

### باشوری کوردستان

(١٨٠٠-١٨٦٦)

عەبدوڕەحمان بەگی ساحێبقران (١٨٠٠-١٨٦٦) ناسراو بە سالم هۆنراوەنووسێکی کلاسیکی زمانی کوردی بووە. سالم و مستەفا بەگی ساحێبقران ناسراو بە کوردی ئامۆزای یەکترن.

سالم کوڕی محەمەد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقرانە و لە ساڵی ١٨٠٠دا لە شاری سلێمانی هاتوەتە دنیا. لە ساڵی ١٨٦٦دا مردووە و لە گردی سەیوان لە شاری سلێمانی بە خاك سپێردراوە.

ئەورەحمان بەگ ساحێبقران پیاوێکی لەڕ و لاواز و نەخۆش بووە و لەسەر ئەسپاردەی پزیشکێك نازناوی (سالم) ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و گوایە لە پێشدا نازناوی ( رەنجور) و ( بیمار) بووە و بەم جۆرە پزیشکەکە ویستوویەتی نوقڵانەی لەش ساغی بۆ لێبدا و بەوە دڵی خۆش بکا و هێزی پێیبدا .

سالم یەکێ لە هۆنەرانی هەرەبەرزی کوردە و هۆنراوەکانی گەڵێ شیرین و دڵگیر و پاراون و لە هۆنراوەکانی وادەردەکەوێ کە گەڵێ حەزی لە هۆنراوەکانی حافزی شیرازی و کەلیمی هەمەدانی و مەولەوی کردووە و زۆربەی هۆنراوەکان دڵدارین و لە گەڵ ئەوەشدا گەڵێ هۆنراوەی کۆمەڵایەتی و ئاینی هۆنیوەتەوە .

عەلائەدین سەجادی لە پەڕاوی ( مێژووی ئەدەبی کورد) دا سەبارەت بە سالم دەڵێ : هەرچەندە سالم لە هۆنراوەکانیدا زۆر جار باسی دڵخواز و دڵ لێچوون دەکا ، بەڵام دەرنەکەوتووە کە دڵ خوازێکی تایبەتی بووبێ بەقسەی هەندێ کەس دڵی چووە لە بەهێ ناوێك لە خزمەکانی خۆی و ئەو بووەتە سەرچاوەی هۆنراوەکانی .

وەڵێ ئەوی زۆرتر بڕوای پێی بکرێ جگە لە دیمەنی خوا کردی کوردستان تێکچوون و رووخانی بنەماڵەی بابان دەبێتە هۆی داخ و دەرد لە دڵی ئەودا هەموو ئەمانە دەبنە هۆی بناغەی هۆنراودانانی کە بە هۆی خوێندنەوەی هۆنراوەکانی پێش خۆیەوە ، بە تەواوی سەردەباتە ناو کۆڕی هۆنراوەوە .

سالم له هۆنراوی دڵداریدا تا بڵێی هۆنراوی سواره و هەتا حەز بکەی هۆنراوەکانی جوان و شیرین و پاراون و کەمتر هۆنەرێك توانیویەتی کە وەکو ئەو هۆنراوەی دڵداری بهۆنێتەوە .
سالم کە دێتە مەیدا هۆنراوەوە شۆڕشێکی گەورە بەرپا دەکا لە پارچە هەڵبەستێکدا باسی دڵدارەکەی دەکا

کە کورتژمی هۆنراوی پێبەخشیوە و بەم چەشنە رووی تێدەکات و دەڵێ ...

هەوای ماچی لەبت رێی بەندەری زوڵفی بەدڵ وون کـــــرد

موسافیر بۆ سیاحەت سوویی چین چوو توشی ماچین هـــــات

کەلامی وەسفی حوسن تۆم ئەخوێند دوێشەو بەپەنهانــــــــی

لە پەردەی غەریبەوە تارۆژ بەگوێما دەنگ تەحسین هـــــات

دۆعام بۆ دەفعی چاوی بەد لە خوسنی تۆ ئەکرد ئیمشــــەو

لەدەم روحول ئەمین تا سوبحەدەم ئاوازی تەئمین هـــــات

حەدیسی کوشتنی فەرهادی میسکین پێت بڵێم چۆن بـــــوو ؟

لە شەو قادای بە سەریا تیشە ، وەقتێ دەنگ شیرین هـــــات

بەسروەی بای سەحەر یەکدەم کە نەفخەی زوڵفی موشکین هات

هۆنراوەکانی

تایبەتمەندیەکانی شیعری سالم بەکارهێنانی زۆری وشەی قورئانی، ئاماژە بە ڕووداوە مێژووییەکان و بەکارهێنانی وشەی فەلسەفی و سۆفیانەیە.

سالم لە وەڵامی قەسیدەی بادی خۆش مروری نالی دا قەسیدەیەکی نووسیوە کە ئاوا دەست پێدەکات:

جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحـەر

ئەی پەیکی موستەعید لە هەموو ڕاهی پڕ خەتەر

ئەی میروەحەی جەمالی مەهاسایی دڵبـــەران

وەی شانەزەن بە کاکولی تورکانی سیمبـــەر

سالم لە ئەم قەسیدەیەدا بە جوانی باسی بارودۆخی سلێمانی دوای ڕووخاندنی بابانەکان دەکات و سکاڵای زۆر لە ڕۆمییەکان دەکات کە بوون بە هۆی کاول بوونەوەی وڵاتەوە، لە

داوییدا داوا له نالی دەكات كه ئەو كاتەدا ڕوو له سلێمانی نەكاتەوە، له دوایین بەیتدا دەڵێت:

تۆ خوا بڵێ به حەزرەتی نالی: دەخیلی بم

بەو نەوعە قەت نەكا به سولەیمانیا گوزەر

**نموونەی هۆنراوەی كوردی**

ساقی له پەردە دەرهات، جامی شەڕابی هێنـــــا

دڵ خیرە ما له حێرەت مەه ئافتابی هێنـــــــا

یەك زەڕڕە عەكسی پرتەو، دەركەوت و تووری سووتاند

ئاوێنە سەختڕوو بوو، لەو عەكسە تابی هێنــــــا

تیماری چاكی سینەم، ڕاجع بە چاوی مەستـــــــه

بەختیش موافیقی عەشق، بۆ من خەرابی هێنـــــا

یارم له ئەندەروون هات، دەستی ڕەقیب له دەستـــا

غەمناك و شادمانم، ڕەحمەت عەزابی هێنـــــــا

بۆ تۆبە سووی مزگەوت، هاتم بچم له ڕێـــــــــدا

بۆ كۆیی مەی فرۆشان، عەزمم شتابی هێنـــــــا

ڕوو هەر له من ئەپۆشێ، وا حاڵیە كه جبریـــــــل

هەر خاسە بۆ من و ئەو، ئایەی حیجابی هێنـــــا

وەی وەی چ مەجلسێ بوو، دوێنێ له دەبدەبـــەی دڵ

دڵبەر شەڕابی گێڕا «ســالـــــــم» كەبابی هێنـــا

**نمونەی هۆنراوەی فارسی**

بر ســـر مـــصحف رو زلـــف چـلیپا داری

تو پریچـــهره مـــگر دین مـسیـحـــا داری؟

زده ای گره ی شبرنگ بـــــران صفحه ی رخ

روز و شب مجلس كـــــافر به كلـیسا داری

قصد قتلم نه به تنـــها كـند آن دیده ی مست

حون صد كـــايفه در كـردن ميـنـا دارى

زلف يلــــدا به رخ سـال تـوان ديـد شـبى

اين چه سرى است به يك مـاه دو يلدا دارى؟

سالم گەلێ وشەی و زاراوەی تایبەتی لە هۆنراوەکانیدا بەکار هێناوە کە هەندێ لەوانە خۆی دایهێناون و هەندێ تر لە هۆنەرانی فارس وەرگرتووە وەکو وێچوونی قژ و پەلکە بە مار و ئەژدیها ، زوڵف بە زنجیر و داماو مەکەن ، ئەبرۆ بە شمشێر و کەوان بەژن و باڵا سەوڵ و چنار ، روومەت بە چرا و گوڵ و مانگ ، بەدەم خونچە و پستە و زۆر حەزی لە ( جناس) و ( تشبيه ) و (استعاره ) و ايهام) کردووە .

سالم لە وێژەی فارسیدا دەستێکی زۆر بەرز و باڵای هەبوو لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەتاراندا بووە ، لە کاتی هۆنینەوەی هۆنراوەدا گەلێ ووشەی فارسی تێکەڵی هۆنراوەکان کردووە و هۆنەرانی تریش بە پێی رەوشتی ئەو رۆژگارە ئەم کارەیان کردووە و ئەمەشیان بە هۆنەرێکی زۆر گەورە دادەنا . وەکو لەم پارچە هەڵبەستەیدا ئەوەمان بە تەواوی بۆ دەردەکەوێ ..

دڵم شادە لەبەندی سیلسیلەی گێسووی دولبـــــــەردا

لە شانە خەوف ناکا دەفعەیێ لەم داوە دڵ بـــــــەردا

گڕی بەست دڵ لە سینەمدا لە حەسرەتدا سەرو و مێری تۆ

کە هەتتا ئاگری پڕ گڕ ئەسوتێنێ لە مەجمــــــــەردا

تەحەموول کە زەمانی کوشتنی من سورعەتی نـــــاوێ

لە دڵمایە بگێرم خۆ بەدەوری دەست و خەنجــــــەردا

سالم لەم پارچە هەڵبەستەشدا (جناس) یکی جوانی لە ووشەکانی (دڵبەردا) (دڵ بەردا) واتە دڵبەر و دڵبەردان بەکار بردووە بەراستی هەر لە دەستی ئەو هاتووە کە بەم چەشنە لە هۆنراودا هونەر بنوێنێ .

## شێخ رەزای تالەبانی
## باشوری کوردستان
## ( ١٨٣١ – ١٩٢٠ )

ناوی ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولرەحمان کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی مەلا مەحمودی زەنگەنەیە لە ساڵی ١٨٣١ی لەناوایی قرخ لە ناوچەی چەمچەماڵ هاتۆتە ژیانەوە، لەتەمەنی حەوت ساڵیدا لەلای باوکی، ئەوەی شاعیر و زانایەکی بە ناوبانگی ئەوسەردەمە بووە ، دەستی کردووە بە خوێندن و لەگەڵ خوێندنەکەشدا، ئەوەی زۆربەی بە فارسی بووە ، فارسیەکی زۆری خوێندەووە لەپاشان چەند پەرتووکێکی سەرەتایی لای شێخ عەبدولغەفووری مامی ئەخوێنی، بەفەقێیەتی چۆتە کەرکووک، ماوەیەك لەوێ ماوەتەوەو لای مامۆستا سەید محەممەدی بلاغ و حاجی سەعید ئەفەندی حیلمی زادە وانەی عەرەبی دەخوێنێ و پاشان دەچێت بۆ کۆیە ، لەلای زانای بەناوبانگ جەلی زادە مەلا ئەسعەدی باپیری مەلا محەممەدی کۆیە دادەمەزرێ، لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا ئەسعەد و شاعیری بەناوبانگ کەیفیدا پێکەوە فەقێ ئەبن لە مزگەوتی گەورەی کۆیە و هەرسێکیان لە ژوورێکدا ئەبن و دەخوێنن، پاشان زوویری و ناخۆشی ئەکەوێتە نێوان شێخ ڕەزا و کەیفی یەوە چونکە هەردوولا هۆنراوەی توانج و پلاری زۆر سەخت بەسەریەکا هەڵئەدەن، لەدواییدا مەلا ئەسعەد کەیفی دەر دەکا لەسەر شێخ ڕەزا.

لە دەوری فەقیەتیدا هاتۆتە شاری سلێمانی و لە مزگەورتی گەورە ، ئەوەی بە مزگەوتی کاك ئەحمەدی شێخ بەناوبانگ بووە ، خوێندوویەتی، ئەو کاتە زمانی تورکی باوبووەو دەبوایە بخوێنرایە و شێخ ڕەزا ناچار کراوە سەربەرێتە ناو وێژەی فارسی و فێربوونی زمانی تورکیشەوە .

شێخ ڕەزا تا ئەگاتە دەوروبەری ٢٥ ساڵی خۆی بە خوێندنی زمانی عەرەبی و وێژەی فارسی و تورکیەوە خەریك دەکات. پاش ئەوەی خوێندن تەواو دەکات بووە بە ئیمام لە دێی ڕەمەزان مامك لە ناوچەی زەنگەنە.

پاشان دەکەوێتە خولیای سەردانی وولاتان و پایتەختی میری عوسمانی، لە ساڵی ١٨٦٠ی زایینی دا بەسەر حەڵەبدا ئەچێ بۆ ئەستەمبول و دوو ساڵ لەوێ ئەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك لەناو هەولێردا لە کاروانچیەکان دەبیستێت کە هەر لەو ساڵەدا باوکی کۆچی دوای کردووە ، ئەم مردنەی باوکی زۆر کاری تێدەکا و دڵگران ئەبێ لەگەڵ

ئەوەشدا هەر دێتەوە بۆ کەرکووك بەناچاری، لەپاش شەش مانگێك لەبەر تێکچوونیان لەگەڵ شێخ عەلی برایا ، ئەچێ بۆ کۆیە و دەچێتە لکای شێخ غەفووری مامی.

شێخ غەفوور ئەیهێڵێتەوە بەو نیازە کە کچەکەی خۆی بداتێ، بەو هۆیەوە شەش مانگ لە کۆیە ئەمێنێتەوە و ئیش و کارێکی زۆری پێ ئەکەن و بەزوویری دەری دەکەن و کچەکەشی ناداتێ ئەویش گەڕایەوە بۆ کەرکووك و بە دەردی سەری و پەژارەیەکی زۆرەوە لە کەرکووك ژیان بە سەر دەبا تا ساڵی ١٨٦٦دا بۆ جاری دووەم ئەچێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ.

لەم کاروانەیدا ئەرز رۆم دەبینێ و ماوەیەك لە ئەستەمبوڵ ئەمێنێتەوە و بە هۆی شاعیرێتی خۆیەوە لە کامیل پاشا نزیك ئەخاتەوە .

لەوێشەوە ئەکەوێتە بەر چاوی پیاوانی بابی عالی دەنگ و ئاوازی هۆنراوەکانی لەو ناوەدا دەنگ ئەداتەوە ، هاتوچۆی هەموو دیوە خانێکی کردووەو لەگەڵ هەموو جۆرە کەسێکدا هەڵسوکەوتی بووە و زۆر چۆتە لای ئەحمەد پاشای بابان و مستەفا پاشای میسری.

بەهۆی کامیل پاشاوە ئەنێردرێ بۆ حەج و لەڕێگەی میسرەوە حەج ئەکا و ئەگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ لە ساڵی ١٨٧٤ی زایینی ئەگەڕێتەوە بۆ کەرکووك و بەتەواوی ئەستەمبوڵ بەجێ دێڵـێ. لەلایەن میری عوسمانییەوە موچەیەکی کەمی بۆدابین دەکرێ، خۆشی وردە وردە بە بەریەوە خەریکی کاری کشتوکاڵ دەبێت و ژیانێکی بێباك و ڕەندانە و وێژەیانەی ڕابواردووە.

زۆر جار هاتۆ چۆی وەسمان پاشا و مەحمود پاشای جاف و پیاوە ناسراوەکانی ئەو ناوەی کردووە ، تا ساڵی ١٨٩٨دا بەتەواوەی کەرکووکی بەجێ هێشتووە چۆتە بەغدا.

لەتەکیەی تاڵەبانی دانیشتووە ، لە بەغداش ژیانی لەگەڵ پیاوە ناودارەکان و وێژەیەکانی سەردەمەکەی بەسەر بردووە .

پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی سەلیم بەگی بابان و سەید عەبدولرەحمانی نەقیبی بەغدادا زۆر خۆش بووە ، تا ساڵی ١٩١٠دا لە تەمەنی ٧٩ ساڵیدا بە نەخۆشی زەحیری کۆچی دواییکردووە و لە گۆڕستانی گەیلانی لە نزیك شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا نێژراوە .

لە پاش خۆی دوو کوڕی لە پاش بە جێماوە یەکێکیان محەممەد خالسی شاعیرە ، ئەوەی دوای باوکی ١٠ ساڵ ژیاوە و ساڵی ١٩٢٠ کۆچی دواییکردووە ، دووەمیان شێخ عەبدوڵڵا، ئەوەی پاش خۆی بوو بە جێنشینی ئەویش لە ساڵی ١٩٤١دا لە بەغدا کۆچی دواییکردووە ، هەردووکیان لە گۆڕستانی گەیلانی لە تەنیشت باوکیانەوە نێژراون.

تەنانەت شێخ عەبدوڵڵا سێ کوڕی لە پاش بەجێماوە ، موقەدەم ڕەحمەتوڵا بەگ و حەسەن بەگ، ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٦ پارێزگاری سلێمانی بووە و شێخ عەلی، ئەوەی ساڵی ١٩٤٦ دیوانەکەی شێخ ڕەزای بۆ یەکەمجار چاپ کرد.

ساغ لە دنیا دا نەماوە گەر قسەی ساغت ئـەوێ

بێ هەزارت پێ نیشاندەم گەر قوڕمساغت دەوێ

**چەند نوکتە و بەسەرهاتەکانی شێخ ڕەزا :**

- جارێك شێخ ڕەزا بە کۆڵانێکی شاری سلێمانیدا دەڕوات، دەبینێت کوڕێك سەگێکی بە دەستەوەیە و جار جار نازاری ئەدات. شێخ ڕەزا زۆری پێناخۆش دەبێت و بە کوڕەکە دەڵێت: ئەو باوکت بۆ کوێ دەبەیت؟ یەکەوڕاست کوڕەکە دێتە وەڵام و دەڵێت: ئەوە دایکتی گاوە دەیبەم ئوسڵی دەرئەکەم.

شێخ ڕەزاش دەڵێ: توبە لەگەڵ ئەهلی سلێمانی.

- ڕۆژێك شێخ ڕەزا بە کۆڵانێکی شاری سلێمانیدا دەڕوات دەبینێ منداڵێك لەسەر سینیەك حەڵوا و گەزۆ و مەسکەت دەفرۆشێت. شێخ ڕەزا لێی دەچێتە پێشەوە و دەڵێت: ئەمانە چۆن دەفرۆشی؟ ئەویش دەڵێ بە پارە بە گەنم بە جۆ، شێخ ڕەزا دەڵێت ئەی بە گوو؟

منداڵەکە دەڵێت بەڵێ ئەگەر بەمەی خۆم دەری بێنم.

- جارێکیان کابرایەك لەلای شێخ ڕەزا زۆر ستایشی غەزەلێکی نالی ئەکات، شێخ ڕەزا پێی ئەڵێ باشە بۆم بخوێنەرەوە کابرا ئەڵێت:

ئەی سەرووی بڵند قەد برۆ تاق و مەمك جووت

کابرا لێرە ئەوەستێ هەرچی ئەکات هیچی تری لەو هۆنراوەیەی بیر ناکەوێتەوە . شێخ ڕەزا زۆر لەسەری ئەوەستێ هەر بیری ناکەوێتەوە دوای پێی ئەڵێت: هۆنراوەکە لە سەرەوە بخوێنەرەوە . هەر ئەو نیو بەیتە ئەخوێنێتەوە و هیچی تر، شێخ ڕەزاش دەڵێت:

فەرقی نەبوو ئەم شیعرە لەگەڵ میزوو لەگەڵ گووت

- ئەم تێکچوونەیان زۆر لەسەرچاوەکان دەڵێن لەسەر میراتی بووە ، بەڵام دکتۆر نوری تاڵەبانی لە پەرتووکەکەیدا گەشتێکی تر بە جیهانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەڵێت: لە سەر دەمی شێخ ڕەزا بووە کە زۆر جنێوی داوە .

- دەڵێن شێخ ڕەزا سێ کوڕ و کچێکی هەبووە وە کچەکەی تا ساڵی ١٩٧٣ هەر مابوو لە ژیاندا.

**شیعری هەجوو**

زۆرینەی شیعرەکانی شێخ ڕەزا بابەتی هەجوو و داشۆرین بوون بەتایبەتی بەرامبەر سدقی زەهاوی کە لەوێنای شاعیرانی عەرەب بووە (فەرزدەق و ئەختەڵ هتد...)

**نموونەی شیعری**

ڕۆژێ نەبوو ئەم دولبەرە بێ ڕەحمە وەفا کــا
جارێ نەبوو ئەم کافرە شەرمێ لە خودا کــا

حەیرانن ئەگیبا لە عیلاجی مەرەزی مــــن
لوقمانی ویساڵت مەگەر ئەم دەردە دەوا کـا

کارێ کە غەم و دەردی فیراقت بە منی کرد
سەرما بەهەتیو با بەدەواری شڕی ناکـــــا

نموونەی نشتیمان پەروەری لەم دێڕەی خوارەوە ئەو پەڕی نشتیمان پەروەری شاعیر دەنوێنێت لەکاتی ڕووخانی میرنشینی بابان و داگیرکاری عوسمانەکان و سەفەویەکان نووسیویەتی

لەبیرم دێ سولەیمانی کە دار و لەملکی بابان بـــــوو
نە مەحکومی عەجەم نە سوخرە کێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قاپی سەرا سەفیان دەبەست شێخ و مەلا و زاهیـــد
مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بـــوو

## وەفایی

## رۆژهەلاتی کوردستان

(١٨٤٤- ١٩٠٢)

میرزا عەبدورڕەحیم کوڕی مەلا غەفوور کوڕی مەلا نەسرولّلا، یەکێکە لە شاعیرانی کورد زمان.

وەفایی لە شاری سابلاغ (مەهاباد) لە سالّی ١٨٤٤ ز لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و بەرنامەی حوجرەی مزگەوتی لە زانستییەکانی ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە مەهاباد تەواو کردووە و هەر لەوێش مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە، بەلّام لەناو خەلّکی بە مەلا نەناسراوە و تەنیا میرزایان پێ وتوە. هیچ بەلّگەیێك بەدەستەوە نیە مەلایەتی کردبێ، بەلّام قوتابخانەی تایبەتی خۆی هەبوە و وانەی بە منداڵان وتوە و پێی ژیاوە.

وەفایی فیزی زل بووە، زەکات و سەرفترەی وەرنەگرتووە، موچەی فەقێیاتی نەویستوە.

شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری شیعری وەفایی بەدڵ بووە، لەو ڕێگەیەوە ناسیویەتی، خۆشی ویستوە لەبەر ئەوە لێی نزیك بۆتەوە. ماوەییێکی درێژ لای ژیاوە، شیعری بۆ خوێندۆتەوە، سکرتێرییەتی نووسینی بۆ کردووە و کاروباری خوێندەواری بۆ بەڕێوە بردووە.

وەك لە ژیانی شاعیر دەردەکەوێ چوونە حەج لە لای جۆرە ئارەزوویێکی لادروست بووە لە وانەیە بەهۆی هەلّوێستی بەرامبەر ئاین و حەزکردن بەگەشت ئەم ئارەزووەی لا دروست بووبێ.

لەدوا گەشتیدا بۆ سلێمانی لەسالّی ١٩٠٠ ز وا دەردەکەوێ ماوەییێك تێیدا ژیاوە و لەسالّی ١٩٠٢ ز حەجی سێیەمی کردووە. قسەی واش هەیە لە سالّی ١٨٩٨ ز لە گەلّ شێخ سەعید حەفید چووە بۆ ئەستەمبووڵ و لەوێوە لەگەلّی ڕووی کردۆتە ولّاتی حیجاز.

هەرچۆنێبێ وەفایی لەگەلّ کاروانی شێخ سەعیدی حەفید و سەید ئەحمەدی خانەقا و شێخ مستەفای شێخ عەبدولسەمەدی قازی و حاجی تۆفیقی پیرەمێرد چوە بۆ حەج، ئەگەر هەمووشیان لەو کاروانە دا نەبووبن لەڕێگەی گەڕانەوە ئەو کەسانە پێکەوە گەڕاونەتەوە.

لە سارای عەرەبستان لە سەردەمی گەڕانەوەی ئەو حاجیانە وەفایی تووشی نەخۆشی زەحیری دەبێ، مەرگ ماوەی نادا و لەو ولّاتە دوورەدا کۆچی دوایی دەکا و لە ناو لمی

بادیەی عێراق یان بیابانی شام لە لایەن هاوەڵەکانییەوە لە ساڵی ١٩٠٢ ز دوور لە نیشتمان بەخاک دەسپێردرێ.

پیرەمێرد دەڵێ: "بەدەستی خۆم لە بیابان وەفاییم ناشتووە."

وەفایی سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵی لەمەڵبەندی خۆی مەهاباد بردۆتە سەر. لەم ماوەیەدا خەریکی وەرگرتنی زانستی و زانیاری بووە.

لەدوای ئەوە لەجێگەیێك ئۆقرەی نەگرتووە لە هەکاری ولاتی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و شاری سلێمانی ژیاوە. چوونە حەجیشی لەو سەردەمانەدا کاتی زۆری ژیانی شاعیری بۆ خۆی بردووە.

**شیعری وەفایی**

وەفایی لە شیعردا شوێن کەوتووی (نالی)ە وە زۆرێك لە وشەکان و جوانیە ئەدەبیەکانی شیعری نالی لە شیعری وەفاییش دا ئەبینین. ئارەزووی لە لەف و نەشر بوە وە ئەم خاڵە لە زۆری شیعرەکانی دا ئەبینین.

نەخۆش و مەستی دوو چاوی کـالّم

حەقم بەدەستە ئەگەر بنـــــالّم

بەغەمزەی چاوت بەخەنــدەی زارت

بردیان بەغارەت خەو و خەیـــالّم

فەرمووت چلۆنی چ بڵێم عەزیـــزم

دوور لە زولفی تۆ، کافر بەحـــالّم

سەبا دەخیلم هە تاکو مــــاوم

بڵێ بەزاری برۆ بەخاڵـــــــم

دەمێکی بابێ دەوای دڵم کـــا

بەچاوەکانی گەلێ بێ حاڵـــم

(وەفایی) چی دیت لەسەر بگێڕێ

نەما لەسەر تۆ نە سەر نە ماڵــم

نمونەیەك تر لە هەڵبەستەکانی وەفایی ...

دڵ و دین هەرچی بوو قوربانی تۆ بوون هەتا کەی ئیدی ئەم ناز و عیتابـە!

بلا بەو ڕۆژە نەیلۆفەر نەسووتێ بە مەرگی من سەری زوڵفت وەلا بـــــە

له عەکسی عاریزت فرمێسکی چاوم گوڵاوی ڕووتە هەم خوونابی نابـــە
وەرە بنوێنە خۆت، بمکوژە قوربان بە دینێک کوشتنی عاشق سەوابـــە
وەرە بنوارە بەزمی عالەمی دڵ چ خۆش دەوریکە هۆشیاریی خەرابـــە
ئەگەرچی ناڵەیە هەر زەوق و شەوقە ئەگەرچی گریەیە عەینی سەوابـــە
بە ناڵینی دڵی سووتاوی عاشق هەموو هەر نەغمەیی چەنگ و ڕوبابـــە
بە چاو و گەردەن و ڕووخساری ساقی هەموو هەر شاهید و شەمع و شەرابە
گوتم: با قیمەتی وەسڵت بە دڵ بێ بە ماچێکیش لە زاری خۆت ڕەزا بـــە
کەچی فەرمووی: دڵت نەشکێ 'وەفایی' ئەوە سەودایە، زەرڕێکیش حیسابە

هەندێ لە هۆنراوەکانی وەفایی ...

کە شانەی دا لە زوڵفی تار و مـــاری
لە هەر تاێێکی باری نافە بـــاری
بە داو ...هەر تارە بۆ من بۆتە تارێـک
لە پێم ئاڵاوە زوڵفی تار و مـــاری
مەگەر تۆبوی بە گریەم هاتیە خەنـــدە
کە گوڵ پشکوت بەدەم هەوری بەهاری
وەرە سەر هەردوو چاوم تا بزانـــن
کەوا شیرینە سەروی جۆیـــاری
بە بەردا زوڵفی بەرداوە کە تاتـــا
شەوی گێرا بەرۆژ باغی نەهـــاری
لەبەر ئاوری دەروندا دەگریـــەم
بە بەرق ئەنگوتوە هەوری بەهـــاری
گوتم: ئەی تازە تازە غونچەی باغی جەننەت
گوتم: ئەی سەروی چین ماهی حەصاری
لەبەر تەوقی فیراق و ئیشتیاقـــت
فیراقی کرد دڵم تۆقی بـــەزاری
بەجارێ بمکوژە خوێنم بـــڕێژە
خەلاسم کە لە دەردی ئینتیـــزاری
برۆی تێکنا بەرودا ئارەقی ڕێـــت

له ماهی قەوسی دا شەبنم ئەبـــاری
وەها شێوا "وەفایی" دور له زوڵفــت
له داخی تۆ کە هەر گریانە کـــاری

ئەلئەمان سەر تا قەدەم سووتام و جانانم نەهـــــات
چاو له سورمەی خاکی رێ بووم راحەتی جانم نەهـات
خاڵ و خەت گوڵزار و رەنگی شۆخی بێباکم نـــەدی
زولف و روو هیندوو فەرەنگی شاهی خووبانم نەهـات
ئەی عەجەب گریام وەکوو هەوری بەهاران و کەچـی
پێکەنینی ئەو گوڵەی کاکۆڵ پەرێشانم نەهــــــات
چاوی خوێنین غەرقی پەروین بوو له بێمیهری گـوڵم
مات و حەیرانم لەسەر چی ماهی تابانم نەهـــــات!
حەڵقەیی زوناری زولفی بوو بو میحرابی دوعــــام
تورکی کافرکێش و یاری نا موسوڵمانم نەهـــــات
تەشنەلەب دێوانە بووم، سەرگەشتەیی زوڵماتی غــەم
دولبەری باڵا بڵاوم، ئابی حەیوانم نەهـــــــات
کەعبەیی روحم، حەبیبی من، عەجەب پەیدا نەبـــوو
قیبلەکەی دینم، تەبیبی دەردی پەنهانم نەهـــــات
نەی سیفەت ناڵینمە، بولبول تەریقەت شینمــــــە
شای شەکەر لێوان گوڵ و ئەگریجە لەرزانم نەهـات
بوو بە خوێن خونچەی دڵم، نەمدی هەوای خەندەی گوڵم
سووت دەر و ژوورم، سەدای بەرقی بەهارانم نەهـــات
چەند بە چەند گریام هەوای عیشقم لەسەر خاڵی نەبـوو
غەرقی تۆفان بووم کەچی تەسکینی سووتانم نەهـــات
وەك وەفایی تا بەکەی بگریم، بناڵێنم، بڵێـــــم :
ئەلئەمان سەر تا قەدەم سووتام و جانانم نەهـــــات
وەکو نەی کون کونە جەرگم، لە تاو هیجرانی تۆ بـۆیە
بە سۆزی نەی دەسوتێم و بە نەغمەی نەی دەناڵێنـــم

ئەگەر زوڵفت وەکو من عاشقی ڕووی تۆ نیە بۆچـــی؟!

...سەراپا تێکچوە، کەوتۆتە بەر پێت دەست و داوانــە؟!!

بە تیری غەمزە بملاوێنەوە، زوڵفم لە گەردن کـــــە

بە سەر هاتومە مەیدانت، بە دڵ بۆت بوومە نیشانـــــە

دەمێکی مەست و بیمارم، دەمێک بێ هۆش و هوشیارم

چ کەس نازانێ دەردی من، مەگەر ئەو چاوە کاڵانە

هەناسەی عاشقان بانەتگرێ، بێ مروەتی تا کـــەی؟

بترسێ ئەی گوڵی نازت بدەم لەو بای زریانــــــە!!

(وەفایی) بۆ گوڵێکی سەر و باڵات شێت و شەیدایە

وەکو قومری دەناڵێنێ، وەکو بولبول غەزەل خوانە

## وەلی دێوانە
## باشوری کوردستان

وەلید کوڕی کوێخا محەمەد ناسراو بە وەلی دێوانە هۆنراوەنووسێکی کوردی سەدەی هەژدەهەم بووە. هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە کە بە شێوەزاری هەورامی بوونە پشتاوپشت بیستراون. بۆ یەکەمجار هۆنراوەکانی لە ڕۆژنامەی ژیان و ژین بڵاو کراونەتەوە، پیرەمێردی شاعیر گرنگیەکی زۆری بە هۆنراوەکانی داوە و کردوونی بەشێوەزاری سۆرانی. مەحمود خاکی لە ساڵی ١٩٧٠ و عوسمان هەورامی لە ١٩٧٦دا هۆنراوەکانی وەلی دێوانەیان کۆکردووەتەوە و چاپیان کردووە. وەلی دێوانە شارەزای زمانی فارسی بووە.

ناوی وەلید کوڕی کوێخا محەمەدی تیرەی کەماڵەییە. باوکی پیاوێکی خانەدان و موڵکداربوە. لە دەشتی شاکەل و شێروانە هاتۆتە دنیاوە. لە سەرچاوەکاندا ساڵی لە دایک بوونی ئاشکرا نییە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە لە سەدەی هەژدەیەمدا ژیاوە و مردووە (لە ساڵی ١٧٥٦دا هێشتا لە ژیاندا بووە).

لە تەمەنی منداڵییەوە باوکی حەزی کردوە فێری خوێندن و نووسین ببێت، لە شاری سلێمانی فەقێیەکی بۆگرتوە فێری خوێندنی بکات و لەسەر دەستی ماموٚستاکەی مەلا یوسف فێری خوێندن و نووسین و و قورئان بووە. خوێندەواری وەلی دێوانە و ناوبانگی ماموٚستاکەی گەیشتۆتە هۆزەکانی تر. کوێخا قادر شێروان کە یەکێک بووە لە سەرۆک خێڵەکانی تیرەی کەماڵەیی و کچێکی هەبووە بە ناوی شەم (شەمسە) داوای لە ماموٚستاکەی کردووە ئەمیش فێری خوێندن بکات و پێکەوە لەگەڵ وەلی دێوانە خوێندوویانە. وەلی شەیدای شەم دەبێ و پەیمانی خۆشەویستیان بەستووە. دەچن بۆ خوازبێنی و بەڵام بڕیاریان داوە تا لە کوێستان بگەڕێنەوە بەدەستگیرانی بمێننەوە. لە کاتی کۆچی هاوینەی جاف بەرەو کوێستان، ناکۆکی لە نێوان بنەماڵەی شاعیر و بنەماڵەی خۆشەویستەکەی لە کەلی پەیکوولێدا، ڕوویداوە. بەهۆی ئەو ناکۆکییەوە، دوو دڵدار بە یەک نەگەیشتن و لەیەکتری دابڕاون و یەکتریان نەدیوەتەوە. خۆشەویستی شەم زۆر کاریگەری هەبووە لەسەر ئەم شاعیرە و زۆربەی شیعرەکانی بۆ خۆشەویستی و لێک دابڕانی شەم بووە.

گۆڕی وەلی دێوانە بە قەد پاڵی کێوی سەید سادقەوەیە لە شارۆچکەی سەید سادقی ناوچەی شارەزووردا.

**شیوەنی ڕەنجوری بۆمەرگی وەلی دیوانە**

یاران بیّ هەستم ،یاران بیّ هەستـــــم..

یاران لەداخی دڵم بیّ هەستـــــــم..

حاڵ ویەریشان ودڵ ماران گگەستـــــم..

ژیان وشادی دمرچوو لەدەستـــــــم..

.بەنگی خواردمەوە هۆنراوەی جوانـــــم.

خەفەت وەکو کێو بارە لەشانـــــــم..

بەلیلی ئەسرین لەچاودێتەخـــــــوار

دیدەی بینینم تاریك بوو یەك جــــــار

ئاگر لەدڵ ودەرونم بەربــــــــووە

دووکەڵی ئاهم چیای گرتـــــــووە

بۆکۆچی دواکۆچ‌اوەلی دێــــــوانە

ناوداری عەشق میرزای زەمانــــــــە

خاوەنی شیعری ئاودارو بەتـــــــام

میرزاوەلی بوو دیوانەی پرفانـــــــم

بەزم ونەزم تەڕ،خاوەن خەیاڵ بـــــوو

دانا و زانا ساحێب ئاساربـــــــوو

لەهەڵبەستی جوان پێشکەوتوو دیاربـــوو

ویردی سەرلێوی خاوەن وەزیر بـــــوو

بەیتی پرمانا زۆر رۆشن بیر بـــــوو

چرای رووناکی عێلی جافان بـــــوو

شانەی لەت لەت ی پرچ کلافان بـــوو

دەنگی دابوەوە لەهەمووشـــــــاران

بەرزی کردبوەوە ناوی نـــــــاوداران

هەرچەند کەم دو بوو شیعری خۆش تـەرزە

لەسایەی شیعری تیرەی سەربــــــەرزە

زەند و زەنگەنە جاف و باڵانـــــــی

هەموو سەربەرزن بە قەیس ی سانـــــی

لەشیعری شیرین تەواو مەشهوربـــــوو

لەهەڵبەستی جوان سەعدی دەستوربـــوو

نازدارو جوانی بن کورە وزەهــــاو

خانەدانانی ئێرمو ئەوبەرئـــــاو

هەمیشە دڵشاد بەشیعری خۆشـــــی

عەشقیان کەرم وکا عەشقی لەجۆشـــی

سینگی سەدەفی گەنجینەی دوربـــوو

دڵ و دەروونی لەزانین پڕ بـــــوو ..... تا کۆتایی .....

وەلی دیوانە دیسان لە پارچە هەڵبەستێك تردا دەڵێ ....

هەی شەمی بەشەوق چل چرای شـــەوان

هەی ژیانی من هەی ڕۆحـــی ڕەوان

هەی گلێنەی دیدەی بێ خـــەوان

هەی ئاسکی سەرکەل لەسێبەر ســـڵ کەر

هەی هەوای سازی کوێستانان لەســـەر

هەی عەنبەرین خاڵ سۆسەنی کـــــلاف

هەی ڕوناکایی ڕەشماڵانی جـــــاف

هەی من پەروانەی پەڕ سوتاوی تـــــۆ

هەی من گیرۆدەی زوڵفی خاوی تـــۆ

تۆ جارێ نایەی بۆ سەر وەختی مـــــن

گوێ نادەی بە ئاە زامی سەختی مـــن

ناپرسیت ئاخۆ من بوتۆ چۆنـــــم

بێ باکی لەتین قرچەی دەرونـــــم

هەوای کوێستانت وابۆ بــــــوەوە

حەیفت کرد منت لەبیر چـــــووەوە

بێ مروەتیت کرد هەی شەم دەربــــارەم

من بۆ تۆ قەیسی سیا ستـــــــارەم

وادەی من و تۆ دێوانەی خوابـــــێ

مەگەر ئەو ڕۆژە دادم ڕەوا بــــــێ

شەمی شەم ڕووەت تۆ بەسەلامـــەت

**سکالاّی دڵم کـــەوتە قیامــــــــەت**

**وەلی دیوانە دیسان لە پارچە هەڵبەستێك تردا دەڵێ ....**

**کوڵم ئەمویست بۆ هەموو ژیان لە رۆح و چاو و دڵما بی...**

**بۆ جرگەیەك لێم ون نەبیی و بۆ هەموو ژیان لەگەڵما بیت...**

**بۆ بەبێ هۆ بەجێت هێشتم و ماڵئاوایی یەکجاریت کرد...**

**نەتئەزانی دڵ ماندووم و بەم کۆچەت سەردەنێمەوە......**

**لەدوای تۆوە ئەبێ دڵم خۆشی بۆ چی بێ......**

**لەدوای تۆوە ئەبێ دڵم هەر رەنجە رۆ بێت.....**

**لەدوای تۆوە ئەبێ منیش دڵم دەربێنم.....**

**بەڵێنبێت بەڵێن بۆ دڵ.....**

**هیچ کەس نەدوێنم.....**

**دوای تۆ ڕوناکی چرام ڕوو لەکز بوونە....**

**سەروەت و گەنجی دنیام وەك مەم بۆ زینە...**

**دێوانەم سا دوای تۆ پشت لە خێڵ ئەکەم......**

**هەر وەك وەلی دێوانە هەواهی شەم کەم........**

## عەلائەددین سەجادی
## باشووری کوردستان
## ( ١٩٠٧ – ١٩٨٤ ز )

ئەگەر لێرەوە لاپەڕەی پرشنگداری ئەدەبی کوردی هەڵبدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە کورد میللەتێکی پێشکەوتووە ، لەو رووەوە لەنێو لاپەڕەی مێژووی ئەدەبو فەرهەنگی کوردیدا بەسەدان شاعیرو ئەدیبو نوسەرو رۆژنامەنوسی پایەبەرز دەبینرێت، کە هەوڵی پێشخستنی ئەدەبی میللەتەکەمانیان داوە، لەنێو ئەوانەدا نوسەرێکی دیار بەناوی (عەلائەدین سەجادی) بەدی دەکرێت کە توانی گەشە بەوێژەو ئەدەبی کوردی بدات .

ناوی تەواوی (عەلائەدین نەجمەدین عیسامەدین)ەو لەبنەماڵەی ناوداری (سەجادی)یە. ساڵی (١٩٠٧) هاتۆتە دنیاوە لەخێزانێکی ئایینیدا گەورە بووە .

ساڵی (١٩٢٧) بۆ خوێندن هاتووەتە شاری سلێمانیو لەمزگەوتی شێخ جەلالو مزگەوتی حاجی مەلا رەسوڵ بەفەقێیەتی دامەزراوە، ساڵی (١٩٣٨) مۆڵەتی مەلایەتی لای مامۆستا شێخ بابەعەلی تەکیەیی وەرگرتووەو چووە بۆ بەغداو لەمزگەوتی نەعیمە خاتوون لەمەیدان بووە بەپێشنوێژو دانیشتنو کاری رۆژانەی لەو مزگەوتەدا بووە، لەبەغدایش لای مامۆستایان شێخ ئەمجەد زەهاویو شێخ محەمەد قزڵجی بەهەندێ لەزانستە ئیسلامییەکاندا چووەتەوە، لەساڵی (١٩٣٩)دا چووەتە مەیدانی رۆژنامەنوسیو لەساڵی(١٩٤١)دا بووە بەبەڕێوەبەری گۆڤاری (گەلاوێژ)و وردە وردە گەشەی پێکردووە تا داخستنی لە(١٩٤٩)دا .

لەساڵی (١٩٤٨)دا پاش ڕاپەڕینە مەزنەکەی کانون، گۆڤاری (نزار)ی بەعەرەبیو کوردی دەرکردووە کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری سیاسی بووە، پاش شۆڕشی پیرۆزی ١٤ی تەمموزو تا ساڵی (١٩٧٤) مامۆستای ئەدەبو مێژووی ئەدەبی کوردی بووە لەکۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا، هەر لەساڵی(١٩٧٤)دا کراوە بەئەمینداری گشتی ئەوقاف و (٣) ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە، ساڵانی پاشەوەی بەخانەنشینیو خزمەتی ئەدەبەوە بەڕێ کردووە، ١٩٨٤/١٢/١٣ کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لەشاری بەغدا لەنزیک شێخ عەبدورەحمان ئەبولوافی نەقشبەندیو شێخ ڕەزای تاڵەبانی بەخاك سپێردراوە.

لەو کتێبەی (دلێر عەلادین سجادی) کە بەناوی (یادی سەجادی) لەساڵی (١٩٨٧)وەك وەفایەك بەئەدەبی کوردیو بەباوکی دەریکردووە، لەو بابەتە بەپێزانەی کەڵك وەربگرم .

سالی (١٩٨٤) سالی پرسەو ماتەم بوو، چونکە لەو ساڵەدا هەندێ ئەدیبو نوسەرو ڕۆشنبیری وەك (ئەمین میرزا کەریم، تۆفیق وەهبی، جگەر خوێن، حسێن خانەقا، خاڵە ڕەجەب، حەبیب عەلی میرانی، تاهر سادق ، عەلادین سەجادیو محەمەد فیدا) کۆچی دواییان کردو هەریەکەیان بەجۆرێك خزمەتی میللەتەکەمانیان کردووە، لەناو ئەم ناوانەدا مامۆستا (عەلادین نەجمەدین سەجادی) چل ساڵە پتر ژیانی خۆی لەپێناوی زیندووکردنەوەی کەلەپوورو نوسینەوەی مێژووی ئەدەبماندا بەخت کردووە، ئەو سەردەمەی مامۆستا سەجادی چووەتە بەغداو بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری کوردی سەری هەڵداوە (کوردیو مەریوانی) دوانزدە کتێبیان چاپ کردووە، لاوانی کوردیش (یادگارو دیاری)یان بڵاوکردۆتەوە (یانەی سەرکەوتن)یش لەچالاکیدا بوو، (ژیان) لە سلێمانی و (روناکی) لەهەولێر دەردەچوون، سەجادی پەیوەندی لەگەڵ ڕوناکبیرانی ئەو سەردەمەدا پەیدا کردووەو ئەوانیش کاریان تێکردووە، لەدوا مانگی ساڵی (١٩٣٩)دا گۆڤاری (گەلاوێژ)لەبەغدا هەڵاتو تیشکی پڕ شەوقی چیاو هەردو دۆڵەکانی کوردستانی ڕوناك کردەوە مامۆستا سەجادی ئاشنایەتی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئەم گۆڤارەدا هەبوو .

لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەری گۆڤارەکە لەبەغدا نەما، کاروباری گەلاوێژ خرایە ئەستۆی سەجادی و هەر خۆی کەرەستەی بۆ کۆ ئەکردەوەو لەچاپخانەدا سەرپەرشتی ئەکردو پیتاك و ئابوونەشی بۆ داین ئەکرد، سەجادی لەساڵی (١٩٤٨)دا شانبەشانی گەلاوێژ گۆڤارێکی نیو مانگی رامیاری بەناوی(نزار)ەوە بەکوردیو عەرەبی بڵاوکردۆتەوە، پاش ئەوەی بیستو دوو ژمارە لەو گۆڤارە دەرچوو، کاربەدەستان (گەلاوێژ)و (نزار)یان لەساڵی(١٩٤٩)دا داخست

پاش ئەوە مامۆستا دەستی دایە کتێب نوسین، ئەوەبوو لەساڵی (١٩٥٢)دا (مێژووی ئەدەبی کوردی) بەقەوارەی(٦٥٢) لاپەڕە پێشکەش کردین کە تیایدا وتویەتی (خۆم گەلێ بەبەختیار ئەزانم کە خوا یارمەتی داموو توانیم لەماوەی چەند ساڵێکدا بەکۆششی فیکرو ماڵی خۆم، ئەم کتێبە کە مێژووی ئەدەبی کوردیە یا بەواتایەکی فراوانتر (دائرە المعارف )ی کوردی یە، بێنمە بەرهەمو پێشکەشی بکەم) لەدواییدا ئەڵێت:(هێنام ئەدەبی کوردیم کرد بەکۆشکێکو بەدنیایەك بەڵام نەك کۆشکێکی داروپەردوو، چونکە ئەو جۆرە کۆشکانە لەبەر پلاری گەرمای هەتاوی هاویندو سەرمای بەفری زستاندا خۆیان ناگرن، کردم بەکۆشکێك نە باکی بەکڵپەو بڵێسەی هەتاوو هاوین بێ، نەبەتۆفو کرێوەی بۆرانی زستان).

کاتێکیش بەدرێژایی سی‌و پێنج ساڵ کە ئیمامی مزگەوت بووە، هەموو ڕۆژێك نێوان نوێژانی مەغریب‌و عیشا لەمزگەوتە بچکۆلانەکەیدا ئەدیب‌و ڕۆشنبیرو ناسیاوانی لەدەوری کۆ ئەبوونەوەو دەست ئەکرا بەگفتوگۆو نوکتەو قسەی خۆش. بۆیەش ئەو هەلەی لەدەس نەداوەو ئەو قسە خۆش‌و نەستەقانەی کە بەدڵی بووبێت تۆماری کردوون‌و سەرلەنوێ دایڕشتوونەتەوە، ئەوەبوو لەساڵی (١٩٥٧)ەوە تا ساڵی (١٩٨٣) هەشت بەرگە کتێبی بەناوی (رشتەی مرواری)یەوە لێ چاپکردن، کە بوو بەجۆرە ئەدەبێکی زیندووی میللەتەکەمان .

لەساڵی (١٩٥٣)یشدا سیپارەیەکی ناوی کوڕو کچی کوردی پێشکەش باوك‌و دایکان کرد. لەناوەڕاستی پەنجاکاندا گەشتێکی (١٨١٦) کیلۆ مەتری بەناو کوردستاندا کردو ئەم گەشتنامەیەی کردە کتێبێکی سەربەخۆ، کە شۆڕشی چواردەی تەمموزی (١٩٥٨) بەرپابوو. هات شۆڕشەکانی بەدرخان‌و سمکۆو حەمەپاشای ڕەواندز‌و شێخ مەحمودی لەکتێبێکدا بۆ لەچاپدان‌و هەڵوێستی کوردی بەرامبەر کۆمار دەربڕی.

هەروەها لەفۆلکلۆری کوردیشەوە سێ چیرۆکی لەکتێبی (هەمیشە بەهار)دا لەساڵی(١٩٦٠)لەچاپ داو دەربارەی زمانیش لەساڵی (١٩٦٢)دا کتێبی (دەستورو فەرهەنگی کوردی) بڵاوکردەوە، لەساڵی (١٩٦٩)دا خوالێخۆشبوو لایەکی لەڕەخنەی ئەدەبی کوردی کردەوە بەکتێبی (نرخ شناسی) ئەو کەلەبەرەشی پڕکردەوە، پاش ئەوە بەدە ساڵ جوانکاریەکانی ناو ئەدەبی کوردی لەکتێبی (خۆشخوانی)دا خستیە بەردەست‌و دەربارەی ئەم دوو کتێبە دەڵێت ((هێنام ڕستەی خۆشخوانیم کرد بەوشەیەك‌و کردم بەناو بۆ ئەم کتێبە کە قسە لەڕەوانبێژییەوە دەکات، وەکو لەکاتی خۆشیدا رستەی نرخ شناسیم کرد بەناو بۆ ئەو کتێبە کە باس لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی دەکات))!!

ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی بڕوانینە بەرهەمەکانی دەبینین زۆربەی زۆریان دەربارەی ئەدەبی کوردین‌و هەندێکیشیان لەخانەی کەلەپوورو فۆلکلۆردا دادەنرێن‌و لەهەموو بەرهەمەکانیدا ئەمانەتی زانستی پاراستووەو هەموو سەرچاوەیەکی دیاری کردووەو لەنوسیندا شێوەیەکی نوێی گرتووەتەبەرو لەهەندێ بابەتە نوسیندا بەداهێنەر دەدرێتە قەڵەم

(مستەفا نەریمان) لەچلەکەیدا دەڵێت: (لەو چل‌و دوو ساڵەی کە مامۆستا سەجادیم تیادا ناسیوەو تێکەڵاویم لەگەڵ پەیدا کردووە، خووڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی وەك نووکی

قەڵەمەکەی خاوێنو بێگەرد بوو، لەپاشملە ناوی کەسی بەخراپە نەهێناوەو دڵی کەسیشی نەڕەنجاندووە).

بەو هێزەوە لەماوەی سیو یەك ساڵدا بیستو یەك کتێبی بەقەوارەی (٥٣٦٦) لاپەڕە چاپکردووە ئەمەش دەکاتە ٤٪ی کتێبی کوردی ئەو ماوەیە، هیچ نوسەرێکی کوردمان بەقەوارەی کتێب نەگەیشتووەتە ڕادەی خزمەتی ئەو جگە لەمامۆستای پایە بڵند (مەلا عەبدولکەریم مودەریس) کە بەسێ هەزار لاپەڕە کەوتووەتە ژوورییەوە.

سەرەرای ئەو هەموو بەرهەمە چاپکراوانە، سەجادی چەند بەرهەمێکی حازرە چاپی بەجێ ماوە وەك (بەرگی نۆهەمی رشتەی مرواری)و (بەرگی دووهەمی دەقەکانی ئەدەبی کوردی)و (کتێبی زیندەوەر)، هەروەها ڕۆژانە بیرەوەری تایبەت بەخۆی یاداشت کردبوو .

لەگەڵ ئەوانەشدا هەرگیز لەخۆبایی نەبووەو هەوڵی ئەوەشی داوە بەرهەمی پوختترمان پێشکەش بکات، ڕۆشنبیرو ئەدیبو نوسەر دەبێت لەژیاننامەو خورەوشتەکانی کەڵك وەربگرنو بیکەنە مەشخەڵ لەگۆڕەپانی ڕۆشنبیرییاندا، بەمە رۆحی مامۆستا شاد دەبێتەوە .

هەروەك خۆی لەپێشەکی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ: )دەمێ ساڵە، بگرە ئەوەتەی هۆشم کردۆتەوە، لەکانگای دڵەوە حەزم لەئەدەبو ئەدەبیات کردووە، بەو بۆنەوە گەلێ جار خووم ئەدایە خوێندنەوەی ئەو شتانە کە ئاشنایەتیان بەئەدەبەوە هەیە، بەتایبەتی هینەکانی ڕۆژهەڵات چ عەرەبی، چ فارسی، ئەمە بێجگە لەئەدەبیاتی ڕۆژئاوا – جۆشو خرۆشێکی ئەدامیو ئەیخستمە عالەمێکی ترەوە، ماوەیەکی باش ئەمە ئیشم بوو، بەبێ ئەوە بچم بەلای بیروباوەڕێکی ترا ! دواتر دەڵێت (ڕۆژێك شتێکم ئەخوێندەوە، کە لێبومەوە سەرلەنوێ لەدڵی خۆما وردم ئەکردەوە، لەمەوە کتوپڕ ئەوە هات بەبیرما کە ئایە من چیم؟ ئینگلیز؟ نەو . عەرەبم ؟ نەو ..بەڵکو کوردم باشە کە کوردم ئەبێ لەنەتەوەی کوردبم، کە لەنەتەوەی کورد بووم ئەمەی تێ گەیاندن، کە کورد ناوی لەلاپەڕەی ڕۆژگاردا هەیەو ئەمیش ئەمێکە بۆ خۆی، زۆری پێ نەچوو لەو زەرییایی خەیاڵە کەوتمە سەر ئەوە کە میللەت مادام میللەت بوو، بێ گومان دەبێ زمانو ئەدەبیاتو تاریخی (مێژووی) بێ، ئەگەر نەبێ بەهیچ ناژمێرریو هیچ نی یە، لێرەدا سەرم لێ تێکچوو . تەماشای خۆم ئەکەم هیچی تر نیم تەنها کورد نەبێ، تەماشای بارەکەی تری ئەکەم سەیر ئەکەم تەنیا کورد نەبێ هەموو شتێکی ترم! کسپەیەك لەدڵمەوە هات، بەوە دڵی خۆم دایەوە کە نەتەوەی قەومێکم کە لەبەرە بەیانی مێژووە بەم زمانە کە من قسەی پێ ئەکەمو پێی ئەنوسم قسە ئەکەنو هیچ کۆسپێك لای

نەداون لەرێگەی خۆیان، بەتایبەتی کە ئەمیر شەرەفخانی بەدلیسی لە (١٠٠٥)ی هیجریو (امین زەکی بەگ) لە (١٩٣٦)ی میلادی، مێژوویان بۆ قەومەکەم نوسیوە، بست بست گەشکەم ئەکردو هیوام بەخۆمو بەقەومەکەم تازەتر ئەبووەوە ...)

مومتاز حەیدەری لەچلەی ماتەمینی مامۆستای نەمردا دەڵێت: ((مردوو لنگی درێژ دەبێتەوە) ئەوەتا بەر لەساڵو نیوێك وتارێکم لەخولی دووەمی ژمارەی(١٢)ی نوسەری کورد لەژێر ناوی (مامۆستا سەجادی، خەرمان بەرەکەت)دا نوسی، داوای ئەوەم کرد تا مامۆستا سەجادی لەژیانە میهرەجانێکی ئەدەبی گەورەی ڕێزگرتنی بۆ ساز بکرێ، بەڵام بەداخەوە زۆریش بەداخەوە، بەتاقە دێرێکیش پێشوازی پێشنیارەکە نەکرا ..... !! ئێستاکەش وا پۆپۆی بۆ دەکەین، فرمێسکی بۆ دەڕێژین، ئەرێ تاکەی، زیندووکوژەی مردوو پەرست بین ؟!)

مامۆستا (هەژار موکریانی) لەوتارێکیدا بۆ کۆچی سەجادی نوسیوێتی ( ڕۆژێك سەیری دوکانێکی بەغدام دەکرد، چەقەڵێکی مۆمیایی کراوی لێدانرابوو، لەژێر قاچیەوە لێی نوسرابوو (بیستو پێنج دیناری تەواو) من سەری زمانی خۆم گەست، هات بەدڵما، هەیاران ! ئەم مام چەقەڵە موحتەرەمە ئاخۆ دەبێت بە زیندوویی سەر شاعیر، نوسەر، هونەرمەندێکی کورد بوبێ لەژیانیدا لەبرسانو لەترسان ئۆقرەی نەبوبێو ئێستاکێ لاشەی مۆمیایی بەم دەردو مەخسەرە چوبێ؟ کێ ئەزانێ؟ هەزار دانە بەزیندوویی فلسێ ناژێ ) .

هەژار درێژەی بەوتارەکەی دەداو باسی چەند ڕۆشنبیرێکی کورد دەکات ( مەلا مارف کۆکەیی) ئەگەر بێژم لەبرسا مرد ڕەنگە باوەڕم پێنەکەن، چونکە ئەو دەم نانی وشك زۆر هەرزان بووە ... قانیع هەتا مرد نانو دۆی خۆی لەپەنایەك نەدی ... فایەق بێکەس کە چریکەی گوێی دوژمنانی کەڕ دەکرد، دوو لێفەی لەماڵدا نەبوو کە خۆیو منداڵەکانی پێداپۆشێ بەقەرزداری عارەق بەقەرزداری مرد .... گۆران ئەو ئەستێرە گەشەی ئاسمانی ئەدەبیاتی کورد، بۆ دابینبوونی بژێوی دەگاتە یافای فەلەستین وتاربێژی ڕادیۆی (شەرقی ئەدنا) بێ ... جگەرخوێن پەنجا ساڵ پتر بۆ شیعرو چیرۆکی کوردی چەوسایەوە لەجیاتی نان خوێنی جگەری خۆی دەخوارد، چەند لەکوردستان ژیاو من دەمناسی گەسکلێدەری کۆڵانان لەو تێرتربوون، کەس ئیرەیی پێ نەدەبرد، ئەوانە لەژیان ئاوابون لەپاش مردنیان چاوا بوون ؟)

بەداخەوە ئێستا کە مردوپەرستیشمان نەماوە ئەوا (٢٣) ساڵ بەسەر کۆچی دوایی مامۆستای هەمیشەزیندوودا تێدەپەڕێت کەس لەپەڕەی ڕۆژنامەیەکدا ساڵیادی کۆچی دوایی نەکردووە، یان بابەتێکی دەستنوسی نەکرا بەکتێب بۆ؟ لەم (٢٣) ساڵەدا تەنها لەژمارە (٢٨)ی گۆڤاری (ڕۆڤار) کە تایبەتە بەدامەزرێنێك یادی کردۆتەوە، بەڵام دەرچوونی ژمارەکەی هاوکات نی یە لەگەڵ ساڵی کۆچی دواییەکەی، گۆڤارەکە ٢٠٠٤/٢/٢٥ دەرچووە، واتە ٢/٢٥ بەڵام، مامۆستا ١٢/١٣ کۆچی دوایی کردووە، من لەلایەن خۆمەوە زۆرزۆر دەستخۆشی لەکارمەندانی ئەو گۆڤارە دەکەم کە گۆڤارەکە سەر بەچاپو پەخشی سەردەمە، هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم .

هەرچەندە مامۆستا لەسەر بواری ئەدەبو ڕۆشنبیری دەستەی دەزگای میری مامۆستایان لەگەڵ دەستەیەك لاوانو قوتابیاندا ڕاپێچی بەندیخانە کردەوە، هەر لەو سەردەمەدا کوڕێکی بەناوی (دانا) شەهید کراوە، وابزانم ساڵی شەهیدکردنەکەی (١٩٨٢-١٩٨٣) بووە . هەتا لەژیاندا مابوو قسەی جوانی کردبوو، یەکێك لەو قسە بەنرخانەی ئەوەیە وتبوی (ئەگەر خۆت سەری خۆت نەخورێنی، کەس بۆت ناخورێنێ) ئەگەر بەڕێز (دلێر)ی کوڕی کتێبی (یادی سجادی) کەپێکهاتووە لەکۆمەڵێك وتارو شیعر لەیادەکەیدا خوێنراونەتەوە یان لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە، نەکردایە بەکتێب لەوە نەدەچوو کەس ئەو ئەرکەی بخستایەتە سەرشانی، زۆربەی شانۆکارو هونەرمەندان سودێکی زۆریان لە (ڕشتەی مرواری) کردووە، کردویانە بەنواندنو دراما کەچی کەس لەوانە شتێکی بۆ نەنوسیوە وەك وەفایەك، دەبێت بە بەوەفایانو نوسەران ئەو دەستنوسانەی کە مامۆستا مەرگ ڕێگەی پێنەدا بیکات بەکتێب، بیکەن بەکتێب یان زۆربەی کتێبەکانی لەبازاڕدا یان لەکتێبخانە ئەهلیەکاندا نەماون یان کە کەم بونەتەوە لەچاپی بدەنەوە بۆی، نەفەوتێنو کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بێتو گەنجانی ئەمڕۆش بتوانن سودی لێوەربگرن.

**ئەمەش ناوی کتێبەکانی و ساڵی دانانیانن:-**

١. مێژووی ئەدەبی کوردی، (١٩٥٢)و (چاپی دووەم ١٩٧١) .

٢. ناوی کوردی، (١٩٥٣) .

٣. ڕشتەی مرواری، بەرگی یەکەم، (١٩٥٧)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥)

٤. ڕشتەی مرواری، بەرگی دووەم، (١٩٥٧)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

٥. ڕشتەی مرواری، بەرگی سێیەم، (١٩٥٨)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

٦. ڕشتەی مرواری، بەرگی چوارەم، (١٩٦٨)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

٧. ڕشتەی مرواری، بەرگی پێنجەم، (١٩٧٢)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

٨. ڕشتەی مرواری، بەرگی شەشەم، (١٩٧٩)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

٩. ڕشتەی مرواری، بەرگی حەوتەم، (١٩٨٠)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

١٠. ڕشتەی مرواری، بەرگی هەشتەم، (١٩٨٣)و (چاپی دووەم ١٩٩٩)و (چاپی سێیەم ٢٠٠٥) .

١١. گەشتێك لەكوردستاندا، (١٩٥٦) .

١٢. شۆڕشەكانی كورد (١٩٥٩)و (چاپی دووەم ٢٠٠٥) .

١٣. هەمیشە بەهار (١٩٦٠) .

١٤. دەستوورو فەرهەنگی زمانی كوردی، (١٩٦١) .

١٥. ئەدەبی كوردیو لێكۆڵینەوەی ئەدەبی كوردی، (١٩٦٨) .

١٦. نرخ شناسی، (١٩٧٠) .

١٧. دوو چامەكەی نالیو سالم، (١٩٧٣) .

١٨. كوردەواری، (١٩٧٤) .

١٩. دەقەكانی ئەدەبی كوردی (١٩٧٨) .

٢٠. خۆشخوانی، (١٩٧٨) .

وە دوو نامیلكەی دەركردووە، یەكەمیان بۆ یادی شاعیری پایەبەرز (پیرەمێرد) كە بەناوی (یادی پیرەمێرد)ەوە لەساڵی(١٩٥١) دەری كردووە كە (١١٢) لاپەڕەیە، دووەمیان بۆ یادی مێژوونوسی پایەبەرز (محەمەد ئەمین زەكی بەگ) كە بەناوی (یادی كۆچی محەمەد ئەمین زەكی)ەوە لەساڵی (١٩٤٨)دا دەری كردووە كە (٨٠) لاپەڕەیە .

## شەهید قازی محمد
## رۆژهەلاتی کوردستان
## (١٩٠١ – ١٠٤٧ ز)

محەمەد بەهادین مەلا ساحیب . شەهید قازی محمد کوری قازی شەهید قازی محمد کوری قازی علی کوڕی میرزا قاسم کوڕی میرزا ئەحمەدە، لە ساڵی(١٩٠١)ز لە شاری مەهاباد لە دایکبووە، دایکی لەتیرەی فەیزوڵلا بەگییە، کە ئەوانیش لە مێژەوە ناو بانگێکی گرنگیان بووە لە وڵاتی موکریاندا.

پێشەوا لە ٢١مارت١٩٤٧ بەدەستی کۆنەپەرستانی ئێران لە مەهاباد و لەمەیدانی(چوارچرا) لە سێدارەدرا لەگەڵ هاوڕێکانی لە پێناوی ئەو بیرو باوەرەی کە لەگەڵ خوێنیا تیکەڵ بوو، و لەسەر ئەو سوێنەی لە کاتی خۆیا خواردی، کەتا دواهەناسەی لەگەڵ خەڵکابێت.

قازی محمد پیاوێکی، کەڵەگەت، چوارشانە، وەبەخووەبوو، ریشێکی تەنکی کارەبایی هێشتبووەوە، هەمیشە زەردەخەنە بەدوو لێویەوە دیاربوو رووخۆش و لەسەرخۆو هێمن بوو، جلوبەرگێکی سادەی مەلایانەی لەبەرئەکرد، کە ئەگەر ناشارەزایەك چاوی پێبکەوتایە وای ئەزانی مەلای لادێیەکی ئەو وڵاتەیە.

هەموو علومی ئایینی تەواو کردبوو، و هەر لەسنوری ئەو علوومانەدا، نەوەستابوو، بەڵکو لەزانیاری نوێدا دەستێکی باڵاو پـایەیەکی بەرزی هەبوو، و لە خوێندنەوەی پەڕاوی بێگانە درێغی نەئەکرد، تەنانەت زمانی رووسی و ئینگلیزی بە گفتوگۆ خوێندنەوە زانیوە.

لەو سەردەمەدا کە بۆ یەکەم جار قوتابخانەی تازە لە مەهاباد کراوەتەوە قازی محمد کراوە بەسەرۆکی فەرهەنگی ئەو ناوچەیە، بێ ئەوەی یارمەتی و مووچە لەمیری وەرگرێت و خەڵکی زۆر هانئەدا بۆ فێربوونی زانیاری و هەموو جۆرە هونەرێك، پیاوێکی پێشکەوتوو و دڵپاکبوو، بەرهەڵستی عەشیرەتگەری زۆر بەتوندی کردووە، بەو بۆنەیەوە زۆرجار دەرەبەگەکان دوژمنایەتیان لەگەڵا کردووە چونکە هەرگیز لایەنی رەنجبەران و جوتیارانی کوردی بەرنەداوە، گیانی دیموکراتی و نیشتمانپەروەری کارێکی گرنگی کردبووە سەر هەست و بیروباوەری.

بەرەوبنەماڵەی قازی محمد هەر لەسەرەتای شەڕی جیهانی یەکەمەوە ناوبانگیان دەرکردووە لە موکریاندا، قازی محمد لەدواییدا بە هۆی چالاکی و وریایی خۆیەوە توانی ئەم

دەسەڵاتە مەعنەوییەوە سەرانسەری کوردستانی ئێرانی پێبگرێتەوە، ئەم بنەماڵەیە بەلای زۆربەی کوردەکانەوە بەرێزو خۆشەویست بوون، پیاوی هەڵکەوتوو و ناوداریان زۆربووە. وەك: میرزا فەتاحی قازی کەلەپێناوی هێنانی یاسای دەستووری (مەشروگ)دا زۆرتێکۆشاوە بەو بۆنەیەوە ماوەیەکی زۆر لە تاران لە زیندانا بەندکراوە، چونکە لە دژی رژێمی دکتاتۆری ئەو سەردەمە خەباتی کردووە، پێشەوا هەر لەسەر رەویەی باوك و باپیرانی بەردەوام بوو ,وە رابوردووی خاوێنی ئەوان پاڵی پێوەنا کە زیاتر لەرێی وڵاتی کوردستان تێکوشان بکات.

لە ساڵی ١٩٣٨ کە "قازی عەلی" باوکی کۆچی دوایی کرد ئەرکی سەرشانی زیاتربوو و کرا بە قازی مەهاباد، لەراستیدا هەر چەندە بەمیرات بوو، بەڵام خۆی زۆر شایستەی ئەوپایەیە بوو، و توانی بەشێوەیەکی رێك وپێك فەرمانەکانی جیبەجی بکات .

نمونەیەك لە تێکۆشانی

لە پێش ئەوەدا کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان بێتە کۆڕی خەباتەوە، قازی محمد لەسییەکانی ئەم سەدەیە (پلاپینیات)دا پەیوەندی بە (حزبی خۆیبون)ەوە هەبووە کە لەساڵی ١٩٢٧ ئەم حزبە لە کوردستانی تورکیا بەهاوکاری (احسان نوری پاشا) شۆڕشیان بەرپاکرد.

هەروەها لە کاتێکدا(ژ. ك) ژمارەی ئەندامانی لە(٢٠)کەسێك تێپەڕیان نەئەکرد، پەیوەندیان کرد بەقازی محمدەوە ئەویش بەدڵێکی خاوێن و نیازێکی ڕاستەوە چووە ڕیزی تێکۆشان لەگەڵیانا، پاش ماوەیەك، زۆر لە ئەندامانی دامەزرێنەرو سەرکردایەتی لە ناوچەکانی کەدا بڵاوبووتەوە، بۆ ئەوەی لەهەموو لایەك ئامانج و بەرنامەی"ژ.ك" بگەیێنن بەخەڵك و ریشەداکوتی.

هەروەها پەیوەندیان کرد بەکوردستانی تورکیاو عێراقەوە، بۆ ئەم مەبەستە"محمد ئەمین شەریفی" ئەندامی سەرکردایەتی کەوتە گفتوگۆ کردن لەگەڵ چەند نیشتمانپەروەرێکی کوردستانی عیراق وەکو نەتەوەیەکی سی قۆڵی لەنێوان مەلا ومەاب نوێنەری کوردەکانی تورکیا، شێخ عەبدواللە نوێنەری کوردەکانی عێراق، قاسم قادری ئەندامی دامەزرێنەری(ژ.ك) لەسەر سنوری هەرسی بەشی کوردستان، لە ئەنجامدا چەند بڕیاربڕیارێکی گرنگیان مۆرکرد. کەبریتی بوو لەوەی دەستی یارمەتی بۆ یەکتر درێژبکەن و پەیوەندی تەواویان لەنێواندا بەهێزبێت

لەهەموو بەشەكانی كوردستاندا تا لە پاشەرۆژدا گەلی كورد ڕزگاركەن، و ماق نەتەوایەتی خۆی وەربگرێت.هەروەها توانیان گۆڤاری(نیشتمان) یەكەم ژمارەی لە حوزیرانی ١٩٤٣ بەشێوەیەكی جوان و ڕێك و پێك لەچاپ بدەن، وبلاوی بكەنەوە، بەوجۆرە هەموو مانگێك هەموو بەرنامەو ویژەو مێژووی رابوردوی كوردی تیا بنووسن و بەخوێندەواری كوردی بگەیێنن.

كۆمەڵی"ژ.ك" لەسەرەتاوە بەنهێنی خەباتی ئەكرد تاتوانی ئەندامانی زۆر بكات وە لەسەر بیرو باوەڕێكی ڕاست و لەپێناوی ڕزگاری كورد تێكۆشانی ئەكرد.

لە كاتێكدا رژێمی تاران هێشتا لەگەڵ خۆفرۆشەكان و هەندی لە خاوەن زەوی وزارە گەورەكان دەسەلاتیان مابوو لە بەرگریكردنی خەڵكی و قەدەغە كردنیان لە هاوكاری كردن و یارمەتیدانی كۆمەڵی "ژ.ك"، تەنانەت لەناوچەی شارویران ئاغایەك گوێی پیاوێكی بڕیبوو چونكە وتبوی لەسەر هەموو كوردێك پێویستە بەدڵێكی خاوێنەوە بچێتە ناو كۆمەڵی "ژ.ك" بۆ رزگاری كوردستان لەژێر چەپۆكی داگیركەران و كۆنە پەرستان، بەلام لەگەڵ ئەو هەموو قەدەغەیە لاوان و خوێندەواران گوێیان كەڕبوو لە ئاستی نۆكەران و دەرەبەگەكان و بەدڵێكی خاوێنەوە ئەهاتنە ریزی ئەندامە تێكۆشەرەكانی "ژ.ك" لەوانە دوو هاوڕێ بەناوی )شێركۆوپیروت(، بەو نیازەوە بەرەو مەهاباد كەوتنە ڕێگا پاش ماوەیەك بەپیاوێك گەیشتن لە كۆمەڵی ژیانەوە بوو بەڕوو خۆشیەوە بەخێرهاتنی كردن ,ئەوانیش وەلامیان دایەوە و لێیان پرسی ئایا ئێمە چۆن ئەتوانین پەیوەندی بە كۆمەڵەوە بكەین تاكو شانبەشانی ئەندامەكانی پێویستی سەرشانی خۆمان جیبەجی بكەین؟

میرزا قوتیاس وتی من ئەندامێكی كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستانم و، ئەتوانم بەئاسانی ڕێگاو شوێن بۆ ئێوە دابنێم، وائێستە منیش بۆ مەهاباد ئەڕۆم لەگەڵم وەرن، هەرسێكیان بە دڵێكی پڕ لەهیوا و ئاواتەوە كەوتنەڕێ، ئێوارە وەختە نزیكی شاربونەوە، میرزا وتی باوچانێك لەباخی قازی بدەین، تا دنیا تاریك ئەكات، پاش ئەوە ئەچین بۆ ماڵی كاك سوار كە مەردێكی تەواوەو ئەندامێكی بەرزی دڵسۆزە، و من پەیوەندیم لەگەڵ ئەوا هەیە، پاش ئەوەی دنیا تاریك بوو هەرسێكیان ڕووەو ماڵی كاك سوار دەستیــــــان كرد بەڕۆین، و میرزا هەردووكیانی پێشكەش كرد ,و چەند گفتوگۆیەكیان دەربارەی ڕێكخستنی ناوی نەهێنییەوە درێژەپێدا لە ئەنجامدا كاك سوار وتی سبەی شەو (ئاژەر رو برا) ئەبەین بۆلای (كاك بینایی، ( هەندی لە هەڤاڵەكانی ترمان لەوێ ئەبن تابزانین چیمان بۆ دیاریئەكەن ، كۆمیتەی سەركردایەتی كۆمەڵی (ژ.ك) لە چەند هۆدەیەكی پیاوێكی دەوڵەمەندی نیشتمانپەروەردا

کۆبوونەوەیان ئەکرد، کە ئەم پیا وە لە فەرمانڕەوایی ڕەزاشادا زۆرجار تووشی گیروگرفت و چەرمەسەری بووبو، و یارمەتییەکی دڵسۆزانەی کۆمەڵەی ئەداو، کەم کەس گومانی پێئەکرد، بۆسبەی شەو هەرچواریان میرزاو ئازەر وبراو کاک سوار، بەرەو جێگای کۆبوونەوەی نهێنی کاک بینایی ڕۆیشتن.

کاک سوار وتی ئێوە لەم کۆڵانەدا ڕابوەستن تامن ئەڕۆم و ئەگەڕێمەوە بۆلاتان، ئەوسا هەمووومان ئەچینە ژوورەوە، پاش ئەوەی کاک سوار گەڕایەوە هەموویان ڕۆیشتن و تەقەیان لە دەرگادا، بۆیان کرایەوە ,بەژێر خانێکی تاریکدا چوونە ژوورەوە، سەرکەوتن تا گەیشتنە ژوورێك ، چرایەکی کزی تیاداگیرسابوو، کەسی تیانەبوو، پاش ماوەیەکی کەم پیاوێك هاتەلایان وتی شەوتانباش، کاك سواروميرزا دەست بەجی هەستانە سەرپێ ,ئازەروبرا ئەوانیش بەچاو برین لەوان هەستان، چوونکە قازی محمدیان نەئەناسی هەرچەندە ناو بانگیان بیستبوو، کاك سوار وتی قوربان ئەو دوولاوەی باسم کردن ئەم ناوانەن، ناوی نهێنی و ئاشکرای هەردووکیانی پێووت، کاك بینایی پەردەیەکی هەڵدایەوەو لە ناوتاقێکدا نەخشەیەکی هێنایە خوارەوە و دەستی کرد بە باسکردنی خاکی کورد کە چۆن تائێستا بەبەشکراوی ماوەتەوە؟ و هۆیەکانی چییە؟ و چۆن لەدوارۆژدا ئەتوانین یەکی بخەینەوەو وڵاتێکی سەربەخۆی خاوەن سنوری لیٚ پێك بهێنرێت .

پاش چەند گفتوگۆیەکی تر کۆبونەوەی ئەوشەوە تەواوبوو و هەموویان هاتنە دەرەوە، هەر لەو ماوەیەدا ڕۆژێك بڵاوکرایەوە کە قازی محمد لەمەیدانی چوارچرا وتارێك ئەدا، پاش ئەوەی خەڵکێکی زۆر بۆ گوی گرتنی کۆبووەوە، کاتێ پێشەوا چووە سەر شوێنێکی بەرز، ئازەرو برا لە پیاوێکیان پرسی کەلە نزیکیانەوە وەستابوو گوێی لە وتار ئەگرت، ئەریٚ براگیان وتیان قازی محمد وتار ئەدات، خۆئەوە ئەونیە ئەوە هاوڕێی ئێمەیە، ئەویش کەبۆی دەرکەوت ئەو دوو کەسە خەڵکی مەهاباد نین و نەشارەزان، وتی: بەڵی ئەوەیە قازی محمد، کە ئەمەیان بیست لەبەر خۆیانەوە شەرم دایگرتن و سەیری یەکتریان ئەکرد، چونکە لە کاتی کۆبوونەوەدا بە گوێرەی پێویست ڕێزیان نەگرتووە بەهەر جۆربوو ئەوانیش گوێیان شلکرد تا وتارە بەنرخەکەی تەواوکرد، دوایی ئەوانیش لەگەڵ هەموو خەڵکی بڵاوەیان کرد، بڕیاروابوو کەسبەی شەوی ئەوڕۆژە، لەگەڵ کاك بینایی کۆبنەوە وەك جاران، بەڵام بە کاك سواریان وت، ئێمە تائەمڕۆ نەمان زانیوە کە ئەوە قازی بووە، کاك سوار هاتە زمان: هەتا خوا حەز بکات خۆی بەسادە ئەگری، هەرکاتی بچنەوەلای نەکەن شەرم بکەن.

لەو ئێوارەیەدا کەبەیەک گەیشتین لەشوێنی جاراندا، کاک بینایی دانیشتبوو ویستیان حستی ماچ کەن ,بەڵام قەدەغەی کردن وە نەیهێشت، وە فەرمووی دانیشن، کوتوپڕ کاک یبوت خۆی نەگرت وتی قوربان جەنابی قازی لێمان ببورە تا ئەو کاتەی وتارەکە نەمان ناسیوبت ئەویش ئەمەی پی ناخۆشبوو، پێی وتن ئەوە لەکەیەوە بۆ ئێوە بووم بەجەنابی قازی، مەگەر ناوی منتان لەبیرچووەتەوە من لای ئێوە ناوم کاک بیناییە نەک جەنابی قازی و بەس، تەنیا مەبەستم ئێوەنیە بەڵکو هەموو برادەرێک پێویستە ناوی نهینی بەکاربێنی نەوەک دوژمن شارەزایی پەیداکات بەسەر ناوی ئەندامانی کۆمەڵەی(ژ.ک)، براکانم منیش وەک ئێوەم هیچم لە ئێوە زیاترنیە لەمەولا ئەگەر هەر وەک دەستە برایەکی خۆتان سەیرم نەکەن لێتان دڵگیرئەبم، ئەوسادەیی و گفتوگۆ شیرینانەی کاک بینایی پەردەی شەرمی لەرووی ئازەرویرا لابرد، لەپاشان بە درێژی باسی مێژووی کوردو چەند ئامۆژگارییەکی تری بۆ کردن، بۆ بەیانی ڕۆیشتن بۆ ناوچەی"تەرگەوەر "بەفەرمانی کاک بینایی، پاش ماوەیەک ئەندامانی سەرکردایەتی هەموو بڕیاریان لەسەرئەوەدا، کە قازی محمد ببێت بەسەرۆکی کۆمەڵی (ژ.ک)، هەر چەندە لە ئەندامانی دامەزرێنەر نەبوو، بەڵکو لەبەر دڵسوزی و زیرەکی وزمانزانی ئەویان هەڵبژارد، وەنەبیّ بەهەڵەدا چووبن، چوونکە تا دوا هەناسەی لەو ڕێیەدا بە نیازێکی بێگەرد بەردەوام بوو، زۆر لەپیاوە ئاینیەکان هاتنە ڕیزی تێکۆشانی کۆمەڵە، و زۆر لەو پیاوە ئاینیانە بەناو خەڵکا بڵاویان کردەوە کە ئەوەی یارمەتی کۆمەڵە نەدات تووشی گوناه ئەبێت.

چوونکە بۆ رزگاری نیشتمان و کوردستان خەبات ئەکات، بەو جۆرە لە ناو ڕۆشنبیراندا ئەم بیرو باوەڕە تاڕادەیەک جێگیربوو و ڕیشەی داکوتا، لە تشرینی دووەمی١٩٤٥ز قازی محمد لەگەڵ چەند کەسێکی تر لە ئەندامە بەرزەکان بانگکران بۆ"باکۆ" لەیەکێتی سۆڤیەت، بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ نوینەرانی ئەویّ بە سەرۆکایەتی "جعفر باقروف"، پاش چەند کۆبوونەوەیەک لە نێوان هەردوولادا، چەند بڕیارێکیان مۆرکرد، لەو بڕیارانە ئەوەبوو بەپێشنیاری پێشەوا ناوی کۆمەڵی ژیانەوەی کوردستانیان بەکۆمەڵی دیموکراتی کوردستان گۆڕی، چونکە قازی محمد لەو باوەڕەدابوو کە دیموکراتیەت تێکەڵ بەبزوتنەوەو جووڵانەوەی گەلی کورد بکرێت تابەشێوەیەکی فراوان، دەرگا لە جوتیاران و کرێکاران بکرێتەوە بۆ ناو کۆڕی تێکۆشان و خەبات ,و هەتا کۆمەڵە پێویستیە مێژووییەکانی سەرشانی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک جێبەجی بکات وە بەرنامەو یاسای نویّ بۆ ئەم مەبەستە دابنێت.

پاش گەڕانەوەیان ئەندامی کۆمەڵی (ژ.ك) و زۆر لە خەڵکی مەهابادو ناوچەکانی تر و مەندی لەسەرەك هۆزەکان بانگ کران، بەو بۆنەیەوە کۆبوونەوەیەکی گەورە کرا، و هەموویان بڕیاریان لە سەرناوی تازەی کۆمەڵەدا، و قازی محمد بلاوی کردەوە، کە بەرنامەی نوێی کۆمەڵەی دیموکراتی کوردستان بەم جۆرەی خوارەوەیە کە بنچینەی کۆمارێکی دیموکراتین.

١. لەسەر کۆمەڵی دیموکرات پێویستە هەوڵ بدات و تێبکۆشێ بۆپتەوکردنی دۆستایەتی و برایەتی لەگەڵ دانیشتوانی ئازەربایجان و مەسیحەکان، تاکو هەردوولا یارمەتی یەك بدەن بۆبەرگری لەدژی چەوسێنەرانی گیانی نەتەوایەتییان.

٢. هەموو توانایەك تەرخان بکەن بۆ بلاوکردنەوەی زانیاری و پارێزگاری باری ئابووری و تەندروستی.

٣. پێشخستنی بازرگانی ناوخۆ، ئالوگۆڕکردنی لە دەرەوەی ولات، هەروەها هێنانی کارگە و پێویستییەکانی تری ولات.

زەویوزار دابەش کردن بەسەر جوتیاران و فێرکردنیان لەسەر تازەترین ڕێگای پەرەسەندنی کشتوکاڵ و زۆر کردنی تراکتۆرو هۆیەکانی تری پێش خستنی هەموو جۆرە چاندنێك.

٤. لەسەر هەموو کوردەکانی ئێران پێویستە ئامادەبن بۆ تێکۆشان و خۆیان بخەنە ژێر فەرمانەوە بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی خۆیی و دیموکراتی لە کوردستانی ئێراندا، و ئیشوکاری ئەم کۆمارە هەموو بەدەست خۆیانەوە بێت، و هەموو فەرمانبەرانی کوردبن.

٥. زمانی کوردی ڕەسمی بێت لە ولاتاو لە هەموو فەرمانگە و قوتابخانەکاندا و لەهەموو پۆلێکدا.

٦. ئەنجوومەنی تازە هەڵبژێرن بەگوێرەی یاسای نوێ لەهەموو هەرێمەکانی کوردستاندا بۆ ئەوەی چاودێری هەموو ئیشوکاری ولات بکات بە شێوەیەکی ڕێکوپێك.

## هەڵکردنی ئالای کوردستان

کۆمەڵی دیموکرات لەفەرمانەکەی خۆی دوانەئەکەوت و بە وردی ئیشوکاری خەڵکی ناوچەی جێبەجێ ئەکرد، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەیوەندیان بە تارانەوە کزتر ئەبوو، لە ڕۆژی(١٩٤٥/١٢/١٦) خەڵکێکی بێشومار لە مەیدانی(چوارچرا) کۆبوەوە و بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ و زەماوەندێکی گەورەیان بەرپاکرد، کە هەمووی خۆشیوئاوات و بەختیاری بوو. لەو ڕۆژە مێژوویەدا قازی محمد بلاوی کردەوە کەلەئێستەوە ولاتی موکریان لە ڕژێمی

کۆنەپەرستی تاران جیابووەوە، ئەمەش نموونەیەکە بۆ هەموو بەشەکانی تری کوردستان وە تۆزێکە بۆ یەکگرتنی هەموو کورد بەو جۆرەوە بەدڵێکی پڕ لەهیوای تینوی سەدانساڵەی ئەم گەلە.

ئاڵای ڕژێمی تاران لەسەر هەموو فەرمانگەو قوتابخانەکانەوە داگیرایە خوارەوە، و لەجێی ئەودا ئاڵای کوردستان هەڵکرا، ئاڵاکە لەسەرەوە سوور، لە ناوەڕاستا سپی لە خوارەوە سەوز لە ناوسپییەکەدا کە چوار ئەوەندەی هەریەکە لە بەشەکانی تر ئەبوو نیوکوڕە ڕۆژێك کە دووگوڵەگەنم لەم لاولەولایەوە بەرەنگی زەردەبوون، وەبە سەریەوە پێنوسێك هەبوو لە سەراووردی هەموویانەوە نوسرابوو (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)، ئەم ئاڵایە لەهەموو ئەو ناوچانەدا کەلەژێر دەسەلاتی کۆمەڵەو سوپای شۆڕشگێردابوون هەڵکرا، بە ئاهەنگ و وتارو هەموو خۆشیەکەوە.

لە شاری نەغەدە کاپیتان محمد قودسی لەکاتی هەڵکردنی ئەم ئاڵایەدا وتارێکی مێژوویی بەنرخی بەم بۆنەیەوە لەناو خەڵکێکی زۆردا خوێندەوەو، وتی گەورەکانم ئەی گەلی بەشەرەف ،خۆشەویستان، ئەی کرێکارو جوتیار سەپان و پاڵەی بەنرخ، ڕۆژ بەسەر شۆڕشی پیرۆزی میللی کوردا هەڵهات، ئەمڕۆ گەورەترین و پیرۆزترین ڕۆژە، بۆیە ئەبینین هەڵۆی بەهێزی کورد بە چنگی ئاسنینی خۆی ئەو ئاڵا پیرۆزە هەڵدەکات.

برایان پیرۆزبایی خۆم و گەلی کوردستان پێشکەش ئەکەم و پیرۆزبایی لەهەموو میللەتێکی براو ئازادیخوا ئەکەم، هەروەها وتی ئەی گەلی کورد ئەزانی ئەم ئاڵایە چی ئەڵێت؟

ئەڵێ ڕەنگی سوورم نیشانەی جەنگاوەری و نەبەزی گەلی کوردو ڕەنگی سپیم نیشانەی خاوێنی و دڵپاکیەتی کە میللەتێکی نەجیبە و گیانێکی ڕاستی هەیە.

ڕەنگی سەوزم هاوارئەکات خاکی کوردستان پڕ لەدەغڵ و دان وزێڕو زیوە، هەروەها ئەڵێ وا ڕۆژی سەربەستیمان هەڵهات، دووبارە ئەی جوتیار ئەو دو گوڵە گەنمە نیشانەی تۆیە تۆش هەوڵ بدە بۆبەرهەم هێنانی بەرو بوومی وڵاتەکەت.

پێنووس هاوارئەکات بۆ پەرەسەندنی زانیاری و هەموو جۆرە خوێندەواریەك لە ناوگەلدا.

## هەڵبژاردنی قازی محمد بەسەر کۆمار

لە ڕۆژی٢٢ی کانونی دووەمی١٩٤٦دا، کۆبونەوەیەکی زیاتر لە ٢٠هەزار کەسی پێکهاتبووە، دامەزرانی کۆمارێکی دیموکراتی لەبەشێکی گرنگی کوردستانا بلاوکرایەوە بە

سەرۆکایەتی قازی محەمەد، کۆمارێکی پێشکەوتوی ساوا ،بۆهێنانەدی پاشەڕۆژێکی روون و پڕ لەبەختیاری بۆ گەلی کورد کە ساڵەهای ساڵبوو چاوەڕێی رۆژێکی وابو، بەوجۆرە لە مەیدانی (چوارچرا)دا کە رەنگین کرابو بەئاڵای کوردستان و بەشێوەیەکی جوان ڕازابووەوە کە شایانی رۆژێکی مێژوویی وابێت، پێشەوا بەجلوبەرگی ژەنەڕالیەوە لە شوێنێکی بەرز کە بە تایبەتی بۆ ئەو رۆژە دروست کرابوو، و لەهەموو خەڵکەوە دیاربوو، تاقێکی ڕازاوە کە بەگوڵ و ئاڵای ولآت و وێنەی سەرۆك نەخشێن کرابوو، لەو شوێنەدا راوەستابوو فەرمووی (وائەمڕۆ گەلی کورد توانی کۆمارێکی خۆیی پێك بهێنێت و بتوانی وەك گەلێکی سەربەخۆ لە خاکی خۆیا بە ئازادی بژی .

هەروەها فەرمووی: بائێمەش تەکانێك بەخۆمان بدەین و دوای خوێندن و صنعەت کەوین فەلاحەت و کشتوکاڵی وەك خەڵکی لێبکەین، و میللەتمانی پێ دەوڵەمەندکەین، کارخانان بێنین، ئەو هەموو کانگاو مەعدەنانەمان باوەدەر خەین، و بە صەنعەتی ئەوانە ولآتی خۆمانی پی برازێنینەوە، ئێمە چی قازانجی میللەتی کوردی تێدایە دەبێ بیکەین، و سەعیش بکەین نەتیجەی هەوڵ و تەقەلاکەمان وابێت کەلەپێشدا ڕەچاومان کردووە، جا ئەگەر وا دەرچوو ئێمە وەزیفەی میللی خۆمان بەجێ گەیاندووە، و نابێ نائومێدیش ببین.

دڵی خەڵکەکە هەموو وەك گوڵ گەشایەوە بەم وتارە بە نرخە لەو رۆژە پیرۆزەدا ،ئینجا محمد حسین سەیفی قازی ئەویش بەجلوبەرگی ژەنەراڵیەوە لەتەنیشت پێشەواوە ڕاوەستاو هەڵبژاردنی قازی محمدی بەسەر کۆمار بلآوکردەوە بەرەزامەندی هەموو چینەکانی گەل. دووبارە سەرکۆمار سوپاسی هەموو خەڵکی کرد بۆ ئامادەبوون و هاتنیان بۆ ئەم ئاهەنگەو ئەویان هەڵبژاردو جێی باوەڕی هەموویانەو لێی دڵنیان، سەر بازانی کوردو قوتابیان نمایشێکی (استعراضي) ڕێکوپێکیان بەوبۆنەیەوە گێڕا، لە دوای کۆتایی ئەم ئاهەنگە مێژووییە، خەڵکەکە هەموو بلآوەیان لێکرد.

پاش ئەوەی قازی محمدیان بەسەر کۆمار هەڵبژارد ئەویش کەوتە ڕاوێژو گفتوگۆ لەناو ئەندامانی کۆمەڵی دیموکرات و هەندی لەنیشتمانپەروەرەکانی تر، بۆ پێکهێنانی وەزارەت، و لە رۆژی ١٩٤٦/٢/١١ وەزارەت بەم جۆرەی خوارەوە دانرا:

١. حاجی بابە شێخ سەرۆك وەزیران

٢. محمد حسین سیف جێگری سەرۆك وەزیری بەرگری

٣. مەناف کەریمی جێگری سەرۆك وەزیری پەروەدەو زانیاری.

٤. محمد امين معينی وەزیری ناوخۆ

٥. عبدالرحمن ئیلخانی زادە وەزیری دەرەوە

٦. محمد ئەیوبیان وەزیری تەندروستی

٧. محمود وەلی زادە وەزیری کشتوکاڵ

٨. خلیل خەسرەوی وەزیری کاروفەرمان

٩. ئەحمد ئیلاهی وەزیری ئابوری

١٠. ملا حسین مەجدی وەزیری داد

١١. موستەفا داودی وەزیری بازرگانی

١٢. صدیقی حیدری وەزیری ڕابەری

١٣. اسماعیل ئیلخانی وەزیری ڕێگاوبان

١٤. کریم ئەحمەدی وەزیری پۆستەو تەلەفون

**سوێن خواردنی**

وەك لە هەموو وڵاتێکا باوە سەرۆکی نویّ، یا هەر فەرمانڕەوایەکی بەرز پێویستە سوێن بخوات کە وەك شتێکی قانوونی و دەستوورییە، لەبەرئەوە پێشەوا فەرمانیدا بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی ئەنجومەنی وەزیران ئەمادەبن بۆ ئەم مەبەستە، قورئانی پیرۆزو ئاڵای کوردستان بەدەست وەزیری داد مەلا حسێن مەجدیەوە بوو، پێشیان کەوت تا ژووری قازی محمد ,دەست بەجیّ ئەویش هەستایە سەر پیّ و بەرگەکەی لابردو هەموو ئەندامان و وەزیران بەپێوە ڕاوەستان، پێشەوا ئەم سوێنەی خوارد:(سوێن ئەخۆم بە خواو قورئانی پیرۆز، وەبە نیشتمان، شەرافەتی قەومی کوردو بە ئاڵای پڕ لە ئیفتیخاری کورد، تادوا هەناسەی ژیانم وەتا دوا تنوکی خوێنم بەگیان و بەماڵ لەڕێگەی مانەوەی ئازادی کورد و بەرزکردنەوەی ئەوئاڵایە، کەمایەی شانازی هەموو کوردێکە کۆشش بکەم و دوانەکەوم، و بەسەرۆکی کۆماری کوردستان و یەکگرتنی کوردو ئازەربایجان ئیفتیخار ئەکەم کۆشش ئەکەم بۆ مانەوەی ئەم ئامانجە) .

دوای ئەوە ئەنجومەنی وەزیران و هەموو ئەندامەکانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکرات بڕیاریاندا کە ئەوانیش بە نیازێکی خاوێن و دڵێکی پاکەوە هەموو کۆسپ و گیروگرفتێك

چاسەربکەن کە لەکاتی هەڵسوڕانی ئیشوکاردا دێتەڕێیان و هەوڵ وتەقەلا بدەن بۆ بەختیاری و ئازادی نەتەوەی کورد کەدەمێکە چاوەڕێی ئەم ڕۆژەیە.

**گرنگترین فەرمان لە سەردەمی کۆماردا**

پێکهێنان و دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی لە ئێراندا بە سەرۆکایەتی قازی محمد . گەورەترین گۆڕانێك بوو لە مێژووی نوێی گەلی کوردا، هەڵهاتنی ڕۆژێکی روونبوو کە بەتیشکی زێڕینی رێگای تاریکی بۆ ڕوون کردینەوە کە هەر چەندە ماوەیەکی زۆری نەخایاند و لە ناوبراو، بەڵام هەموو کاتێ بە یادکردنەوەی سوود وەردەگرین و هانمان ئەدا بۆ تێکۆشان بۆ پێکهێنانی کۆمارێکی دیموکراتی یەکگرتوو کە هەموو بەشەکانی کورد یەك بخات لەپاشە ڕۆژدا.

ئەم کۆمارە دەنگێکی وایدایەوە کەتەختی نۆکەران و ئیمپریالیستەکانی هێنایە لەرزینو لە ماوەیەکی کەمدا توانی بەسەرۆکایەتی قازی محمد و تێکۆشانی کۆمەڵی دیموکرات زۆر لە فەرمانەکانی سەرشانی جیبەجی بکات وەك:-

١. پەرەدان بە پەروەردە و زانیاری لەهەموو ناوچەکەدا، پێشەوا لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی لەدایکبوونی کۆمار قوتابخانەیەکی بەرزی بۆ کچان کردەوە لە ناو کۆڕی زەماوەندێکی گەورەو ئاهەنگێکی پڕ لە شادمانیدا ,و دەست کرا بە کردنەوەی قوتابخانەی نوێ لە زۆر شوێندا، بەرنامەوپەڕتوك و پێویستی تر لە چاپدرا بۆ وتنەوەیان لەهەموو پۆلەکان، و کتێبی بێگانەیان وەرگێڕا بۆ کوردی بۆ ئەو مەبەستە، و بڕیاردرا بەنەهێشتنی نەخوێندەواری لەوڵاتا و هەموو کەس فێری خویندن و نووسین بکرێت، بۆ یەکەم جار(٥٠) قوتابیان نارد بۆ یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی لەدانشگا بەرزەکان بخوێنن هەروەها دەیانی تر لە قوتابیان بۆ تەورێز بۆ خوێندن لە زۆربەی لقەکانی زانیاریدا.

٢. چاپخانەیەك دانرا بۆ لە چاپ دانی پەرتوك و ڕۆژنامەو گۆڤارو هۆیەکانیی فراوانکردنی رۆشنبیری لەناوگەلدا لەو چاپکراوانە ڕۆژنامەی"کوردستان" بو کە بەناوی کۆمارەوە ئەینوسی، هەروەها لە لێکۆڵینەوە لە مێژوو ئەدەبی کۆنی کورد درێغی نەکرد و هانی نووسەری کوردی ئەدا بۆ لێکۆڵینەوە لەبەشە جۆربەجۆرەکانی فۆلکلۆری کورد و وێژەو زانیاریتر و بڵاوکردنەوەی.

٣. ڕێکخستنی سوپای میللی بۆ بەرگری و پاراستنی ولآت لە جیی سوپای ڕژێمی کۆنەپەرست، کە لەپێش دامەزراندنی کۆماردا چەوسانەوەی نەتەوەی کورد ئەوپەڕی هیواو ئاواتی بوو.

٤. دانانی حوکمی خۆیی و هەڵسوڕاندنی ئیشوکار، بەهۆی فەرمانبەرانی کوردەوە، هەروەها ڕەنگڕشتنی ولآت و پێوانی، و پاراستنی ئاسایش لە ناوخەڵکاو دانانی یاسایەکی نوی بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزانە.

٥. کردنەوەی خەستەخانەو دەرمانگاو لەزۆر شوێن بەپێی توانا، هێنانی دەرمان و پێویستیەکانی تەندروستی لەدەرەوەی ولآت وەفراوان کردنی هۆیەکانی پاراستنی تەندروستی بۆ هەموو خەڵك.

٦. ئێستگەیەکی نویٚ بە زەماوەندێکی جەماوەری کرایەوە لە مەهابادەوە بەرنامەی کوردی و بێگانەی تیابلآوکرایەوە .

٧. پێکهێنان و ڕێکخستنی یەکیەتی لاوان و ئافرەتان بۆ ئەوەی وەك ولآتە پێشکەوتووەکان ئافرەت شانبەشانی پیاو بتوانی زۆر لە ئیشوکاری ولآت جیبەجی بکات، مافی خۆی بپاریزی، هەروەها یەکیەتی کرێکاران و جوتیاران وبنچ بەست کردنی ئیش وکاریان کەبتوانی زەوی و زار بگرنەوە ژێر دەستی خۆیان و لە چنگ دەرەبەگەکانی بسێننەوە هەروەها فراوان کردنی ئیشوکار بۆ زەحمەت کێشان و ڕەنجبەران، ئەم هەموو ڕێکخراوانە تێئەکۆشان بۆ چەسپاندنی دیموکراتیەت و بەختیاری بۆگەلەکەیان.

٨. لیژنەیەکی تایبەتی دانرا بۆ چارەسەرکردنی کشتوکاڵ و دابەشکردنی زەویوزار بە جۆرێکی یەکسان لە ناو جوتیاراندا کە لە ئەنجامدا بوو بەهۆی بزوتنەوەیەك لەناو جوتیاراندا ,و هەندی لە خاوەن زەویوزارەکان بەمە دڵگران بوون وە خۆیان خستەباوەشی دوژمنەوەو لە مێژوودا رویان ڕەش بوو، و لە تۆماری خۆفرۆشاندا ناوی خۆیان نوسی .

٩. پتەوکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوان کۆماری دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی سۆڤیەت هەروەها لەگەڵ کۆماری ئازەربایجاندا.

١٠. هاوبەشی گەشەپێدان (شرکەتی ترقی (مۆرکرا لە نێوان سۆڤیەت و کوردستاندا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی کەلوپەل و پێویستی ژیان بۆ یەك، وەك ناردنی توتن و بەرهەمە دەستیەکانی ولآت بەرامبەر بە تراکتۆرو دەرمان و پێویستی تر ,هەروەها کارخانەی سیغاری کوردستان لەمەهاباد دامەزرا.

١١. پاراستنی سەربەستی بیروباوەڕ بەبێ گوێدان بەرەگەزو ئایین و زمان لە وڵاتاو، پتەو کردنی برایەتییەکبوون لە ناویاندا بەهۆی ڕێکخراوە گەلیەکانەوە بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی گەلی کورد.

١٢. هاوکاری کردن لەگەڵ کۆماری ئازەربایجان بەتایبەتی لەگەڵ سوپاو ریکخراوەکانی هەردووکۆمار.

هەروەها بێگانەکان لە کاتی سەردانیان بۆ ئەم وڵاتە بۆ سەیر کردنی چۆنیەتی کۆماری ساوای کورد، وردئەبوونەوەو سەرنجیان ئەدا کە هەنگاوی پێشکەوتوو ئەنێ بۆ پێشەوە لە هەموو روویەکی ژیان و کۆمەڵایەتییەوە و فەرمانبەرانی کورد ئیش و کاریان بەرێکوپێکی هەڵئەسوورێنن و بەڕێوەئەبەن.

(ئارڤ رۆزفێڵد) لە ژێر ناوی (کۆماری مەهاباد) نوسیویەتی: شاری مەهاباد لە پێشەوە نموونەیەکی دیهاتی هەبوو وەدواکەوتو پەستبوو، بەڵام ئەمڕۆ جوڵان و پێشکەوتنێکی تری هەیە، کەپڕە لە ژیان و بەختیاری و زۆر بەگەرمی هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی بنچینەیەکی پەروەردەی بەهێز دابنێن، بە پێچەوانەی بەشەکانی تری ئێران و ئازەربایجان.

کوردستان ڕووسی تیا نییە کە دەستیان لە ئیشو کاردا هەبێت، لە ئازەربایجان حوکمێکی توندوتیژ بەرپایە ,لە کوردستان ئەمە نیە، لەم وڵاتەدا بەندکراوی سیاسی نیە تەنیا یەکدوو کەسیك لەناوبرا ئەویش دوورنیە لەسەر سیاسەت بوو بێت، وەچەند کەسیکی کەم حەزیان بەرژێمی تازە نەکردووە پەنایان بەکار بەدەستانی ئێران بردوە و لەتاراندا ئەژین چونکە بەچارەسەر کردنی کشتوکاڵ ودابەش کردنی زەوی وزار ,ڕازی نەبوون.

لەسەر شەقامەکانی(مەهاباد) ئەتوانیت بەسەربەستی گوێ لەرادوێی ئەنقەرەو هەموو شوێنێك بگرێت، بەڵام لە تەورێز کە پایتەختی ئازەربایجانە گوێ گرتن لەمانە ئەبێ بەهۆی توش بونی خاوەنەکەی بۆ ســــزایەکی توند، ئەم ســــــەربەستیەش ئەگەڕێتەوە بۆ بیری وردی پێشکەوتووی کورد لەگیانی ئازادی و نیشتمانپەروەری (قازی محمد) و ئەندامانی وەزارەتەکەی، لەمانەوە بۆمان روون ئەبێتەوە کە ئەم کۆمارە تا چ ڕادەیەك خۆشەویست بووە لای کوردەکان و، ئەم ماوەیە بەدەورێکی زێڕین دائەنرا چونکە بێ دادی و ستەمکاری زۆریان چەشتبو لەپێش کۆماردا، قازی محمد لەگەڵ پەیامنێری "ئەی، ئی، پی" لە رۆژی١٩٤٦/١/١٦کەوتە گفتوگۆ وتی کوردەکان بەوەش قایل ئەبن ئەگەر کاربەدەستانی ئێران بڕیاری ئەوە بدەن لەسەر دیموکراتی ئازم برۆن بەڕێوەو سەربەستی قەدەغەنەکەن، و

ئەو دەستورەی بۆ کوردستان دانراوە لەسەری بڕۆن کەئێستا بەرپایە لە کوردستاندا بۆسەربەخۆیی زاتی، و بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستان لەلایەن مەحویانەوە لەگەڵ هێزی سوپای خڕیان، پەیامنێرەکە لێی پرسی ئایا لەوە سڵ ناکەیت کە ئەم بەرامبەری و ناکۆکییە لە نێوان کوردو کاربەدەستی مەرکەزی ئێران ببێتە هۆی ئەوەی بێگانە دەست بخاتە ئیشوکارتانەوە؟

پێشەوا وەڵامی دایەوە، باری کوردستان زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ باری ئازەربایجاندا چونکە کوردستان لەلایەن هێزی سوپای سۆڤیەتەوە داگیرنەکراوە، هەر لەو کاتەوە ڕەزاخان لە سەر حوکم نەماوە نەژەندرمەو نەئەمنییەو نەهێزی سوپایی نەیتوانیوە بێتە کوردستانەوە و پێ بڕی ئەم ناوە بوە لەبەر ئەوە ئێمە لەم کاتەوە هەر بەسەربەخۆیی ژیاوین، لەگەڵ ئەوەدا نایەڵین بێگانە دەستبخاتە ناوئیش و کارمانەوە، لەهیچ ڕوویەکەوە، کەوابو باری ئێستای کوردستان پەیوەندی بەناوخۆی وڵاتەوە هەیە، پێویستە لە ناو کاربەدەستانی کوردستان و ئێراندا جێبەجێ بکرێت و نەمێنێ، چونکە ئەم گیروگرفتە پەیوەندی بە دەرەوە نییە، دوای ئەوە قازی محمد ڕوونی کردەوە بۆ پەیامنێرەکە کە گەلی کورد لە رابوردووەوە هەتا ئێستە چ خەباتێکی خوێناوی کردووە بۆ ڕزگاربوونی لەدەست چەوسێنەران وە چەند سزاو ئازاریان لەم ڕێگەدا چەشتوەو چەند قوربانیان داوە لەم ڕێیەدا، و چۆن لە کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەمدا بڕیار درا کە کورد دەوڵەتێك بۆ خۆی پێکبهێنێ و لە پەیمانی"سیڤەردا " بڕیاری لەسەردراو لە ئەنجامدا نەیانهێشت بێتەدی بەهۆی کۆنەپەرستان وداگیرکەرانەوە.

بەڵام ئەمڕۆ ئێمە بەشانازیەوە داوای هەقی خۆمان ئەکەین، و هەموو تواناى خۆمان لەم ڕێگەدا ئەخەینەکار بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکی زاتیمان هەبێت لە خاکی خۆماندا، و چەوتیو ئەرکی ئەم گیروگرفتە هەمووی ئەکەوێتە سەرشانی کاربەدەستانی ڕژێمی ئێران کە تائێستا هیچ هەنگاوێکیان لەم ڕووەوە بۆ پێشەوە نەناوە و ئاوڕیان لە ماق نەتەوایەتیمان نەداوەتەوە، و ئێمە زۆر بەگەرمی و دڵسۆزیەوە، و بەسیوایەکی بەتینەوە چاومان بڕیوەتە هەموو ڕێگایەکی پێشکەوتوو بۆ سەرکەوتن لەم مەبەستە پیرۆزەدا، و نامانەوێ لاسایی یەکێتی سۆڤێت یا ئەمەریکا بکەینەوە.

لەگەڵ ئەوەدا دەرگا لەسەر خۆمان داناخەین و پەیوەندیو دۆستایەتیمان لەگەڵ وڵاتە پێشکەوتووەکان بەهێز ئەکەین، بەپێی بەرژەوەندی گەل و نیشتمان، بەبێ جیاوازی تابەم بۆنەیەوە باری ئابووری وڵاتمان پەرەپێ بدەین، بتوانین هەموو ئیشوکارێکی خۆمان بەرێکوپێکی هەڵسوڕێنین.

**له سێداره دانی پێشەوا قازی محمد**

قازی محمد پاش نوسینی وەسێتنامەکەی له بەرواری (١٩٤٧/٣/٣١) به دەستی ڕژێمی دیکتاتۆری ئێران له گۆڕەپانی چوارچرای شاری مهاباد له سێدارەدران و گەیشتنه پلەی بەرزی شەهادەت.

به پێیْ مادەی(٢٩٦)ی یاسای دادگا سەربازییەکان، هەر کەسێك له لایەن دادگای سەربازییەوه حوکمی مردنی رابگەیەنرێت، دەبێ گولله باران(ره می) بکرێت .سەعات چواری نیوه شەو قازی محەمەد دەبەنه گۆڕەپانی چوار چرا،بەڵام ناحەزان و دوژمنان به ئەزمونی کورد حوکمی راگەیەندرا و پێشێل دەکەن وکاتێك که قازی محەمەد چاوی دەکەوێتەداری سێداره.بەبێ ئەوەی ورەو دڵێری له دەست بدات ،دەڵێت "له ئایینی ئیسلامدا داری سێداره مەکرووهه و بێجگه لەوەش بەپێی یاسای دادگای سەربازی مافی ئەوەتان نییه له سێدارەمان بدەن ، بەڵکو دەبێ گوللەبارانمان بکەن.لەکاتی جێبەجێکردنی حوکمی له سێدارەدانی قازییەکاندا، جنایەتکارەکانی ئەو له سێدارەدانه تووشی ترس ببوون، چوونکه لەو نیوەشەوەدا ئەگەر دەنگی گولله بهاتایه ،خەڵك ئاگادار دەبوون و بۆ ئەوان دژوار دەبوو که رێبەرانی خۆشەویستی کورد بکوژن.

قازی محەمەد له پای داری سێداره، کورته قسەیەك دەکات وداوا له نەتەوەی کورد دەکات بۆ ئازادی درێژه بەخەبات بدەن. قازی محەمەد دەڵێت:" بڕوا بەدەوڵەتی خۆ فرۆشی پەهلەوی مەکەن، قسەو بەڵێنەکانیان هەمووی درۆیه،درۆیان لەگەڵماندا کرد . دەست له شۆڕش هەڵمەگرن ،بژی ئازادی .قازی هەنگاو بۆ لای سێدارەکه هەڵدەگرێت و دوژمنان واقیان وڕدەمێنێت و هۆکارەکەی لەپێشەوا قازی دەپرسن . وقازی دەڵێت :"ئەو مەرگه پیرۆزه و نسیبی هەموو کەسێك نابێت،شەهیدبوون لەرێگەی سەربەخۆیی و ئازادی میللەت شانازییەکی گەورەیه دەبێ پێشوازی لێبکرێت ،بۆیه به باوەڕەوه ئەو کاره ئەنجام دەدەم ."ئەمیرپەروێز وتبووی :"کاتێك که قازی محەمەد له سەر چوار پایەی سێداره ئیجازەی نەداچاوی ببەستن و وتی:

ئەی خائینەکان ، من له بەرامبەر نەتەوه و نیشتمانەکەمدا شەرمەزار نیم تا چاوم ببەستم ...دەمەویْ له دوایین چرکەکانی ژیانمدا به باوەڕو سەربەرزییەوه سەیری ئاسۆی نیشتمانی خۆشەویست و جوان و دڵڕفێنم بکەم که به چ شێوازێك تاریکی له ناو دەبات . من ڕۆڵەی وه

فاداری میللەت بووم و ئێستاش هەم. مەرگ بۆ داگیرکەران ،مەرگ بۆ پەهلەوی،بژی ئێرانی ئازاد،بژی نەتەوەی کورد وسڵاوبۆ کورد وکوردستان ...."

عەلادین سەجادی " لەبارەی قسەکانی قازی دەڵی) ئێوە ئێستا یەك قازی محەمەد دەکوژن ،بەڵام لەداهاتوودا هەزاران قازی محەمەد لە ئێران سەر هەڵدەدەن و کاروانی شۆڕش دەگەیەننە سەرکەوتن....و لەسەر ئەو باوەڕەم ئەو قازی محەمەدانە لەبەرامبەر داگیرکەراندا زۆر دڵڕق ئەبن بەرامبەر بەو کەسانەی کە بوون بە جەللادی شەعبی کوردی ) ئەمەی وت و پەتەکەی کردە ملی خۆیەوە .....

مورتەزا زەربەخت لە کتێبی ( لە کوردستان عێراقەوە هەتا ئەوبەری چۆمی ئاراس دا دەگێرێتەوە و دەڵێ : هەڵوێستی جیاوازی قازی محمد رێبەری کۆمەڵگەی کورد و هەڵوێستی پیشەوەری رێبەری ئازربایجان شوێنەواری جیاوازیان بەسەر خەڵکەوە هەبوو ، کاردانەوەی دوور لەیەکیان هێنابوە پێش ، پاش تێپەربوونی ۳۲ ساڵ پیشەوەری و فیرقەی دیموکراتی ئازربایجان ، هیچیان نەیانتوانی خۆشەویستیەك لە دڵی خەڵکدا بۆ خۆیان پەیدا بکەن ، لە کاتێکدا لە مەهاباد گۆڕی قازی محمد بوو بە مەزارگە و لە دەسپێکی شۆڕش و ساڵوەگەری شەهیدبوونیدا سەد هەزار مرۆڤ لە دەوری کۆبوون و لە بیرئاینی ئەو رێزیان نواند و بە گەرمی یادیان کردەوە .

## شێخ سەعیدی پیران
## باکوری کوردستان
## (١٨٦٠ – ١٩٢٥ ز)

شێخ سەعیدی کوڕی شێخ مەحمودی کوڕی شێخ عەلی، لە ساڵی (١٨٦٠) لە قەزای "پالو"ی هەرێمی "ئالازغ"ی کوردی لە کوردستانی باکور لەدایکبووە.شێخ عەلی باپیری دوای نیشتەجێ بوون لە "پالو" نازناوی شێخ عەلی پالوی وەرگرتووە. شێخ سەعید لە سەر دەستی باوکی و موریدەکانی باوکییەوە فێری نووسین و خوێندن بووە و ، زانستی فیقە و شەرعی ئیسلامی و مێژووی خوێندووە. دوای تەواو کردنی خوێندن مۆڵەتی وانە ووتنەوەی شەرعی پێدراوە و ، وانەی شەرعی بە قوتابیان وتووەتەوە.

دوای وەفاتی باوکی دەسەڵات و کاروباری خەڵکی ئەو ناوچەیە دراوە بە شێخ سەعید و ، ئەویش بۆتە ڕابەری تەریقەتی نەقشبەندی لە "پالو" و ، زیاتر لە هەزار موریدی هەبووە. لەناو موریدەکانیدا تورکیش هەبوون ، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان کورد بوون.

شێخ سەعید وەك شێخەکانی سەردەمی خۆی نەبووە ، بەڵکو زانایەکی زیرەك و چالاك بووە و ، بە یەکێك لە نوێکەرەوەکانی ئیسلامی ئەو سەردەمە ناسراوە. شێخ بڕاوی بەو شتانە نەبووە کە شێخەکانی ئەو سەردەمە بەکاریان هێناوە بۆ کۆکردنەوەی مورید لە دەوری خۆیان. شێخ ڕازی نەبووە کە دەروێش و موریدەکانی ، یان خەڵکی تر دەست ماچ بکەن و کڕنوشی بۆ بەرن.

هەمیشە خۆی لە ئاستی خەڵکدا ڕاگرتووە و ، خۆی لەوان بە گەورەتر نەزانیوە. پیاوی بیرمەند و ئازا و زانا لە مەجلیسیدا دانیشتوون و ، هەموو کاتی خۆی بۆ بڵاو کردنەوەی زانستی شەرعی تەرخان کردووە. لە گەڵ دەرکەوتن و دامەزراندنی کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسییەکان لە ساڵانی (١٩٠٨) و (١٩٢٣)دا سەرگەرمی سیاسەت بووە و ، پەیوەندی باشی لە گەڵ بنەماڵە ناودارەکانی کوردی ئەو سەردەمە هەبووە ، لەوانە: بنەماڵەی بەدر خان و ، بنەماڵەی شێخ عوبەیدوڵای نەهری و ، بنەماڵە سیاسەتمەدارەکانی تری کورد.

شێخ سەعید نازناوی "پیران"ی لەو کاتەوە وەرگرتووە کە لە گوندی "پیران"ی نزیك بە قەزای "بپلو" یەکەم شەڕی دەستەویەخەیی لە گەڵ سەربازەکانی تورکدا کردووە .

## شۆڕشەکەی

لە مانگی تشرینی دووەمی (١٩٢٤)دا عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعیدی پیران لە ڕێی دیاربەکرەوە چۆتە شاری "حەلەب"ی سوریا ، تاکو لە سەر ڕاگەیاندنی شۆڕش گفتوگۆ لە گەڵ سەرۆکەکانی تری کورد لەوێ بکات. دوای گەیشتنی عەلی ڕەزا کۆنگرەیەك دەبەسترێ و ژمارەیەك لە کەسایەتییەکانی کوردی تورکیا و عێراق و سوریا تیایدا بەشدار دەبن.

لە کانونی یەکەمی (١٩٢٤)دا حکومەتی تورکیا "عەلی خالد جوبرانلی" و :حاجی موسا" و "یوسف زیا" کە لە کۆمەڵەی ئازادی (ئیستقلال) بوون ، دەگرێ. کوردەکانیش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو کارەی تورکیا شێخ سەعیدی پیران بە سەرۆکی کۆمەڵەیٚ "ئیستقلال" هەڵدەبژێرن و ، لە هەمان کاتیشدا ڕۆژی نەوروز (١٩٢٥/٣/٢١) دیاری دەکەن بۆ ئاشکرا کردنی ڕاپەڕین بە سەرۆکایەتی شێخ سەعید.

لە (١٩٢٥/٢/٨)دا شێخ سەعید دەکەوێتە جەولە کردن و ، سەردانی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات دەکات. لەو کاتەدا کە بۆ سەردانی "عەبدولڕەحیم"ی برای چۆتە گوندی "پیران" هێزێکی سەربازی تورك بە سەرکردایەتی مولازم "حوسنی ئەفەندی" دەگاتە ئەوێ بۆ دەستگیر کردنی هەندێك لە خەڵکی ئەوێ. خەڵکی پیران ئاچن بە پیر لەشکرەکەوە و ، شەڕ دادەمەزرێ. ژمارەیەك لە سەربازەکانی تورك دەکوژرێن و ژمارەیەکیش ، کە "حوسنی ئەفەندی"یش لەناویاندا دەبێت ، بە دیل دەگیرێن.

لە (١٩٢٥/٢/١١)دا "تاهیر پیران"ی برای شێخ سەعید بە خۆیی و چەکدارەکانییەوە دەست دەگرن بەسەر کاروانێکی پۆستدا کە لە شارۆچکەی "لیجە"وە بەرەو "سیری" دەچێت و ، هەموو نامە و دۆکۆمێنتە گیراوەکان تەسلیم بە شێخ سەعید دەکات. هەرچەندە هێشتا (٤١) ڕۆژی مابوو بۆ کاتی ئاشکرا کردنی شۆڕشەکە ، بەڵام ئەم ڕووداوانە دەبنە سەرەتای دەست پێکردنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران.

لە (١٩٢٥/٢/١٤)دا شۆڕشگێڕەکان دەست دەگرن بە سەر پارێزگای "کینجۆ"دا و ، پارێزگار و هەموو فەرمانبەرە تورکەکان بە دیل دەگیرێن و ، "فەقێ حسەن"ی سەرۆکی خێڵی "مودان" دەکرێتە پارێزگاری "کینجۆ" و ، بەیانێك کە مۆری شێخ سەعیدی پیرانی پێوە دەبێت بڵاو دەکرێتەوە کە ئیتر "کینجۆ" دەبێتە پایتەختی کاتیی کوردستان. ئیتر دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و دینی دەکەوێتە دەستی شێخ سەعیدی پیران و ، هەموو باج و دیلەکان لە "کینجۆ" کۆدەکرێنەوە و ، بە بڕیارێك زەریبەی "دەیەك" نامێنێ و ، داوا لە

دانیشتوان دەکەن لەبری ئەوە کۆمەك و یارمەتی شۆڕشگێڕەکان بدەن. ئەم بڕیارەی شێخ لە لایەن خەڵکەوە پێشوازی لێکرا و ، دەستیان کردە یارمەتی دانی شۆڕشگێڕەکان لە (١٩٢٥/٢/٢٢)دا ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیا کۆبوونەوەیەکی بە پەلەیان کرد و ، سەرۆکی ئەرکانی سوپا "فەوزی پاشا" ئامادە بوو،حاڵەتی نائاسایی بۆ ماوەی مانگێك لەو ناوچانە ڕاگەیەندرا کە شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەکانی لێبوون و ، ناوی شێخ و چەکدارەکانی بە خائن لەقەڵەم دران.

لە ڕۆژی (١٩٢٥/٢/٢٥) تا (١٩٢٥/٣/١) شۆڕش پەرەی سەند و ژمارەی چەکدارەکان لە (٢٠) هەزار تێپەڕی و ، هێزەکانی ساڵح بەگ و حاجی حەسەن و عومەر فار و خێڵی مستیان و بوتانی و شێخ شەمسەدینی دیاربەکر پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کرد و ، هەڵوێستی حکومەتی تورکیا شپرزە بوو.

لە (١٩٢٥/٣/٢)دا حکومەتی فەتحی بەگ لە ئەنقەرە دەستی لەکار کێشایەوە و ، ڕۆژی دواییتر حکومەتێکی نوێ بە سەرۆکایەتی "عیسمەت پاشا" ڕاگەیەندرا.

لە (١٩٢٥/٣/٤)دا ئەنجوومەنی گەلی تورك یاسای ژمارە (٥٧٨)ی دەرکرد. ئەو یاسایە دەسەڵاتێکی زۆری دا بەو دەزگایانەی دەوڵەت کە دژ بە بزووتنەوە میللییەکان دەوەستنەوە. ئەم ئەنجوومەنە لە بڕیارێکی تردا دوو دادگای بە ناوی دادگای ئیستقلالەوە دروست کرد. یەکێکیان لە ئەنقەر بوو و ، دەسەڵاتی دیاری کرا بوو و بە بێ ئاگاداری ئەنجوومەنی گەل نەیدەتوانی حوکمی لەسێدارە دەربکات و ئەنجامی بدات. دووەمیان لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بوو و هەموو دەسەڵاتێکی هەبوو ، لەوانە: دەرکردن و ئەنجامدانی حوکمی لەسێدارەدان.

لە /١٩٢٥/٣/١١)دا شێخ سەعید فەرمانی دەرکرد بۆ چوونە سەر شاری دیاربەکر. بەڵام لەشکری تورکیا کە خاوەنی توپ و جبەخانەی باشتر بوو ، توانی لەشکرەکەی شێخ سەعید بشکێنێ. شێخ سەعید فەرمانی کشانەوەی دا و ، شۆڕشگێڕەکان گەڕانەوە بۆ دیرخانی.

لە (کۆتایی مانگی مارتی (١٩٢٥)دا لەشکری تورکیا دەستی دایە هێرش کردن بۆ سەر ناوچەکانی بن ڕکێفی شۆڕش و ، لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی دا. شۆڕشگێڕەکان ناچار بوون بەرەو "پالو" بکەڕێنەوە .

لە (١٩٢٥/٤/٦)دا شێخ سەعیدی پیران بە ناچاری خۆی و (٣٠٠) چەکدار گەڕانەوە بۆ "سالحان" و ، لەناوەندی مانگی نیسانی (١٩٢٥)دا لە "کینجۆ"ی پایتەختی کاتی

کوردستاندا گەمارۆی شێخ سەعید و شۆڕشگێڕەکانی درا و ، سەرانی شۆڕش ، بە شێخی پیرانیشەوە ، بەدیل گیران.

لە (١٩٢٥/٥/١٤)دا دادگایی ژمارەیەکی زۆر لە سەران و لێپرسراوانی ئەو شۆڕشە کرا و ، ژمارەیەکیان لە (١٩٢٥/٥/٢٧)دا لەسێدارە دارن و ، ژمارەیەکیش خرانە زیندانەوە .

لە (١٩٢٥/٥/٢٩)دا دادگایی شێخ سەعید دەستی پێکرد و یەك مانگی خایاند. ئەوانەی لە گەڵ شێخ سەعید دادگایی کران: شێخ عەبدولا ، شێخ ئیسماعیل ، شێخ عبداللطیف ، ڕائد قاسم ئیسماعیل ، حاجی خالد عەبدولحەمید ، ڕەشیدی چەرکەسی و ، هەندێکی تر لە سەرکردەکانی ئەو شۆڕشە بوون.

لە (١٩٢٥/٦/٢٩)دا حوکمی لەسێدارەدان بۆ شێخ سەعید دەکرا و ، لە (١٩٢٥/٦/٣٠)دا لە گۆڕەپانی مزگەوتە گەورەکەی شاری دیاربەکر لەسێدارە درا.

لە بەردەم پەتی سێدارەکەدا شێخ ووتی: وا ژیان خەریکە کۆتایی دێت و ، هەرگیز پەشیمان نیم لەوەی لە پێناوی خوادا کردوومە. ئێمە دڵمان خۆشە چونکە کوڕ و کچەزاکانمان لە بەر ئێمە شەرم دایاننا‌گریێ لەبەردەم دوژمناندا .

## دکتۆر مارف خەزنەدار

## باشووری کوردستان

## ( ١٩٣٠ – ٢٠١٠ ز )

**ناوی تەواوی مەعروف عەبدولقادر مەعروف عەزیز خەزنەدار–ە، لە ١٩٣٠/١١/١ لەشاری هەولێر لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەشاری هەولێرو ئامادەیی لەشاری کەرکوك تەواوکردووە. ساڵی ١٩٥٢ دەبێتە مامۆستای سەرەتایی و پاشان دەبێتە فەرمانبەر بەپلەی نووسەر لەبەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی ئەوکاتە تا ساڵی ١٩٥٧.**

**ساڵی ١٩٥٧ خوێندنی زانکۆی تەواوکرد لەکۆلێژی ئاداب لەبەغداو بەکالۆریۆسی لەزمانی عەرەبی بەدەستهێناو بووە مامۆستای زمانی عەرەبی. لەئاداری ١٩٦٠ پەیوەندیی بە البعثة العلمیە العراقیە کردو بۆ ماوەی نۆ مانگ بوو بەخوێندکار لەمۆسکۆ، پاشان لەشاری سانت پترسبۆرگ نیشتەجێبوو بووە خوێندکاری خوێندنی باڵا لەبەشی لێکۆڵینەوەی کوردی لەپەیمانگای دیراساتی رۆژهەڵات سەر بەئەکادیمیای زانستی ڕوسیا و بڕوانامەی ماستەری بەدەستهێنا، لەکۆلێژی رۆژهەڵات لەزانکۆی سانت پترسبۆرگ بڕوانامەی دکتۆرای بەکۆی دەنگی لیژنەی گفتوگۆ بەدەستهێنا لەساڵی ١٩٦٣. ساڵی ١٩٦٨ بووە مامۆستا لەبەشی کوردی زانکۆی بەغداو هەڵبژێردرا بەسەرۆکی ئەو بەشەو تیایدا بەردەوامبوو تاکو خانەنشینبوونی لەساڵی ١٩٨١ دا.**

**لە ١٩٧٣ دا ناونیشانی مامۆستای یاریدەدەری وەرگرت.**

**لە ١٩٧٩ دا ناونیشانی مامۆستای بەپلەی پرۆفیسۆر وەرگرت.**

**ساڵی ١٩٧٣ بەشی کوردیی لەکۆلێژی پەروەردەی زانکۆی بەغدا دامەزراند.**

**وەکو نووسەرو سەرنووسەر لەچەند گۆڤارو رۆژنامەیەکدا کاریکردووە.**

**٣٢ کتێبی چاپکراوی هەیە لەنووسین و وەرگێران و لێکۆڵینەوەو بواری خوێندن، لەگرنگترین ئەو چاپکراوانە مێژووی ئەدەبی کوردییە، کە لەحەوت بەگ پێکهاتووە.**

**ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی عیراقە.**

**لەساڵی ١٩٦٠ ەوە ئەندامی یەکێتیی رۆژنامەنووسانی جیهانە.**

**ئەندامی کارای کۆڕی زانیاریی کوردستان بووە.**

**لە ٢٥–١٠–٢٠١٠ لە هەولێر بە نەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کرد.**

هەروەها چەند ژمارەیەکی گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری)ی دەرکردووەو لە گۆڤاری (رۆژی کوردستان- شمس کوردستان) دەستەی نووسەران و لە گۆڤاری (کاروان) راوێژکاری ئەدەبی و رۆشنبیری بووە. لە بواری ئەکادیمیدا لە بەشی کوردیی زانکۆی ئەدەبیاتی بەغداو هەروەها بەشی ئەدەبیاتی زانکۆی عەنتابی جەزائیرو بەشی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر مامۆستا بووەو ئەندامی کۆڕی زانیاریی .

## بەرهەمەکان

مارف خەزنەدار هەر لە (٥٠) کانەوە دەستی بە نووسین کردووە و وتاری بڵاوکردۆتەوە. یادداشتە ڕۆژانەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٣٠ هەتا ساڵی ١٩٩١ لە دووتوێی ٧ بەرگدا نووسیوەتەوە بەناوی دیجلەی هزرم. دوا بەرهەمیشی بریتییە لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی، کە لە ٧ بەرگدا چاپی کردووە. دکتۆر مارف خەزنەدار، خاوەنی نزیکەی ٣٠ کتێبی چاپکراوە، لەوانە:

**به کوردی:**

کێش و قافیە لەشیعری کوردیدا، بەغدا، ١٩٦٢.

کورد، تێبینی و تێڕوانین، ڤلادمیر مینۆرسکی، وەرگێڕان و پێشکەشکردن و لێکۆڵینەوە، بەغدا، ١٩٦٧.

بووکە شووشە، چیرۆکی کوردی، بەغدا، ١٩٦٩.

ئەڵەمان و چەند چیرۆکێکی تری کوردی، بەغدا، ١٩٦٩.

عەبدوڵا بەگی میسباحولدیوان، بەغدا، ١٩٧٠.

زمان و ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٧١.

دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا، ١٩٧٧.

نالی لەدەفتەری نەمریدا، بەغدا، ١٩٨١.

لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، بەغدا، ١٩٨٤.

کوردیادە، لەندەن، ١٩٨٥.

گەشتێك بۆ ئەرزڕوم، وەگێڕان لەڕوسیەوە، سوید، ١٩٩٥.

ئەدەبی کوردی و کێشەی پاسترناك، هەولێر، ١٩٩٥.

کوردی تورکمانستان، هەولێر، ١٩٩٥.

**به عەرەبی:**

العدل الاجتماعي، بەغدا، ١٩٤٥

مغاني كوردستان، بەغدا، ١٩٥٦

الأكراد، نووسینی: مینورسکی، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە بۆ عەرەبی، بەغدا ١٩٦٨

مخطوطات فريده ومطبوعات نادره، بەغدا، ١٩٧٨

تاريخ الاستشراق، بغداد، ١٩٨٠

الرحالە الروس في الشرق الأوسط، نووسینی: ب.م.دانتسيغ، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە بۆ عەرەبی، بیروت، ١٩٨١

**بە ڕووسی:**

دوانزە سوارەی مەریوان و پازدە چیرۆکی تری کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦٨

مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ، مۆسکۆ، ١٩٧٦.

## شێخ محمد خاڵ

## باشوری کوردستان

(١٩٠٤ – ١٩٨٩ ز)

مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ ئەمینی خاڵە ، کە بەپێنج پشت دەگاتەوە به مەلا مستەفای موفتی بابانەکان، مەلا مستەفای باپیرە گەورەی شێخ محەمەدی خاڵ پاش گواستنەوەی میرنیشنی بابان لە قەلاچوالانەوە بۆ سلێمانی، ساڵی ١٧٨٤ لەگەڵ خۆیدا دەستنووسەکانی هێناوە ، ئەو دەستنووسانە لە باپیرە گەورەیەوە ، کە "مەلا ئەبوبەکری موسەنیفە" بۆی ماوەتەوە ، ئێستا مێژووی بەشێك لە دەستنووسەکانی شێخی خاڵ، کە نزیکەی ٦٣٦ دەسنووسە دەگەڕێتەوە بۆ چوارسەد ساڵ لەمەوبەر.

مامۆستا خاڵ لە ساڵی ١٩٠٤ لەشاری سلێمانی لە بنەماڵەیەکی ئایینی ناوداری کوردستان لەدایکبووە ، لە ساڵی ١٩٤ باوکی بەنەخۆشی کۆچی دوایی دەکات، باپیری "حاجی شێخ ئەمینی خاڵ"، کە پیاوێکی ناوداری خواپەرست بووە ، خاڵ و هەر چوار براکەی بەخێو کردووە ، سەرەتای خوێندنی لای باپیری بووە و لە قوتابخانەی باپیریدا بەڕاستگۆیی و دەستپاکی و خواپەرستی و ڕازیبوون و دوورکەوتنەوە لە هەڵپەی جیهان پەروەردە بووە .

مامۆستای خاڵ هەر لە منداڵییەوە ئەوینی خوێندن و نووسین و خولیای پەرتووك و دەستنووس بووە ، بەشی زۆری خوێندنی لای مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی بووە ، کە زانایەکی ئایینی بەناوبانگ بوو، نەك هەر لە کوردستاندا، بەڵکو لەناو زانا ئایینیە عەرەبەکانی عێراقیشدا، بەشێکیش لە خوێندنی لای مەلا حوسێنی پیسکەندی و شێخ جەلالی قەرەداغی بووە .

لەساڵی ١٩٣١ باپیری کۆچی دوای دەکات، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ لەوسەردەمەدا بەڕێکاری سولێمانی بووە ، ئاهەنگێکی گەورە لە مزگەوتی حاجی شێخ ئەمینی خاڵ ساز دەکات، کە زۆربەی پیاو ماقووڵانی سلێمانی بانگهێشت دەکرێن و هەر لەم ئاهەنگەدا بەفەرمانی فەرمیی شێخ خاڵ دەکرێت بە پێشنوێژ و وانەبێژی مزگەوتەکەی باپیری.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٣١ تا کۆتای ساڵی ١٩٣٨ بەوانەوتنەوە و پرۆژەی دانانی فەرهەنگی خاڵ و ڕێزمانی کوردی و چەند پەرتووکێکی ئایینی وەك "فەلسەفەی ئایینی ئیسلام و ژیانی پێغەمبەر"ەوە سەرقاڵ دەبێت.

هەر لەم ماوە کورتەدا دوو پەرتووک بەچاپ دەگەیێنێت، پاشان لەساڵی ١٩٣٩ لەلایەن شالیارێتی دادەوە بانگەواز دەکرێت بۆ پێویستی چەند قازییەک، ئەویش بەشێوەی تاقیکردنەوە .

شێخ خاڵ یەکێک دەبێت لەوانەی تاقیکردنەوە ئەنجامدەدات و پلەی یەکەمی بەدەست دەهێنێت. بەفەرمانی پادشایەتی دەکرێت بە قازی و لە هەڵەبجە دادەمەزرێت، ئیتر ناچار دەبێت دووربکەوێتە لەوانە وتنەوە ، لە ژیانی فەرمانبەرێتیدا یەکێک بووە لە قازییە ناودارە شارەزاکانی عێراق و لە ماوەی ٢٨ ساڵ کار وەک قازی لە "چەمچەماڵ و سولێمانی و کەرکووک و مووسڵ" ئەنجامداوە .

لەساڵی ١٩٦٢دا لەناو هەموو قازییەکانی عێراقدا هەڵبژێراوە بە ئەندامی دادگای جیاکردنەوەی شەرعی لە بەغدا، لەم ماوە زۆرەدا جێ پەنجەی لە شالیارێتی داددا دیار و ناسراو بووە ، بەوەی کە بەهیچ جۆرێک لەیاسا و شەریعەت لاینەداوە ، هەرچەندە چەند جارێک لەلایەن کاربەدەستانی زۆر گەورەوە فشاریان خستۆتە سەر بۆ ئەوەی لەیاسا لابدات. بەڵام بێ سوود بووە .

شێخی خاڵ لەبەرئەوەی نووسەرێکی خاوەن بیرولێهاتوو بووە ، خاوەنی بەرهەمی زۆر و بەکەڵک بووە ، بۆیە یەکێکە لەو کوردە زۆردەگمەنانەی کە لە زۆر زووەوە بووە بە ئەندام لە کۆڕی زانیاری عێراقدا، تەنها خوالێخۆشبوو "تۆفیق وەهبی بەگ" لەپێش ئەوەوەیە لەمبوارەدا، شێخی خاڵ لەساڵی ١٩٥٣وە ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراق بووە و لە ساڵی ١٩٧٢ەوە جێگری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردیش بووە ، جێ پەنجەی زۆر دیارە لە هەردوو کۆڕەکەدا، بەرهەمەکانی باشترین بەڵگەن لەم ڕووەوە و توانیوەتی خزمەتی نەتەوەکەی بکات لە بواری ڕۆشنبیریدا و لەڕێی هەردوو کۆڕی زانیارییەوە ناوی گەورە پیاوانی کورد بگەیەنێ بەجیهان، وەک "موفتی زەهاوی"، کە باوکی شاعیری گەورەی بەناوبانگ "جەمیل سدیق زەهاوی"یە ، هەروەها "بێتوش"، "شێخ ئەحمەد فائیز بەرزنجی"، "بابەتایەری هەمەدانی"، "مەلا محەمەدی خاکی" و چەندین زانای دیکەی ناودار.

مامۆستای خاڵ کەسایەتیەکی کۆمەڵاتی ڕەوشت جوان و زمانپاک و دڵفراوان و مێشک کراوەو لەسەرخۆ بووە و تاڕادەی خواپەرستی باوەڕی بەڕاستکۆیی و لێبووردن و ڕێزگرتن

له ماف و دادوەری هەبوو، لەو باوەڕەدا بوو، کە کوردایەتی خواپەرستییە ، بۆیە لەناخی دەروونییەوە دژی هەموو جەور و ستەمێك بوو، کە لە نەتەوەکەی دەکرا.

یەکەم وتاری کە گۆڤاری گەلاوێژدا لە کانوونی دووەمی ١٩٤٠دا لەژێرناونیشانی "خۆشەویستی نیشتمان" دایە کەسانی تر، ئەگەر تەنیا هەستی نەتەوایەتی هاندەربوایە بۆ بەربەرەکانی ئەو ڕژێمانەی کە بەردەوامبوون لە کاولکردنی کوردستان و زەوتکردنی خاکی کوردستان، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لەگەڵ هەستی نەتەوایەتیدا هەستی ئایینیش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە زیادکردنی گڕ و بڵێسەی تۆڵەسەندن تێیدا بەرامبەر بە دوژمنانی کورد و کوردستان، و لەو باوەڕەدا بوو، کە دەبێت ئایین ئاوێتەی نیشتمانی و نەتەویەتی بێت و خەباتی نیشتمانیش پێویستیەکی ئایینی بێت.

شێخ محەمەد خاڵ ڕۆژانە ١٠ کاتژمێر بەنووسین و خوێندنەوەوە سەرقاڵ دەبوو، لەسەر ئەم پرۆگرامەش تامردن هەر بەردەوام بوو، سەرەتای خوێندنەوەی لە دەمەوبەیانیەکی زووەوە تا نزیکی نیوەڕۆ، کە دەیکردە نزیکەی ٦ کاتژمێر لەجیهانی پەڕتووك و دەستنووسدا و دوانیوەڕوانیش پێش ئەوەی بڕوات بۆ مزگەوت ٣ کاتژمێر لە خوێندنەوە و پێداچوونەوەی ئەو پەرتووکانەی، کە لەژێر چاپدابوون و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان، شەوانەش پێش نووستن ماوەی کاتژمێرێك بە خوێندنەوەوە خەریك دەبوو، لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە تەنها یەك چاوی مابوو و بەردەوام زەرەبینی بەکاردەهێنا بۆ خوێندنەوە و هەندێك جار پێیان دەگوت: "کەوتویتەتە تەمەنەوە و ئیتر ئەوەندە خۆت ماندوومەکە " لە وەڵامدا دەیگوت: "تەندروستیم بەندە بەخوێندنەوە و نووسینەوە ، ئەگەر دوورم بخەنەوە لێی، نەك هەر تەندرووستیم خراپ دەبێت، بەڵکو لەوانەشە بمرم، من وەك ماسی چۆن، کە لە ئاو دەرت هێنا دەمرێت، منیش گەر دوورم بخەنەوە لە پەرتووك و نووسین ئەوا دەبێ ماڵئاواییتان لێبکەم، بۆ نیوە چاوەکەشم، تو خوا چاوێك لەم ڕێگایەدا کوێر نەبێت بۆچی باشە ؟"

مامۆستای خاڵ لە ڕۆژی ١٩٨٩.٠٧.١٥دا ماڵئاوایی لە جیهانی زانست و زانیاری کرد و بەرە و جیهانی کۆتایی کەوتەڕێ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە دوای خۆی ٤٠ پەرتووکی لەچاپدراوی بەجێهێشتووە ، کە زانستەکانی "لێکدانەوە ، زمانەوانی، وێژەیی، بانگخوازی، مێژوویی،....هتد" لە خۆی دەگرێت

# مـــەلای گـــەورەی کـــۆیە
## باشـــوری کوردستـــــان
## ( ١٨٧٦ - ١٩٤٣ ز )

مەلا محەمەدی کۆیی ناسراو بەمەلای گەورە زانایەکی ئایینی چاکسازو شاعیرێکی لێهاتووی شیعری کۆمەلآیەتی بوو، ئەو کەسە گەورەیە لەنێوانی ساڵی ١٨٧٦ و ١٩٤٣دا ژیانێکی پڕ لە خەبات و بەرهەمی زانستی و وێژەیی بەسەر برد و هەڵوێستێکی ڕاست و دروستی بەرامبەر بە ئازادی نیشتمانەکەی و مافی ئافرەتانی کوردستان هەبوو.

ئەو زانا و شاعیرە خاوەن هەڵوێستە لەوە گەیشتبوو تاکو ئافرەتی کورد ئازاد نەبێ و، لە مافی ڕامیاری و کۆمەلآیەتی و ڕۆشنبیری لەگەڵ پیاودا یەکسان نەبێت، کۆمەڵگای کوردەواری پێش ناکەوێ و ناچێتە ڕیزی نەتەوە پێشکەوتووەکانی جیهان.

ئەم شاعیرە چاکە خوازە هۆنراوەی تایبەتی لەسەر مافی ئافرەت داناوە و کچی خۆی. ئەوەی "نەجیبە خانی جەلیزادە" بووە ، لەساڵی ١٩٢٤دا ناردوویەتیە قوتابخانەی کوڕان لەکۆیە تاکو بخوێنێ و ئەم هەڵوێستەی لەو دەمە بووە کە زۆربەی مەلاکانی سەردەمی ئەو حەزیان نەدەکرد کوڕ بچنە بەر خوێندنی قوتابخانەی فەرمی کوڕان نەبادا دینیان بێ هێز بێت.

مەلای گەورە ویستوویەتی لە کۆمەڵگای کوردەواری دا کچ و کوڕ بە چاوی یەکسانی سەیر بکرێن، چونکە بەبێ هەوڵ و کۆششی نێرومێ میللەتی کورد پێش ناکەوێ و ناچێتە ڕیزی گەلانی جیهان و بۆ ئەم مەبەستەش هۆنراوەیەکی کۆمەلآیەتی بەنرخی بەناوی (تەلآق) داناوەو ئافرەتی لە ڕووی مافی کۆمەلآیەتی و ئابووری و ڕامیاریەوە لە تای تەرازووی پیاو داناوە و نەفرەت لەدیاردەی تەلآقدانی ئافرەت دەکات و بەم جۆرە دەست بە هۆنراوەکەی دەکات:

بڵێن بە قەومی کـــوردان     دەستی من و دامێنیـــــان
عەیبە بە حەققی یەزدان     ژن هێنان و تەلآقـــدان

ئینجا شاعیر دەکەوێتە سەر وەسفی ئافرەت و ڕۆڵی لە ژیانی هاوسەریدا و نرخێکی زۆری پێدەدات و بەجوانی جیهان و سپاردەی خوداو خۆشەویستی پێغەمبەر و پشتیوانی پیاوی دادەنێ و دەڵێ:

ژن زینەتی دنیایـــە     ئەمانەتی خودایـــە

ئینجا شاعیر لەسەر نوێترین تیئۆری پەروەردەکردنی ئادەمیزاد، داوای ئەوە دەکات گەر ئافرەت ڕێزی ڕابگیرێت و بە چاکی پەروەردە بکرێ و لەناو دەورو بەرێکی پڕ لە شادیدا بژیت، ئەوا ڕۆڵەی ئازاد و دلێری دەبێت و وەکو شێر ئازا و دانا دەبێت و بەدڵ و دەروون دەوڵەمەند و بەچاو بەخشندە دەبێت و ئەو ڕۆڵەیەی کە دەشیبێ لە دووا ڕۆژدا دەبێتە گەورە و سەرداری میللەتەکەی و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ژن ئەگەر بەحورمەت بـێ | زیللەت و زەحمەت بێ |
| بەتەربیەو ڕەحمەت بـــێ | گوشادو لێو خەنـــدان |
| کوڕی دەبێ وەکو شێـــر | قـلێ و دانـــاو دلێـــر! |
| بەدڵ غەنی بە چاو تێـــر | ڕدارو مەردی مەیـدان!! |

دوا بەدوای ئەمە شاعیر وەك زانایەکی سایکۆلۆژیای ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەبڕێ کە دایك مامۆستای یەکەمی منداڵەو کۆشی ئەو دایکە یەکەمین قوتابخانەی ڕۆڵەکەیەتی و پەروەردەکردنی لەئەستۆی دایك دایە و باوك ئەوەندە ئاگای لە پەروەردەکردنی ساواکەی نییە و لەم ڕووەوە دەڵێ:

تەربیە لـــەلای داکـــە
داك چابێ ئەولاد چاکـــە
باب لە ئەسلا بێ باکـــە
فەرقێکی ناکا چەنـــدان!!
داڵە مامۆستای فێتریـــە
تەشەکولت لە ویـــــە
ماددی یا مەعنەوییـــــە
ڕوشدە یا لـــەرێ لادان!!

ئینجا لە دوا هەنگاوی هۆنراوەکەیدا دووبارە لەیەکسانی ژن و مێردو (نێرومێ)وە دەدوێ و ئەوەمان بۆ دەردەبڕێ کە ئافرەتیش وەکو پیاو وایە چاوپۆشی پێویستە و هەردووکیان لە ئاستی یەك دەسەڵاتدان و دەڵێ:

ژنیش وەك موزەکـــــەرە
عەینی ئەویش بەشـــــەرە

چاولادانی لە ســـــــەرە

هەردووك لەیەك حوكمدان!

بەم جۆرە مەلای گەورە دوای حاجی قادری كۆیی یەكەمین مەلای شاعیر بووە ئەوەندە گرنگی بە یەكسانی نێرومێ و ماف ئافرەت لە ژیان و خوێندن و هەموو بوارەكانی كۆمەڵایەتی ئابووری دا بێ و بەشێكی دیوانەكەی بۆ تەرخان كرد بێت .

## سەعیدی نووروسی

## باگوری کوردستان

## (١٢٩٤ك /١٨٧٦ز)

لە نێوان چیا بڵندەکان و لە بەرەبەیانی یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی (١٢٩٤ك /١٨٧٦ز) لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگەی "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی "بدیع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسی" لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.

"صۆفی میرزا"ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی منداڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە منداڵەکانی نەداوە!

هەر لە قۆناغی منداڵییەوە هەڵکەوتوویی و زیرەکیی پێوە دیار بووە و، لای زانا بەناوبانگەکانی ژینگە و سەردەمی خۆی زانستە ئیسلامییەکانی خوێندووە و، بەشێکی زۆری کاتەکانی بە تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی دەوروبەری بەسەر بردووە و، لەگەڵ زانایاندا کەوتووەتە وتو وێژ و گفتوگۆی زانستییەوە. تا لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی "عالمی"ی وەرگرتووە!

هەر لە تافی لاوی و لە خەونێکی ڕاستدا بە خزمەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەرەفمەند بووە و داوای (زانستی قورئان)ی لێ کردووە، حەزرەتیش لەو خەونەدا مژدەی داوەتێ کە: "سیوهبُ لك علمُ القرآن ما لم تسألْ شیئاً من الأمة"! واتە زانستی قورئانت پێ دەبەخشرێت بە مەرجێك " سوئاڵ"ی هیچ شتێك لە نەتەوەکەم نەکەیت. ئەویش تا لە ژیاندا ما سوئاڵی لە کەس نەکرد، نە بە واتای "پرسیار" و نە بە واتای "سواڵکردن" تەنانەت لە موحتاجترینی کاتەکانی تەمەنیدا دیاری و سەدەقە و زەکاتیشی لە خەڵکی وەرنەگرتووە!

زیرەکی و زەینڕۆشنی و توانای لەبەرکردنی هێندە کەموێنە و لەڕادەبەدەر بووە کە توانیویەتی نزیکەی "نەوەد" کتێبی مەتنە سەرەکییەکان لەبەر بکات، لە بابەتەکانی: (نەحوو، صەرف، تەفسیر، حەدیث، مەنتیق، فیقهی ئیسلامی ... هتد). جگە لەمانەش هەر لە سەرەتای فەرهەنگی بەناوبانگی "قاموس المحیط"ەوە تا دەگاتە "باب السین"ی ئەو فەرهەنگەی لەبەر کردووە کە کۆی لاپەڕەکانی دەکاتە: (٧٠٨) لاپەڕە، ئینجا بە ماوەی یەك

حەفتەش کتێبی "جمع الجوامع"ی سەر بە زانستی ئوصولی فیقهی خوێندووە و لەبەریشی کردووە!

بۆ مەبەستی موتاڵاکردن و خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی پێویستی بوون سوودی لە کتێبخانە پڕ لە کتێبەکانی "عمر پاشا"ی والیی "وان" و "تایەر پاشا"ی والیی "بەدلیس" وەرگرتووە کە ڕێزی

زۆریان لێ ناوە و بایەخیان پێ داوە.

لە ئەنجامی مونازەرە و وت و وێژی لەگەڵ هەندێ مامۆستای زانستە نوێکانی سەردەمدا هەستی کردووە کە پێوستیی بەو زانستانە هەیە، بۆیە لە شاری "وان" دەستی بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی کتێبەکانی ئەو زانستانە کردووە، وەك: (بیرکاری، فەلەك، کیمیا، فیزیا، زەویناسی، فەلسەفە، مێژوو، جوگرافیا... هتد" تەنانەت توانیویەتی لە هەندێکیشیاندا کتێب دابنێت!

لەبەر ئەم زیرەکییە بێوێنەیەی، ناوبانگی بە: (سەعیدی مەشهوور) و پاشان بە: (بدیع الزمان) بڵاوبووەتەوە.

لە ساڵی ١٨٩٧زدا مامۆستا "بدیع الزمان" هەواڵێکی لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا خوێندەوە کە بریتی بوو لەوەی: "گلادستۆن"ی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لە پەرلەمانی وڵاتەکەیدا نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی بە دەستەوە گرتووە و بە ئەندامانی پەرلەمانی وتووە:

(هەتا ئەم قورئانە لەناو موسڵماناندا بمێنێت ئێمە ناتوانین حوکمڕانییان بکەین، کەواتە چار تەنها ئەوەیە کە قورئان لەسەر زەویدا نەهێڵین، یاخود پەیوەندیی موسڵمانەکانی پێوە ببچڕین)!

ئەم هەواڵە تەزووی بە جەستەی "بدیع الزمان"دا هێنا و حەوانەوە و سرەوتی لێ بڕی و، بۆ هەموو کەسانی دەوروبەری خۆی بە ئاشکرا ڕاگەیاند کە:

(دەبێ بە بەڵگە بۆ هەموو جیهانی بچەسپێنم و پێیان بسەلمێنم کە قورئانی پیرۆز خۆرێکی مەعنەوییە، تیشکی ئەو خۆرە هەرگیز کز نابێت و ڕووناکییەکەشی بە هیچ کەسێك ناکوژێتەوە).

دوای ئەم ڕووداوە ڕۆشت بۆ ئەستەمبووڵ و پڕۆژەی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی لە کوردستاندا بە ناوی "زانکۆی زەهراو " = بە وێنەی زانکۆی ئەزهەری پیرۆز =

پێشکەشی کاربەدەستان کرد، زانکۆیەك کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام بگرێتە ئەستۆی و، زانستە ئایینی و زانستە گەردوونییە نوێکانی پێکەوە تێدا بخوێنرێن، بەپێی نەخشە و بۆچوونی ئەو وتە بەناوبانگەی خۆی کە تیایدا دەڵێت:

(ڕووناکیی دڵ: زانستە ئایینییەکانە و، نووری عەقڵیش: زانستە گەردوونییە نوێکانە. بە تێکەڵکردنی ئەم دوانە "ڕاستی" دەردەکەوێت و، بە لێکجیابوونەوەشیان، لەمیاندا فڕوفێڵ و گومان و، لەویشیاندا دەمارگیریی بێکەڵك و نەفرەتلێکراو، سەرهەڵدەدات)!

لەم هەوڵەی ئەم جارەیدا و لە هەوڵێکی تریشدا کە لە ساڵی ١٩٠٧زدا بۆ هەمان مەبەست ڕۆشت بۆ ئەستەمبووڵ و هەوڵ و تەقالای خۆی خستەکار، هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا، بەڵام لە ساڵی ١٩١١زدا توانیی قەناعەت بە سوڵتان ڕەشاد بکات و، سوڵتانیش بڕێك پارەی بۆ ئەو پڕۆژەیە تەرخان کرد و، لەسەر لێواری "دەریاچەی وان" دەست کرا بە کارکردن لە بنیاتنانی ئەو زانکۆیەدا، بەڵام هەڵگیرسانی یەکەم جەنگی جیهانی پەکی تەواوکردنی پڕۆژەکەی خست.

هەر لە ساڵی ١٩١١زدا سەردانی وڵاتی "شام"ی کرد و، لەسەر مینبەری مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق وتارێکی گرنگی بە زمانی عەرەبی ئاراستەی زانایانی ئەو وڵاتە کرد کە دوایی بە ناونیشانی "الخطبة الشامية" (واتە وتاری شام) چەند جارێك چاپ کرا و، پاشان هەر خۆی بە درێژە پێدانەوە وەریگێڕا بۆ زمانی تورکی و ئەم دەقەی دواییش سەرلەنوێ چەندین جار کراوەتەوە بە عەرەبی و بۆ چەند زمانێکی تریش وەرگێڕراوە.

هەرچەند ڕای مامۆستا سەعیدی نەورەسی لە یەکەمین جەنگی جیهانی دا لەگەڵ ئەوە نەبوو کە دەوڵەتی عوسمانی بە جەنگەوە بگلێ، بەڵام هەر ئەوەندەی بەشداریی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگدا ڕاگەیەنرا، یەکسەر خۆی و قوتابییانی هاوبەشییان لەو جەنگەدا کرد دژی ڕوسیای قەیسەری، کە لە بەرەی قەفقاسەوە هێرشی بۆ شارە سنوورییەکانی کوردستان دەبرد. فەرمانەدەی سوپایش سەرکردەیی (هێزە یارمەتیدەرەکان)ی پێ سپارد کە لە قوتابییانی نەورەسی و خۆبەخشەران پێك هاتبوون.

"بديع الزمان" و هێزەکەی لە چەندین جەنگی گرنگدا لە دژی ڕووسەکان بەشداریی ئازا و بەجەرگانەی جیهادیان کرد و، هێندە ئازایەتی و توانا و لێهاتنی لەو جەنگەدا نواند کە سەرنجی فەرمانەدەی سوپا و تەنانەت چاودێرە بیانییەکانیشی ڕاکێشابوو!

کاتێك کە سوپای ڕووس بە ژمارەیەکی زۆر زیاتر لە سوپای بەرگریکەران ڕژانە ناو شاری بەدلیسەوە "بدیع الزمان" و قوتابییانی بەرگرییەکی مەردانە و فیداکارانەیان لە شارەکەیاز دەکرد، تا لە ئەنجامدا بە سەختی پێکرا و لە هۆشی خۆی چوو، ئنجا ڕووسەکانیش لە ١٩١٦/٣/٢زدا بە بریندار ی "دیل"یان کرد و بردیان بۆ بەندیخانەی ئەفسەرە دیلەکان لە شاری "کۆستروما"ی سیبیریا. لە ماوەی "دیلی"دا بەردەوام وانەی ئیمانیی بە ئەفسەرە دیلەکانی هاوڕێی دەوت، کە ژمارەیان نەوەد دانە بوو.

هەر لەو ماوەیەدا و لەبەر نواندنی هەڵوێستێکی بەجەرگانەی ئەوی زانا و موجاهید و خاوەن عیززەتی ئیسلام و، هەڵنەسانی لەبەر سەرکردەیەکی گەورەی سوپای ڕووس کە خاڵی قەیسەر و سەرکردەی بەرەی قەفقاس بوو، لە پەتی سێدارە و بەدەستهێنانی "پلەی شەهیدی" نزیك بووەوە، بەڵام خوای گەورە لەبەر ئەوەی بۆ ئەرکێکی گەلێ گرنگ و گەورەتر هەڵی گرتبوو، لەو تاقیکردنەوەیە بەسەریبەرزەوە هێنایەدەر و لە حوکمی ئیعدام ڕزگاری کرد!

پاشان بە جۆرێکی گەلێ سەرسووڕهێنەر و ناوازە و بە چاودێرییەکی ئاشکرای پەروەردگار لە

دیلی هەڵهات و، لە ڕێی (وارشۆ - ئەڵمانیا - ڤیەننا)وە گەڕایەوە وڵات.

کە لە بەرواری ١٩١٨/٦/١٧زدا گەیشتەوە ئەستەمبووڵ "مەدالیای جەنگ"ی خەڵاتکرا و، لە لایەن خەلیفە و شێخولئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی و سەرکردەی گشتیی سوپا و قوتابییانی زانستە شەرعییەکانەوە پێشوازییەکی ناوازە و ڕەنگینی لێکرا. هەروەها کاربەدەستان داوایان لێکرد کە هەندێ کارمەندیی بەرز لە دەوڵەتدا بگرێتە ئەستۆی خۆی، بەڵام مامۆستا هیچیانی نەویست جگە لە ئەندامێتیی (دار الحکمه الإسلامیه) کە دەزگایەکی زانستیی ئەوتۆ بوو تەنها گەورە زانایانی تێدا دەکران بە ئەندام.

لە ماوەی ئەم ئەندامێتییەیدا زۆربەی نووسراوە عەرەبییەکانی خۆی چاپکرد، وەك: تەفسیرە بەنرخەکەی کە ناوی "إشارات الإعجاز في مظان الإیجاز"ە و لە گەرمەی جەنگدا دایانابوو (کە ئێستا لە بەشی خوێندنی دوکتۆرای وانەی "تەفسیر" لە زانکۆی ئەزهەر بە دەرس دەخوێنرێت). هەروەها بەو مووچەیەی کە لە لایەن ئەم دەزگایەوە وەریدەگرت نامیلکەکانی کۆمەڵە پەیامی "المثنوی العربی النوری"ی لە چاپ دا و بە خۆڕایی بەسەر موسڵماناندا دابەشی کردن!

ئینجا هەر کە شاری ئەستەمبوول لە بەرواری ۱۹۲۰/۳/۱۸زدا لە لایەن دوژمنانی ئیسلام بە تایبەت ئینگلیزەوە داگیر کرا، مامۆستا سەعیدی نورەسی هەستیکرد کە تیرێکی گەورە و جەرگبڕ ئاراستەی جیهانی ئیسلامی کراوە. لەبەر ئەوە، قۆڵی لێبڕانی لێ هەڵکرد و نامیلکەی "خطوات ستە"ی دانا کە زۆر بە توندی هێرشی تێدا کردبووە سەر داگیرکەران و، هۆکارەکانی نائومێدیی تێدا پووچەڵ کردبووەوە کە زۆر کەس لەو ڕۆژگارەدا دووچاری بووبوون. ئەم نامیلکەیەشی چەند جارێك بە نهێنی لەناو ئەستەمبوولی داگیرکراودا لە چاپ دا و بڵاوی کردەوە و، کاریگەری(تأثیر)یەکی گەلێ گرنگی لە دڵ و دەروونی خەڵکی - لەو بارودۆخەدا - بەجێهێشت.

ئینجا لەبەر ناوبانگە فراوان و جیهادە بەردەوامەکەی، دوو جار لە لایەن سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئازادیخوازەوە، بۆ شاری "ئەنقەرە" بانگێشت کرا. هەرچەند یەکسەر لەو کاتەدا بەدەم خواستەکەیانەوە نەڕۆشت، چونکە پێی وابوو نابێت لەو دەمانەدا سەنگەرەکانی پێشوو چۆڵ بکات، بەڵام دوایی لە ڕێی گەڕانەوەیدا بۆ "وان" سەری لێدان. ئەوەبوو لە ساڵی۱۹۲۲زدا ڕۆشت بۆ ئەوێ و لە لایەن گەورە پیاوانی دەوڵەتەوە لە ئیستگای شەمەندەفەر پێشوازیی لێکرا. بەڵام هێندەی نەخایاند لەم کاربەدەستانەی "ئەنقەرە"ش نائومێد بوو، چونکە سەرنجی دا زۆربەیان فەرز و ئەرکە ئایینییەکانیان جێبەجێ ناکەن.. لەبەر ئەوە، وتارێکی ئاراستەی ئەنجومەنی پەرلەمان(مجلسِ مبعوثان) کرد، کە بەم دەستەواژەیەی خوارەوە سەرەتای وتارەکەی داڕشتبوو: (یا أیها المبعوثون! "إنکم لمبعوثون لیوم عظیم"...)!

هەر لەوێدا جارێکی تر پرۆژەی دامەزراندنی زانکۆکەی شاری وانی پێشکەش کردن وخستیە پێش چاوی بەرپرسانی نوێ، ئەوانیش بەڵێنیان پێ دا کە بەدەم خواستەکەیەوە بڕۆن، بەڵام چەند بارودۆخێکی ڕامیاری ڕێی لە هێنانەدیی پرۆژەکە گرت.

لە ساڵی ۱۹۲۳زدا "بدیع الزمان" لە ئەنقەرەوە گەڕایەوە بۆ کوردستان و ڕۆشت بۆ شاری (وان) و لەسەر چیای "ئەرەك"ی نزیکی شاردا ماوەی دوو ساڵی بە خواپەرستی و بیرکردنەوە و گۆشەگیری و دەرس وتنەوە بە قوتابییانی بردەسەر، کەچی هێشتا هەر لە پریشکی کارەسات و ڕووداوەکان ڕزگاری نەبوو، چونکە لە گەرمەی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیراندا، ئەمیش (وەك زانا و کەسایەتییەکی گەورەی کورد) لەگەڵ کەسانێکی تری زۆر لە بەرواری ۱۹۲۵/۲/۲۵زدا، ڕەهەندە(نەفی)ی شاری "بوردوور" لە باشووری خۆرئاوای

توركیا کرا و، پاشان بە تەنها خۆی بۆ شارۆچکەیەکی دوور ڕەھەندە کرا کە ناوی "بارلا" یە و لە بەرواری ١٩٢٧/٣/١زدا گەیشتە ئەوێ.

دوژمنانی "ئیمان" پێیان وابوو کە لە "بارلا"دا مامۆستا نەورەسی لەناودەچێت و ناوی کوێر دەبێتەوە و لە بیری خەڵکی دەچێتەوە و ئەم کانییە پەخوڕەمەی زانست و ئیمان وشک دەکات..

بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە خاوەنی لوتف و سۆز و بەزەییە سەبارەت بە سەرجەم بەندە پاك و دڵسۆزەکانی، ئەوا نیازە چەپەڵەکەی ئەوانی پووچەڵ کردەوە و، ئەم بەندە زانا و پاکەی بە فەزڵ و بەخشایشی خۆی وەھا چاودێری کرد کە لەسەر دەستی ئەود "بارلا"ی کرد بە سەرچاوەی پەخشاندنی تیشکێکی گەورەی نووری قورئانی پیرۆز. چونکە مامۆستا نوورسی زۆربەی "پەیامەکانی نوور"ی لەوێ دانا و، ئینجا بە شێوەی دەستنووس لە سەرانسەری تورکیادا بڵاوبوونەوە! ئەوەبوو ھەر کە مامۆستا نەورەسی = بە درێژایی چارەکە سەدەیەك - لەم شارەوە بۆ ئەو شار ڕەھەندە دەکرا و لە زیندان و بەندیخانەکانی گەلێ پارێزگای تورکیادا دووچاری بەندی و گرتن دەبوو، خوای گەورە کەسانێکی دڵسۆزی بۆ نووسینەوە و لەبەرگرتنەوەی ئەم پەیامانە دەرەخساند و ئەم ڕێژنە بەپیت و بەرەکەتانەی ئیمانیان بڵاو دەکردەوە، تاکو گیانی نوستووی ئیمانیان لای ئیمانداران بێدارکردەوە و لەسەر چەندین ستوون و پایەی زانستی و مەنتیقی و، بە ڕەوانبێژییەکی بەرز، دامەزراند. بە چەشنێك کەسانی عەوام لێی تێدەگەن و مرۆڤانی تایبەتمەند و شارەزایش بەھرەمەندی تێشوو لێوەرگرتنی دەبن.

پاش ئەوەی ھەشت ساڵ و نیوی بە ڕەھەندەیی لە بارلادا بردە سەر، لە چەند جێگایەکی تری وەك شاری "ئیسپارتە" و "قەستەمۆنی" و شارۆچکەی "ئەمیرداغ"دا بە "ڕەھەندەیی" و "دەست بەسەری" و، لە شارەکانی: "ئەسکیشەھر و ئەفیوون و دەنیزلی"یشدا بە "بەندی" ژیانی بەسەر بردووە. کە ئەمانەش چارەکە سەدەیەك لە ژیانی پڕ لە ئاسۆر و ئەشکەنجە و جیھادی مەعنەویی

تەمەنی ئەم زانا پایەدارە دەگرنەوە.

بەم جۆرە، مامۆستا نەورەسی لە سەرەتای ڕۆشتنیەوە بۆ "بوردوور" (١٩٢٦) و پاشان بۆ "بارلا" (١٩٢٧) ھەتا ساڵی ١٩٥٠ز لە نووسینی "پەیامەکانی نوور"دا بەردەوام بوو، تاکو لە

(١٣٠) پەیام (کتێب و نامیلکە) تێپەڕیانکرد و، هەموویان لە ژێر ناونیشانی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور"دا کۆکرانەوە و،

بریتین لە چەند کۆمەڵە پەیامێکی سەرەکی کە ئەمانەن:

١- (سۆزلەر) واتە "وتەکان"..

٢- (مەکتووبات) واتە "نامەکان"..

٣- (لەمعەلەر) واتە "بریسکەکان"..

٤- (شوعاعلەر) واتە "تیشکەکان"

٥- (لاحیقەلەر) واتە "پاشبەندەکان"..

هەروەها کۆمەڵە پەیامەکانی تری جگە لەمانەش، کە هەر هەموویان تاساڵی ١٩٥٦ز ڕێی چاپخانەکانیان بە سەربەستی بۆ نەگیرایەبەر، بەڵام لەم بەروارەوە، بڕیاری ئازادیی لەچاپدانیان دەرکرا و، مامۆستا نوورسی خۆی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردن هەتا هەموویانی بە چاپ گەیاندن و، پێش ماڵئاوایی‌کردنی لەم ژیانی دنیایە و بە چاودێریی خۆی سەرجەمی پەیامەکانی لە چاپ دان.

گرنگترین تایبەتکاریی ئەم پەیامانە لەوەدایە کە: تەفسیرێکی خەست‌وخۆڵی ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزە و، بە "مەوسووعەیەکی ئیمانی"ی بایەخدار دادەنرێن و، بەدەم خواستە ئیمانییەکانی خەڵکی سەردەمەوە دەڕۆن و، ئیمانی تەحقیقی لە دڵ و دەروون و بیر و ژیریی مرۆڤی هاوچەرخدا دادەمەزرێنن و، بینای کوفر و ئیلحاد لە بنج و بێخدا هەڵدەتەکێنن و، قەڵای مەحکەمن بۆ ئیمانداران و، گرنگترین چەکی پێشکەوتووی "ئیمان"ن لەم سەردەمەدا، کە نوێترین چەکی فرت و فێڵی کوفر و ئیلحادی تێدا بەکار دەهێنرێت!

لە سەعات سێ و نیوی شەوی قەدری مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٣٧٩ک بەرامبەر ١٩٦٠/٣/٢٣ز بەدەم بانگی پەروەردگاریەوە ڕۆشت و کۆچی ماڵئاوایی لەم دنیا فانییە کرد. خوای گەورە نوقمی میهرەبانیی فراوانی خۆی بکات و بە بەهەشتی بەرین شادی بکات. ئامین.

چەند مانگێك دوای کۆچی دوایی، کاربەدەستان لە گۆڕەکەی دەریانهێنا و لە شوێنێکی نەزانراودا ناشتیانەوە!

له دوای وەفاتی خۆی، قوتابییە دڵسۆزەکانی بەرپەری چوست و چالاکی "پەیامەکانی نوور"یان بە خەڵکی گەیاند و، بە ئاستە زانستی و فیکرییەکانی ناوخۆ و جیهانیان ناساندن و گەورە بیریاران(مفكرين)ی ئیسلامی و جیهانییان پێ ئاشنا کردن.

تا ئێستا لە تورکیادا پێنج کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕ و سیمیناری ناوخۆیی لەسەر ژیان و بیری مامۆستا نەورەسی گیراوە. هەروەك لە چەندین شوێنی تری جیهاندا وەك (میسر و مەغریب و ئەردەن و مالیزیا و ئەندۆنیسیا و ئوستورالیا) کۆنگرەی جیهانی و کۆڕ و سیمیناری زانستیی لە ئاستە ئەکادیمییەکاندا لەسەر پێشکەش کراوە. جگە لەو دەیان لێکۆڵینەوە و باس و کتێبانەی کە بە زمانە جیا جیاکان بۆ ئەم مەبەستە نووسراون و، جگە لەو نامە زانکۆیی و ئەکادیمیانەش کە بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی باڵا (ماستەر و دکتۆرا) لە چەندەها زانکۆی ناوخۆ و جیهانیدا (هەر لە مالیزیاوە تا دەگاتە فەرەنسا) لەسەر ژیانی نەورەسی خۆی و لەسەر پەیامەکانی نووسراون و ئامادە کراون.

کەسانی دیار و بەناوبانگی گۆڕەپانی زانست و فیکری ئیسلامیی سەردەم چ لە ئاستی کوردستان و چ لە ئاستی عێراق و وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و چ لە ئاستی جیهاندا لە پێشەنگی توێژەر و نووسەر و لێکۆڵەرانی ژیان و نووسینەکانی مامۆستا " نەورەسی "ن. کە لێرەدا بۆ نموونە تەنها ناوی هەندێکیان پێش‌چاو دەخەین، وەك:

(د. محسـن عبد الحمید ، د. محمد سعید ڕەمەزان بۆتانی، د. علي محي‌الدين قەرەداغی. د. جلال جلالی زادە، عبد القادر بادللي، د. عماد الدين خليل، خوا لێخۆشبوو مامۆستا ئەبولحەسەن نەدوی و، دەیان زانا و پرۆفیسۆری تر لە زانکۆی ئەزهەر و زۆربەی زانکۆکانی جیهانی ئیسلامی و تەنانەت خۆرهەڵاتناسانی چەند زانکۆیەکی خۆرئاوایش) خوێنەری بەڕێز بۆ خۆی دەتوانێت لە سەرچاوەکان و لە ڕێی ئەو کتێب و باس و بابەتانەش کە لە بارەی بیر و زانست و ژیانی مامۆستا نەورەسی یەوە پێشکەش کراون، بە نووسینەکانی ئەو زانا و بیریارانە و کەسانی تریش ئاشنا ببێت.

کاری وەرگێڕانی "پەیامەکانی نوور" بۆ زمانەکانی تری جیهان هەر بەردەوامە. ئەوەتا – سوپاس بۆ خوا – وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکان بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (إحسان قاسم الصالحي)یەوە تەواو بووە و، لە نۆ دانە بەرگی قەشەنگ و ڕەنگیندا و لە هەردوو شاری ئەستەمبووڵ و قاهیرە بڵاو کرانەوە. بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی

نۆموسڵمان: ماری وێڵد(شکران واحده)ەوە کراون بە ئینگلیزی و تا ئێستا چوار بەرگی گەورەیان بە چاپی جوان و ڕەنگین بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.

سوپاسی بێکۆتایی بۆ خواوەندی میهرەبان کە یارمەتی و تەوفیقی نووسەری ئەم چەند دێڕەشی دا کە زیاتر لە سەد دانەمان لەو پەیامانە کرد بە کوردی و، تا ئێستا و لە ماوەی پازدە ساڵدا (چل و دوو) نامیلکە و پەیاممان لەو وەرگێڕاوە کوردییانە و لە دووتوێی (بیست و چوار) کتێبدا بڵاو کردەوە و، دەیان پەیامی تریش ئامادەی چاپن. وا ئێستاش لە نیازدایە کە بە پشتیوانیی خوای گەورە سەرجەمی ئەم وەرگێڕاوە کوردییانە، وەکو تورکی و عەرەبی و ئینگلیزییەکان، لە شێوەی بەرگی گەورە و نایابدا بڵاوبکرێتەوە. بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕاون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە: ئەڵمانی، فەرەنسی، ڕووسی، ئۆردی، فارسی، ئیتالی، کۆجاراتی، مەلایا، ڕۆمانی، بۆسنی... هەروەها گەلێ زمانی تریش.

لە چەند زانکۆیەکی جیهاندا زانست و بیری " نەورەسی " لە ناوەندی مەنهەجە ڕەسمییەکان و سەرچاوە زانستییەکاندا دانراون، وەك زانکۆی ئەزهەری میسر و، زانکۆی محمد الخامس لە مەغریب و، زانکۆی ئیسلامیی جیهانی لە مالیزیا.

هیوادارم گەلی کوردمان – بە تایبەت توێژی زانا و ڕۆشنبیران و خوێنەرانمان – پتر ئاوڕ لەم کەسایەتییە گەورەیەی نەتەوەکەی خۆیان بدەنەوە و زیاتر بە ژیان و نووسینەکانی ئاشنا بین و، لەم ڕووەوە ئێمەش لە گەلانی تر دوانەکەوین. زۆر بە دڵنیاییەوە دەڵێم: گەورە پیاوانی نەتەوەکانی تر هێندەی بەشێکی کەمی زانایی و گەورەیی مامۆستا نەورەسی زیرەکی و بلیمەتی و زانست و ئازایەتی و ئیمانداری و دڵسۆزییان نەنواندووە، کەچی نەتەوەکانیان لە شان و باڵی ئەوانیان بەرز کردووەتەوە و بە جیهانیان ناساندوون و لە ئاستی جیهاندا شانازییان پێوە دەکەن، بەڵام ئێمە هێشتا ئاوڕی پێویستمان لەم گەنجینە زێڕ و گەوهەرانەی خۆمان نەداوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر هیوادارم کە ڕۆژگارانی ئایندە بە زیادبوونی سەربەستیی فیکری و بەرز بوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی لای هەموو توێژ و چینەکانی گەلەکەمان، پتر نرخ و بەهای بەخششە فیکری و زانستی و ئیمانییەکانی ئەم کەڵە زانایەی نەتەوەکەمان دەردەکەوێت و، سوودی زیاتری لێ وەردەگیرێت.

لە خوای گەورە داواکارم کە بە سۆز و میهرەبانیی خۆی لە بڵاوکردنەوەی سەرجەمی پەیامەکانی نووردا بە زمانی کوردی پشتیوانمان بێت و ئەم کارەمان بۆ ئاسان بکات و،

**نیازی خاوێن و گیرابوونی لای خۆیمان پێ ببەخشێت و، لە خۆم و دایک و باوکم و خێزان و منالّ و یارمەتی‌دەرانم لەم خزمەتە پیرۆزەدا و لە سەرجەم موسلّمانان خۆش ببێت. إنّه علی ما یشاء قدیر وبالإجابة جدیر. زۆر سوپاس بۆ بەرێز مامۆستای بەرز و خۆشەویستی کورد فاروق رەسول یحیی کە خزمەتێکی گەورەی بە گەلی کورد و کورد زمانەکان گەیاند ، وە مامۆستای نەورەسی بە گەلی کورد و زمانی کورد شاد کرد ئەم ژیانامەش لە لایەن بەرێزیانەوە ئامادە کرابوو ...**

## چەند ئافرەتێکی ناوداری جاف

### عادیلە خان

### زیبا خان

### حەبێ خان

ئافرەتانی کورد هەر لە مێژەوە خاوەنی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بەرز و، مایەی ڕێز و حورمەتی کۆمەڵگای کوردەواری بوون. ئەم ڕاستییەش سەرنج و بایەخی گەلێك مێژوونووس و ڕۆژهەڵاتناس و گەڕیدی بیانیی ڕاکێشاوە و، لە نووسینەکانیاندا ڕەنگیان داوەتەوە.مێژوونووس و لێکۆڵەرەوە مینۆرسکی لەم میانەدا کوردی بە پێشکەوتووتر و شارستانی تر لە میللەتە موسڵمانەکانی تر داناوە .

هەروەها مستەر ریچ – یش ئاماژەی کردووە بە پلەوپایە و سەربەستیی دیاری ئافرەتانی کورد بە بەراوردکردن لەگەڵ ئافرەتانی عەرەب و تورك و فارسدا، هەمدیسان ستایشی لە داوێنپاکی و ڕەوشتبەرزیی ئافرەتانی کورد کردووە . بەهەمانشێوە ئافرەتانی کورد مایەی ڕێز و ستایش و ئاماژەی گەلێك گەڕید و ڕۆژهەڵاتناسی تر بوون .

سەبارەت بە ئافرەتانی جافیش کە ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانی کورد پێکدێنن ، مایەی ڕادەیەکی بەرچاو لەو بایخە فراوانە بوون، کە بە ئافرەتانی کورد دراوە. لە ڕاستییشدا ئافرەتانی جاف ڕۆڵێکی کاریگەر و گرنگیان لە ژیانی کۆچەریی عێلەکەیاندا بینیووە، کاتێك ساڵانە هاتووچۆی نێوان گەرمیان و کوێستانیان کردووە .

ئافرەتانی جاف جگە لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵ و ئەنجامدانی کاروباری ناو ماڵ، بەزۆر ئیش و چالاکیی قورس هەڵساون وەك: بارکردن و بارلێکردنەوەی وڵاخان و ئاوهێنان لە جێگای دوورەوە و کۆکردنەوە و گواستنەوەی دار لە شاخ و دۆشینی مەڕ و ماڵات لە ماڵەوە یان لە لەوەڕگادا و چنینی هۆڕ و قاڵی و کڵێم و مەوج... هتد .

ئەمە جگە لەوەی ئافرەتانی جاف خاوەنی بیروڕا و قسەی بیستراوی خۆیان بوون لەنێو کۆڕ و کۆمەڵی عێلدا و، لە دانیشتنی پیاواندا ئامادە دەبوون و تاوتوێی ئەو مەسەلە گرنگانەیان دەکرد کە پێوەندییان بە ژیانی عێلەوە هەبوو .

لەلایەکی ترەوە زۆر لە ئافرەتانی جاف لە بواری سوارچاکی و تفەنگچێتیدا هەڵکەوتوو بوون و بگرە هەندێکیشیان لەو بوارەدا پێش پیاوان کەوتوون. هەمدیسان لە بواری شیعر و ئەدەبیشدا، چەند ئافرەتێکی جاف لە مێژەوە، ناوبانگیان لەو بوارەدا دەرکردووە.

وەلێ بەداخەوە بەدرێژایی مێژوو بەرهەمەکانیان فەوتاون، مەگەر چەند نموونەیەکیان نەبێت کە دەماودەم دەگوترێنەوە (یان لێرە و لەوێ زۆر بەکەمی تۆمار کراون) . لەوانە . لزّ خانم جاف لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا ، نەرگس خانم شارەزووری لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا .

لەنێو ڕۆژهەلاّتناس و گەڕیدەکاندا، مێجەرسۆن (خاوەنی گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ عێراق و کوردستان ساڵی ١٩٠٩) یەکێکە لەوانەی زۆر سەرسامی خەسڵەت و ڕەفتاری ئافرەتانی کورد بەگشتی و ئافرەتانی جاف بەتایبەتی، بووە. ناوبراو زۆر بە بایەخ و ستایشەوە باس لە ڕێز و دلۆڤانی و کراوەیی و سەربەستی و چالاکیی ئافرەتانی جاف کردووە .

دەتوانین بڵێین نایابترین و بەپێزترین بەشی کێبەکەی (گەشتنامە بەناوبانگەکەی)ئەو بەشەیە کەتێیدا باسی عادیلە خانی ژنی وەسمان پاشای جاف و توانا و دەسەلاّتە کارگێڕی و کۆمەلاّیەتی و بازرگانییەکانی و، دەسکەوتە شارستانی و بیناسازییەکانی لە هەڵەبجەدا دەکات .

جالێرەدا کۆتایی بەم دەسپێکە کورتەمان دێنین و دەچینە نێو کرۆکی باسەکەمانەوە و بەپێی توانا و دەرفەت لەمەڕ چەن ئافرەتی ناوداری جافەوە دەدوێین:

## عـــادیلـــە خـــان

**( ١٨٥٩ – ١٩٢٤ ز )**

عادیلە خان کچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقەران و خێزانی وەسمان پاشای جاف ناسراو بە نازناوی (خانم) یەکێکە لە ئافرەتە هەرە ناودارەکانی مێژووی کوردستان و ناوچەکە کە لە مێژوودا بەلێوەشاوەیی وسام و توانا ناوبانگی دەرکردووە.

کاتی خۆیشی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، کە وەسمان پاشا ئەم ئافرەتە هەڵکەوتووەی بەهاوسەری خۆی هەڵبژاردووە، مەبەستی سەرەکیی ئەوە بووە، لە خانەوادەی ڕەسەن و بەشکۆی (خانم) کە سەر بە وەزیرەکانی میرنشینی ئەردەلاّنی جاران بووە، نزیك بێتەوە و ئاشنایەتییان بکات.

هەر کە خانم لە هەڵەبجەدا نیشتەجێ دەبێت یەکسەر دەست دەکات بە پتەوکردن و جێگیرکردنی هێز و دەسەلاّتی خۆی، ئەویش بە پشتبەستن بەتوانای خۆی و شۆرت و ناوبانگی خانەوادەکەی، هەروەها بەسوودوەرگرتن لەو ئازادییەی کە وەسمان پاشا بۆی فەراهەم کردبوو .

ئەمە وێڕای ئەوەی وەسمان پاشا ، میری جاف و قایمقامی هەڵەبجە، بەهۆی کاروبارە فەرمییەکانییەوە لە مووسڵ و کەرکووک و سلێمانیدا، زۆر جار لە هەڵەبجە دوور دەکەوتەوە.

ئیدی بەو هۆیانەوە، خانم بووبە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی هەڵەبجە و ئەو شوێنانەی سەر بە ئەوێ بوون (هەورامان و پێنجوێن و شارەزوور...) و لەسەر ڕێبازی وەسمان پاشای مێردی گەلێك دەسکەوت و پێشکەوتنی شارستانی و ئابووریی لەوێ وەدیهێنا. ئەوەبوو دوو خانووی قەشەنگ و نایابی لەسەر شێوەی (سنە) دروستکرد کە لە سەرتاپای سلێمانیدا بێ هاوتا بوون .

هەروەها ڕێگای بازرگانیی لەگەڵ سنە (پایتەختی ئەردەڵانی جاران) و شارەکانی دراوسێدا بە والآیی هێشتەوە و، بازاڕێکی ڕازاوەی بنیاتنا کە لە چوار ڕیز دوکانی گومەزیدار پێکهاتبوو، بۆیە بازرگانی لە شاردا گەشەی کرد و پەرەی سەند. هەمدیسان خانم بەندیخانەیەکی نوێ و دادگایەکی لە شاردا دامەزراند و خۆی بوو بە دادوەری دادگاکە. ئەمە وێڕای چاندنی چەند باغچە و دارگەلێکی زل و خۆشسێبەر لە هەڵەبجە و دەورووبەریدا .

جگە لەمانە، شاری هەڵەبجە لەسایەی خانم و وەسمان پاشای مێردیدا و تاهیربەگ و ئەحمەد موختار بەگی کوڕانیاندا، گەلێك بینا و دامەزراوی گرنگی دیکەی بەخۆوە بینی وەك، قوتابخانە و مزگەوت و گەرماو... هتد .

بەو شێوە هەڵەبجە لە گوندێکی پشتگوێخراوەوە بووبە شارێکی گەشاوە و پێشکەوتوو، ئەمەش بووبە مایەی حەسوودی کاربەدەستە عوسمانییەکان کە ویستیان لە ڕێگەی دامەزراندنی هێڵی پێوەندیی (تەلەگراف)ەوە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر شاردا بسەپێنن. بەڵام دانیشتوانی هەڵەبجە هەر زوو ئەو هێڵەیان بڕی ،

بەوەش ناڕەزایی خۆیان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بەسەر شارەکەیاندا دەربڕی. خانم – یش لەلایەن خۆیەوە ئامۆژگاریی کاربەدەستانی عوسمانیی کرد کە نەکەن هێڵەکە چاك بکەنەوە، چونکە خەڵکی ناوچەکەی خێرا دەیبڕنەوە!

بەگشتی خانم خاوەنی خەسڵەتگەلێکی بەرز و دەسەڵات و شکۆ و سامی تایبەتی خۆی بوو. ئەمە وێڕای ئەوەی خولیا و زەوقێکی ئەدەبی و هونەری و بیناسازیی بەرز و توانایەکی بازرگانی و ئابووریی سەیری شك دەبرد .

ئەمانەش بەگشتی وایانکرد، خانم مایەی بایەخ و سەرسامیی خەڵکانێکی زۆری ئەو سەردەمەبێت بەگشت چین و توێژ و پلە و پایە فەرمی و کۆمەڵایەتی و

ڕۆشنبیرییەکانیانەوە، نەخاسمە توێژەر و ڕۆژهەڵاتناسەکان کە مەتحی کەسایەتی و بەهرەمەندی و لێهاتوویی و سەخاوەت و دەسەڵاتی ئەم زاتەیان کردووە.

محەمەد ئەمین زەکی بەگ ئاماژەی بە هەڵکەوتوویی و هۆشیاری خانم و کاریگەریی لەسەر مێردەکەی و عێلەکەی و تێکڕا ناوچەکەدا کردووە، هەروەها بەبایەخەوە ئاماژەی بەتوانای خانم لە بواری شارستانی و بیناسازی و کاروباری فەرمی و کۆمەڵایەتی و خێڵەکیدا داوە.

ئەدمۆندزیش باسی لەوە کردووە کە گشت دەسەڵاتی وەسمان پاشا، لە پاش مردنی. کەوتووەتە دەستی خانمی ژنی کە لە ڕاستیدا شاژنی (تاج پێ نەدراوی) شارەزوور بووە. ئینگلیزەکانیش لەلایەن خۆیانەوە نازناوی بەرزی هیندیی ( خان بە هادوور )یان پێ بەخشیووە.

مینۆرسکییش ئاماژەی بە دیدەنیی خانم لە هەڵەبجەدا (ساڵی ١٩١٤) کردووە و بە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی هەڵەبجەی، لە پێش و پاش مردنی مێردەکەی، داناوە، هەروەها ستایشی لە سەخاوەت و میوانداریی کردووە.

مێجەرسۆنیش کە بە شێوەی بازرگانێکی فارسی و بەناوی (غولام حوسێن شیرازی)ەوە ساڵی ١٩٠٩ سەردانی هەڵەبجەی کردووە و، پتر لە شەش مانگ لە ماڵی وەسمان پاشادا. نزیك لە عادیلە خان و تاهیر بەگی کوڕیدا، ماوەتەوە، بیرەوەری و باسێکی قەشەنگی لەو بارەیەوە لە کتێبە ناودارەکەیدا (گەشتنامەکەی) تۆمار کردووە.

خانم ساڵی ١٩٢٤ لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا بە سام و شکۆوە کۆچی دوایی کرد و لە گوندی (عەبابەیلێ)دا لەنزیك گۆڕی تاهیر بەگی کوڕیدا نێژرا، هەروەها ئەحمەد موختار بەگی کوڕیشی لە پاش شەهید بوونی نزیك بەوان بەخاك سپێردرا .

## زێبا خـــان

خاتوو زێبا خان کچی کەریم بەگی فەتاح بەگی محەمەد پاشای جاف یەکێکە لە ئافرەتە ناودار و هەرە بەڕێزەکانی عێلی جاف و تێکڕا گەلی کوردمان کە بە ڕەوشت و خەسڵەت و هەڵوێست و بەخششە بەرزەکانی خۆی توانیوویەتی شوێنێکی شایستە لە یاد و بیرەوەریی خەڵکی گەرمیان و ئەوانەی لە نزیکەوە ناسیوویانە، بۆ خۆی بکاتەوە و بە زیندوویی بمێنێتەوە.

زێبا خانی دلۆڤان و ڕەسەن زادە و لێهاتوو ساڵی ١٩٢٣ لە کەلاردا هاتۆتە دونیاوە و، لە سایەی خانەوادە شکۆدارەکەیدا، نەخاسمە کەریم بەگی باوکی پەروەردە بووە و هەڵکەوتووە.

لە ڕاستیدا زێبا خان گەلێک خەسڵەت و ڕەفتاری بەرز لە باوکییەوە فێربووە و لەسەریان ڕاهاتووە وەک: دلێری، جوامێری، بەخشندەیی، میهرەبانی، دڵپاکی، خۆشمەعشەری و زمانشیرینی و...هتد، بەو هۆیەشەوە هەمیشە مایەی ستایش و خۆشەویستی و ڕێز و حورمەت و پێزانینی خەڵک بووە.

هەروەها بوونی زێبا خان بە هاوسەر و هاوڕێبازی نووسەر و تێکۆشەری ناسراو، حەمە سەعید بەگی ئامۆزای، هەلێکی زیاتری بۆ ڕەخساند کە وەک شۆڕەژنێکی تێکۆشەر و بە هەڵوێست و خێرۆمەند زیاتر دەرکەوێت و بناسرێت و، لە پێناوی بەختەوەری و کامەرانی وسووککردنی مەینەت و ئازاری نەداران و هەژارانی عێل و گەل و نەتەوەکەیدا، کۆشش بکات و قوربانی بە ئاسوودەیی و ژیانی خۆی بدات .

بەڵێ، زێبا خان باشترین هاوسەر و هاوەڵی حەمە سەعید بەگ بوو لە ژیانی پڕ لە خەبات و تێکۆشانیدا و، پێکەوە هەندێک شیرینی و زۆر لە تاڵیی ژیانیان چەشت و، چاکترین نموونەی خزمەتکردن و قوربانیدان و هەڵوێستبەرزییان بۆ گەل و نیشتمانەکەیان بەرجەستەکرد و لەو پێناوەدا گەلێک مەینەتی و ئازار و دەردەسەریی ژیانیان چەشت .

بەڵام ئەوان تا دواهەناسە دەستبەرداری ئەو خەسڵەت و هەڵوێستە پیرۆزانەی خۆیان نەبوون و بەشانازییەوە لەسەری بەردەوام بوون . هەمدیسان زێبا خان گەلێک دەستپێشخەری و هەوڵ و خزمەتی مرۆڤانە و خێرۆمەندانەی پێشکەش بە ئافرەتانی سەردەمی خۆی کرد و، بەگشت توانایەکییەوە دەکۆشا بۆ ئەوەی کۆسپ و تەگەرە و ئاستەنگە خێزانی و کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی ئەو ئافرەتانە نەهێڵێت و سووک کات و، چارەسەری بۆ کێشەکانیان دابنێت .

بۆیە کۆڕ و دانیشتەکانی ئەم خاتووە میهرەبانە لەماڵەکەی خۆیدا، هەمیشە ئاوەدان بوون بەو ئافرەتانەی دەهاتنە لای و، ئەمیش لەلایەن خۆیەوە بە دڵ و سنگێکی کراوەوە پێشوازیی لێدەکردن و بە هەموو توانایەکییەوە هاوکاریی دەکردن و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیانی دەدا و ئاسوودەیی پێدەبەخشین .

پاشانیش کە بۆ ئێران گواستیانەوە، ساڵانی غەریبی و دوورەوڵاتی و پڕ لە مەینەت و ناخۆشی هەرگیز نەیانتوانی لە بڕوای بەرز و ورەی پۆڵایین و ئیمانی چەسپاوی ئەم ئافرەتە مەزنە کەم بکەنەوە، ئەوەبوو تا دواڕۆژی تەمەنی لە ئێراندا بە هەمان گوڕ وتین و هیواوە لە پێناو ئاوات و خواست و پرنسیپە باڵا و پیرۆزەکانیدا دەکۆشا، ئەو پرنسیپ و بەها باڵایانەی کە لە پێناویاندا هەمیشە قوربانیی بە هێز و توانا و ماڵ و سامان و تەندروستیی خۆی دەدا.

ئابەو شێوە زێبا خان ، بێوچان، خزمەتی میوان و هەژار و نەدار و ڕێبوار و لێقەوماو و نەخۆش و غەریبانی لە ماڵەکەی خۆیدا دەکرد و، لە پێناویاندا شەوی دەدایە دەمی ڕۆژ و شەونخوونی و زەحمەتی دەکێشا تا لە ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٦دا دڵە گەورە و میهرەبانەکەی لە دوورەوڵاتدا لە لێدان کەوت و کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی لە گۆڕستانی (بهشت زهراء)دا هەر لەوێ لە تاراندا نێژرا.

## حەبێ خــــان

حەبێ خان، کچی کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف یەکێکە لە ئافرەتە بلیمەت و ناودارەکانی مێژووی هاوچەرخمان . ئەم خاتوونە سالار و هەڵکەوتووە ساڵی ١٩٢٧ لە کەلاری کۆندا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە،

لە سایەی باوکیدا، کەریم بەگ ، سەرۆکی عێلی جاف ، و لە ئامێزی خانەوادە ناسراوەکەیاندا پێگەیەنراوە و، لەسەر خۆشەویستیی کورد و کوردستان و دابونەریتی خێڵەکی و کۆمەڵایەتیی ڕەسەنی نێو کوردەواری گۆش و پەروەردە کراوە.

حەبێ خان هەر بە منداڵی لەسەر خواستی باوکی، بۆ ئەو قوتابخانە سەرەتاییە کە تازە لە کەلاری کۆندا دامەزرا بوو، نێردراوە و لەوێ وەکو یەکەمین کچە قوتابی لە مێژووی ناوچەکەیدا شانبەشانی کوڕانی هاوتەمەنی خۆی خوێندوویەتی. ئەوجا حەبێ خان لە ژێر چاودێری و ڕێنمایی باوکی و کەسوکاریدا، دەچێتە مەیدانی سوارچاکی، جریدبازی و تیرهاوێژی و تێیدا پەیتا پەیتا وەك شۆڕە سوارێکی تفەنگچیی شۆخ و شەنگ و کارامە ناوبانگ دەردەکات و دەناسرێت .

حەبێ خان بە وێنەی کەریم بەگی بابی، هەر لە سەرەتای ژیانییەوە نموونەی بەخشندەیی و کوردپەروەریی پێوە دیار بوو، ئەوەبوو لە تاق لاوێتییدا، لە سەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوودا، هەرچی خشڵ و زێڕێکی هەبووە لە پێناوی ڕێبازی پارتی هیوادا بەخشیویەتی .

چونکە ئەو دەمە (هیوا) لە سنووری گەرمیاندا گەشەی سەندبوو، زۆر لە کەسایەتی و پیاوماقوڵانی ئەو دەڤەرە- بە کەریم بەگ و خزمانیشیەوە- لە خۆ گرتبوو. پاشانیش، حەبێ خان وەك زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەکەی دەچێتە ڕیزی خەباتی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە و لە پێناوی پتەوکردن و گەشەپێدانی ڕێکخستنەکانی ئەم پارتە تێکۆشەرەدا ڕۆڵێکی کوردانە و مەردانەی بەرچاو لە سنووری گەرمیاندا دەبینێت و، لەو پێناوەدا چەندین جار هاتووچۆی نێوان کەلار و کفری و خانەقین و بەغدا دەکات ، لە بواری ڕێکخستنەکانی ئافرەتاندا بە تایبەتی شوێنەدەستی دیار دەبێت . هەر لەو میانەدا حەبێ خان لێهاتووانە شانبەشانی هەڤاڵانیدا، لە چوارچێوەی بارەگای (ڕێکخراوی خەبات) لە کەلاردا (کۆتایی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو) کۆمەڵێك ئەرك و چالاکیی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری.. ئەنجام دەدەن.

ساڵی ١٩٦٣ پاش ئەوەی مەحموود بەگی مێردی دەچێتە ڕیزی شۆڕشەوە لە سنووری قەرەداغ، حەبێ خان لەبەر باری ناهەمواری کەلار ناچار دەبێت بگوازێتەوە بۆ گوندی بانسندوق (خوارووی کەلار)، وەلێ زۆری پێناچێت لەسەر دووزمانی و ڕاپۆرتی کوێخای گوندەکە، حەبێ خان بەتۆمەتی ئەنجامدانی چالاکی سیاسیی نهێنی لە پێناو پارتیدا، ڕاپێچی بنکەی پۆلیسی ناحیەی (قەرە تەپە) دەکرێت و ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوە و سەر ئێشەیەکی زۆر دەبێت .

سەرئەنجام بەڕێوەبەری ناحیەکە، چونکە پیاوچاکێکی سەر بە هۆزی (عەزەی) عەرەبی دەبێت و ڕێزی زۆر لە بەگزادەکانی جاف دەگرێت، هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕ و حەبێ خان لەو کێشەیە دەرباز دەکات.

ئیدی حەبێ خان دەگەڕێتەوە بۆ کەلار و سەر لە نوێ لەوێندەر نیشتەجێ دەبێتەوە و تا دواساتەکانی تەمەنی هەمان ڕێبازی کوردانە و مرۆڤانەی نەگۆڕی خۆی پەیڕەو دەکات و، بەهۆی خەسڵەتە بەرزەکانییەوە وەك: ڕاستگۆیی، بەخشندەیی، خواپەرستی، هەژار دۆستی، میهرەبانی، خۆشمەعشەری، هەقبێژی، بوێری....

هەمیشە مایەی ڕێز و حورمەتی خەڵك دەبێت. نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە حەبیٚ خان وەك زۆر لە نەوەکانی بنەماڵەکەی ئەدەبدۆست و شیعربێژ بووە، لە کات و بۆنەی جیاجیادا کۆمەڵێك هەڵبەستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی و لاواندنەوەی بەپێز و هەستبزوێنی هۆنیوەتەوە و ڕاستەوخۆ لەبەر پێشکەشی خزم و دۆست و بیسەرانی کردووە.

وەلیٚ، (مخابن) زۆربەی ئەو شیعرانە بزربوون و بە دەستمان نەگەیشتوون. ئەوانەشیان کە ماون هێشتا تۆمارنەکراون بەڵکو دەماودەم دەگوترێنەوە. ئەمە لە کاتێکدا شیعرەکانی مینە جاف برای بەهۆی تۆمارکردنیانەوە، گەیشتنە دەستی مامۆستا مستەفا نەریمان و ساڵی (١٩٩٠) لە دیوانێکی قەشەنگدا بە چاپی گەیاندن و کەوتنە بەر دەستی خوێنەران.

ڕۆژی ١٩٩٧/٧/١١ حەبیٚ خان، شاژنی گەرمیان، پاش تەمەنێکی دەوڵەمەند و پڕ لە خزمەت و هەڵوێستی بەرز ماڵئاوایی یەکجارەکیی لیٚ کردین.

## شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری

**( ١٨٣٠ – ١٨٨٣ ز )**

(لەدایکبوون:١٨٣٠ لە شەمزینان – مردن: تشرینی یەکەمی ١٨٨٣ لە حیجاز) شۆڕشگێڕێکی کورد بوو کە لە ساڵی ١٨٨٠دا لە ناوچەکانی شەمزینان و هەکاری و مەهابادا شۆڕشێکی ڕێخست کە بە دەستی سوپای عوسمانی و قاجارەکان سەرکوتکرا.

### ژیان

شێخ عوبەیدوڵڵا کوڕی سەید تەهای نەهری کوڕی شێخ ئەحمەد شیهابەددینە و لە گوندی نەهری لە ناوچەی شەمزینان لە ساڵی ١٨٣٠ لەدایکبووە.سەید تەهای نەهری توانی شێخنشینییەك لە نەهری دابمەزرێنێت، پاش مردنی ئەو، شێخ عوبەیدوڵڵا جێگەی باوکی گرتەوە و بووە ڕێبەری تەریقەتی نەقشبەندی و سەروەت و سامانێکی زۆری بە میرات بۆ ماوەتەوە.

### شۆڕش

لە شەڕی ١٨٧٧–١٨٧٨ لە نێوان ڕووسیا و عوسمانیدا یارمەتی سوپای عوسمانی داوە و چوونکو چاوەڕوانی ئەوەی کردووە کە سود لە ئەنجامەکانی شەڕ وەربگرێت و هەوڵ بدات لەو شەڕەدا ببێ بە سەرکردەی ئەو کوردانەی کە بە ناوی «غەزا»وە کۆبوونەتەوە، هەتا بتوانێت لە کاتی پێویستدا ئەو هێزە بۆ بەرژەوەندیی کورد بەکار بهێنێت. بەشداریکردنی شێخ عوبەیدوڵڵا لەو شەڕەدا هۆشیاریی سیاسیی قوڵتر کرد و لە ڕاستی و سروشتی دینی دەوڵەت و ڕواڵەتەکەی و مەبەست و مەغزا جیهادییەکەی عوسمانییەکان گەیشتووە، زۆرتر لەگەڵ کوردانی تردا ئاشنایەتی پەیدا کرد و هەر لەو شەڕەدا هەندێ چەکیشی دەست کەوت.

لەو ساتەدا خەڵك لەژێر باری نەبوونی و ناهەمواریی ژیاندا بوون، بۆیە پەنایان بۆ شێخ عوبەیدوڵڵا برد، چونکە وەك ڕابەرێکی ئاینی و ڕزگارکار تەماشایان کردووە، ئەویش لەسەر داوای خەڵك نوێنەری خۆی نارد بۆ ئەستەمبوڵ، تا سنورێك بۆ ئەو ناڕەواییانە دابنێنن، بەڵام ئەم هەوڵانە بێ ئاکام بوون.

جگە لەوەش شێخ گومان و ترسی هەبوو لە پەیمانی بەرلین، کە دەرەئەنجامی شکستی عوسمانییەکان بوو لە شەڕی ١٨٧٧–١٨٧٨ لەگەڵ ڕووسدا، بەپێی مادەی ٦ی ئەو پەیمانە هەموو دەوڵەتانی ئەورووپی بەیەکەوە داوای پاراستنی مافی کۆمەڵی ئەرمەنییان کردبوو.

شێخ بەسەرسوڕمانەوە لە کاربەدەستێکی تورکی پرسیبوو: «چیم گوێ لێ دەبێ ئەرمەنییەکان وڵاتێکی سەربەخۆ لە وان دروست دەکەن و نەستورییەکان ئاڵای بەریتانیا لەسەر ماڵەکانیان هەڵدەکەن)) .

بۆیە شێخ عوبەیدوڵڵا کەوتە یەکخستنی خێڵەکان بۆ ئەنجامگەیاندنی ئامانجەکانی و نوێنەری نارد بۆ لای شەریفی مەککە و خدیوّی میسر، هەروەها بۆ لای کونسوڵەکانی ڕووس لە وان و ئەرزڕووم تا بزانێت دەوڵەتی ڕووس هەستی بەرامبەر بە کورد چییە. هەوڵیشی دا خۆی لە ئینگلیزەکان نزیك بکاتەوە و نامەیەکی ناردووە بۆ دکتۆر کوهران.

شێخ پێی وابوو تاقە دەرمانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد دامەزراندنی کوردستانێکی گەورەیە، ئەویش بە یەکخستنی کوردەکانی ئێران و کوردەکانی سنووری عوسمانییە و، لە یەکەمین بەیاننامەی نووسراوی شێخدا و بە یەکێك لە نوێنەرانی هێزە ڕۆژئاواییەکان دەڵێت: ((میران و سەرانی کوردستانیی چ لە تورکیا لە کوردستان چ لە ئێران، هەر هەموویان رایان وایە ناکرێ بەم جۆرە لەگەڵ دوو حکومەتدا هەڵبکرێ، دەبێ کارێك بکرێت کە دەوڵەتانی ئەورووپا لە دۆزەکە ئاگادار بن و لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن کە خەڵکی کورد نەتەوەیەکی جیایە، ئێمە دەخوازین کاروباری خۆمان لە دەستی خۆماندا بێت)) .

پاشان شێخ نوێنەری ناردە لای پیاوە چالاکەکان و زانایانی کوردستان لە شارەکانی ڕەواندوز و موسڵ و هەولێر و وان و دیاربەکر و بەدلیس و ورمێ و سنە و سابلاخ و سەرۆك هۆزە گەورەکانی کوردی بانگ کرد و لە ساڵی ١٨٨٠دا دوو کۆنفرانسی بۆ سەرانی خێڵە کوردەکان گرێ دا و کۆمەڵەیەکی کوردی دروست کرد، کە ناوی «ئەنجومەنی کورد» بوو و پێکهاتبوو لە نەتەوەپەروەرانی کوردی، ڕەنگە ئەمە سەرەتای پێکەوەژیانی ڕێکخستن و کۆمەڵەی سیاسی بێ لە نێو کورددا. نزیکەی ٢٢٠ سەرۆك هۆز و پیاوی ئایینی لە شەمزینان کۆبوونەوە، هەتاوەکو نەخشە بۆ دەستپێکردنی بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی دابنێن. ئینگلیزەکان پێیان ناخۆش بوو شێخ ئەو هەنگاوانەی ناوە، بەتایبەت کەوتنە مەترسی لە دروستکردنی ئەنجومەنی کورد.

دواجار شێخ لە بەردەم ئامادەبوواندا وتارێکی گرنگی خوێندەوە، کە ڕۆڵێکی گەورەی لە یەکسختنی ڕیزەکاندا هەبوو، لەو وتارەدا دەڵێت دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێی ئیسلام لایداوە و زوڵممان لێدەکات و ئەمڕۆ فارسەکان بە شەڕی تورکمانەکانەوە خەریکن و هەموو

هێزەکانیان بۆ شەڕ ناردووە، کەواتە هەڵگیرساندنی جووڵانەوەیەک دژی دەوڵەتی ئێران گونجاوە .

لەبەر ئەوەی بەشێکی بەپیت و دەوڵەمەندی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی ئێراندایە، ئێمە لە سەرەتادا دژی دوژمنی بێهێز جوڵانەوە بەرپا دەکەین و لە ئەنجامدا دەتوانین براکانمان و وڵاتە هەرە بەپیت و دەوڵەمەندەکەیان رزگار بکەین، ئەمەش کارێکی وا دەکات سەرچاوەیەکی گرنگمان چنگ بکەوێت، دەتوانین بەم سەرچاوە شەڕ لەگەڵ تورکە عوسمانییەکان بکەین.

کێشەی دیکە مەسەلەی ئەرمەنییەکان بوو. رۆژنامەی پۆلتیشن کۆرسپۆندیت لە ژمارە ٨ی ساڵی ١٨٨١ دەڵێت: «شێخ هەوڵی داوە لەگەڵ سەرۆکی ئەرمەنییەکان یـــەکتر ببینن لە باشقەڵا بۆ دانانی

رێبازێك بۆ خەباتی هەردوولا دژی عوسمانی)) .

کۆنگرەی خێڵە کوردەکان بەوە گەیشتن کە بەرەنگاری هەردوو لەشکری عوسمانی و ئێران لە یەك کاتدا مەترسیی لێ دەکرێت، بۆیە بڕیاریان دا سەرەتا هێزەکانیان لە ئێران بدەن، چونکە لەو کاتەدا ئێران بە شەڕی خێڵی تورکمانەوە خەریك بووە و هەندێ لە هێزەکانی تری ناردووە بۆ سەر سنووری ئەفغانستان. لەگەڵ ئەوەشدا شێخ عوبەیدوڵڵا چەند گوندی لە کوردستانی ئێران بە میرات لە باوکیەوە بۆ مابووەوە و دانیشتووانەکەی خۆیان بە پشتیوانی شێخی نەهری دادەنا.

بەم جۆرە شۆڕشی چەکدارانەی شێخ عوبەیدوڵڵا لە تشرینی یەکەمی ١٨٨٠ دەست پێ دەکات و هێزەکانی خۆی دابەش کرد بەسەر چەند بەرەیەکدا:

-- بەسەرکردایەتیی شێخ عەبدولقادر و هەمزە ئاغای مەنگوڕی و مامش، بۆ رزگارکردنی ناوچەکانی موکری، سابڵاغ و میاندواو و مەراغە

-- بەسەرکردایەتیی موحەممەد سدیق کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵا بوو، بۆ رزگارکردنی شاری ورمێ

-- بەسەرکردایەتیی خەلیفە موحەممەد، بۆ رزگارکردنی ناوچەکانی خۆی و سەڵماس

لەگەڵ هەڵایسانی شۆڕشدا عەرەبەکانی ویلایەتی بەغدایش ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ بەشداریکردن لە شۆڕشدا، بە مەرجێ شێخ عوبەیدوڵڵا ویلایەتی موسڵیان بۆ رزگار بکات. لەو کاتەدا زۆربەی هێزە کوردییەکانی کوردستانی ئێران و عێراقی ئێستا دایانە پاڵ

بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا و شێخ ئیدارەیەکی کاتیی پێکهێنا و توانیان ناوچەکانی ساباڵغ و میاندواو و مەراغە ئازاد بکەن.

بەهۆی نەبوونی دیسپلین لە ڕیزی جەنگاوەرەکاندا و نەبوونی شارەزایی سەربازی لە لای سەرکردەکان، جگە لەمە هەر خێڵێك هێزەکانی لەژێر سەرکردایەتیی رابەرەکانی خۆیدا هێشتبووەوە و چەکی پێویستیان نەبوو، سەرباری ئەوە کە ئەو هێزانە کەم مەشق بوون و خواردن و ئازوقەکەش هەر عەشیرەتێك دەبوایە خۆی دابینی بکردایە، هاوڕێ لەگەڵ ئەمەشدا ژمارەیەك خەڵکی نەفس نزم لە هۆزەکان بە مەبەستی تاڵانی و زەوتکردن چووبوونە پاڵ بزوتنەوەکەی شێخ، ئەوان بارودۆخەکەیان بە هەل زانیبوو، بۆ فەرهودی گوندە ئازەری و شیعەکان و سەروەت و سامانی گاور نەستوریەکانی ناوچەی ورمێ، کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئیدارەی کاتیی کوردەوە، ئەمەش خاڵی لاوازی دا بە دەست دوژمنانی کوردەوە.

هەرچۆنێك بێت شێخ عوبەیدوڵڵا کاتێك نزیکی شاری ورمێ بوویەوە، چەند نوێنەرێکی خۆی نارده ناو شار بۆ دانوستان بە مەرجی خۆبەدەستەوەدان. حاکمی شاریش فەرمانی دا کە نمایندەکان بکوژرێن. ئەمەش ڕقی کوردی وروروژاند و چوونە شارەکە و بەپێی هەندێ سەرژمێری نزیکەی ۳۰۰ کەسیان کوشت و گەورەترین هەڵە بوو کە هێزەکانی شێخ کردیان و حکومەتی ئێرانیش خراپ سوودی لێ وەرگرت بۆ ناشرینکردنی جووڵانەوەکە لە ناوەندە ڕەسمییەکاندا. بەڵام خەڵکی شار بە سەرۆکایەتیی ئیقبالوددەولە بەرگرییەکی سەختیان لە شارەکە کرد و نەیاندا بەدەستەوە.

هەر لەو کاتەدا دوکتۆر جۆزێف کاکرن (Joseph Cochran) کە لە کۆمیسیۆنی موژدەبەرانی ئەمریکایی کاری دەکرد، چووە لای شێخ و تکای لێ کرد مەرجەکانی خۆبەدەستەوەدان ڕوون بکاتەوە و ئاگاداریی پێ دا کە نابێت هیچ زیانێك بە فەلەکان و گاورەکانی شار بگات. داوای لێ کرد پێویستە بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر هەڵمەتەکەیان بۆ سەر شارەکە ڕابگرن تا ماوەی خەڵك بدرێت لە شارەکە دەرچنە دەرەوە، بەڵام ئەمە پلانێکی نێوان دوکتۆر کاکرن و فەرماندەی سەربازیی ئێران بوو. ئەوان دەیانزانی یارمەتیی ئێرانی بەڕێوەیە و ویستیان ئەم دەرفەتە وەربگرن، هەتا لە ئازەربایجان ئەو هێزە بۆ شکاندنی گەمارۆکەی سەر ورمێ، ئەمەش بە کردەوە ڕووی دا و شێخیش ئەو دەرفەتە مێژووییە گرنگەی لەدەست دا.

دواجار شەڕەکە لە بەرژەوەندیی ئێران شکایەوە، چونکە هێزەکە گەیشت و چەکی بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کرد. ئیتر بۆ ماوەی دە ڕۆژ شەڕ قەوما بە بێ ئەوەی هێزەکانی شێخ بتوانن سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنن و بگرە بەپێچەوانەوەی شێواوی و لێکترازان بەئاشکرا بە هێزەکانیانەوە دیار بوو. ئەو هێندەی کە هاتبوو بۆ فریاکەوتنی شار هێزە ئێرانییەکە لەسەر دەستی ئەفسەرانی ئینگلیز و فەرەنسا و ئیتالیا و نەمسا و ڕووسیا مەشقیان پێ کرابوو. بەم تەرزە سوپای ئێران توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و بکەوێتە ڕاوەدوونانی شۆڕشگێڕانی کورد. چونکە ئەو هێزانەی کە بۆ تالانی هاتبوون، مەیدانی شەڕەکەیان بەجێ هێشت" ئەمەش کاریگەریی مەعنەوی لەسەر هێزەکان هەبوو.

لە لایەکی تریشەوە عوسمانییەکانیش کەوتنە خۆیان و هێزەکانی خۆیان لە کوردستان قایمتر کرد و کەوتنە گەمارۆدانی هێزەکانی شێخ. بەم جۆرە شێخ عوبەیدوڵڵا ڕوانی هێزەکانی کەوتوونەتە نێوان بەرداشی هێزەکانی عوسمانی و شا و خێڵە کوردە نەیارەکانی شێخ، ئەوجا فەرمانی دا بە سەرکردەکان کە لەشکر لەناو ئێران بکێشێتەوە. لەدوای گەڕانەوەی شێخ بۆ بارەگاکەی خۆی، داوای لە پاشماوەی هێزەکەی کرد کە بڵاوەی لێ بکەن و ئەوکات حکوومەتی ئێرانی داوای لە حکوومەتی عوسمانی کرد سەرانی شۆڕش دەستگیر بکات" لەوانەش شێخ عوبەیدوڵڵا. هەریەک لە حکوومەتەکانی نەمسا و بەریتانیا لەم داوایەدا پشتگیریی ئێرانیان کرد، لەگەڵ ئەوەدا ئەم داوایەی سەری نەگرت، چونکە عوسمانییەکان دەیانویست لە کاتی موبادەرەی سیاسیدا لەگەڵ ئێران وەك کارتی فشار بەکاری بهێنن.

شێخ عوبەیدوڵڵا لەو کاتەدا داوای لە کونسوڵی ڕووسیا کرد بۆ یارمەتی، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە شێخ خۆی بخاتە بەردەم دەوڵەتی عوسمانی، چونکە ئەو کاتە پەیوەندیی نێوان ڕووسیا و عوسمانییەکان باش بوو و ئەو زلهێزانە وەك هەمیشە نایانەوێ بەرژەوەندیی خۆیان بخەنە مەترسییەوە لەبەر مەسەلەیەکی ئەخلاقی یان مرۆڤایەتی.

لە کۆتاییدا شێخ ناچار کرا بچێتە لای سوڵتان و لەگەڵ گەیشتنی شێخ عوبەیدوڵڵا بە پایتەختی عوسمانی، ئیدی جەنگی دیپلۆماسیی توند لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران هەڵگیرسا. ئێران بە ڕێنمایی ڕووسیا دەیویست زیانی ئەو هێرشەی شێخ (عوبەیدوڵڵا)ی بۆ ببژێرن. شێخ لە گەرمەی ئەو جەنگە دیپلۆماسییەدا لە ئەستەمبوڵ ڕای کرد بە بەرگی بازرگانی و پەساپۆرتێکی دروستکراو سواری پاپۆڕێکی شەرکەری (پاك)ی فەرەنسایی دەبێ و خۆی دەگەیەنێتە (پۆتی) و لەوێوە دەچێتەوە کوردستان و هەرکە هەواڵی گەیشتنی

بڵاو دەبێتەوە، کوردستان جووڵەی تێ دەکەوێت. چەند عەشیرەتێك چەکدارەکانی خۆیان کۆ کردەوە و بەو پەڕی ڕێزەوە چوون پێشوازی لە شێخ بکەن. شێخ عەبدولقادری کوڕی هێزێکی بە چەند هەزار کەسییەوە چوو بەپیری باوکییەوە. کە ئێران بەمە دەزانێت، یەکسەر هاواری لێ هەڵدەستێت و ڕایدەگەیەنێت کە حکوومەتی عوسمانی.خۆی لەپشت ڕاکردنی شێخەوەیە.

شێخ لەو کاتەدا ویستی سوود لە کات وەربگرێت و سەرۆکە کوردەکان ئامادە بکات بۆ ڕاپەڕینێکی نوێ و لە لایەکی تریشەوە دەستێك بەسەر قەڵاکانی ناوچە دراوسێکانی بهێنێتەوە و نۆژەنیان بکاتەوە. کاتێك حکوومەت بەمەی زانی، کۆڵۆنێل یووسف بەگی نارد بۆ ئەوەی بەڕەسمی داوا لە شێخ بکات کە واز لە شەڕکردن بهێنێت. بەڵام لەو هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو. دواجار کەمال بەگی سێیەم سکرتێری سوڵتان چووە وان بۆ ئەوەی داوا لە شێخ بکات لە یەکێك لە شارە پیرۆزەکانی عەرەب نیشتەجێ بێت. بەرامبەر بەوەش دەوڵەت خەرجییەکەی دەخاتە ئەستۆی خۆی و مانگانە بڕی ١٥٠ هەزار لیرەی بۆ دەبڕێتەوە. بەڵام شێخ ئەم داوایەی ڕەت کردەوە و چووە قەڵاتی ئۆرمار و خۆی قایم کرد. ئینجا عوسمانییەکان بەپەلە هێزەکانی خۆیان گەیاندە قەڵاکە و ئابڵووقەیان دا. شێخیش بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێت، ناچار خۆی بەدەستەوە دا. ئەوە بوو گرتیان و نەفیان کرد بۆ شاری مەککە. لە تشرینی یەکەمی ١٨٨٣دا بەنەفیکراوی لەوێ کۆچی دوایی کرد.

## شەرفخانی بەدلیسی

(١٥٤٣ – ١٦٠٤ ز)

هەروەك ئاشكرایە كە شەرەفنامە بە گەورەترین شاكاری مێژووی گەلی كوردستان دادەنرێ، بەسەرەتاو دەسپێكی مێژووی نوێی گەلی كورد دادەنرێت.

شەرفخانی بەدلیسی خۆی لە خۆیدا وەرچەرخانێكی گرنگی مێژووی ڕامیاری و ئابووری و كۆمەلایەتی و كلتووری گەلی كوردستانە، شەرفخانەی بەدلیسی كە گەورەترین ڕووناكبیرو نووسەری سەردەمی خۆیەتی بەنووسینی شەرەفنامە نەك هەر زانیاری زۆرو زەبەندی لەمەڕ جوگرافیاو ژیانی ڕامیاری و دەسەلاتی كوردو زمان و ڕووە هەمەجۆرەكانی كۆمەڵگای كوردی بۆ تۆماركردوین.

شەرفخان كوڕی شەمسەدین بەدلیس لە ساڵی ١٥٤٣.٠٢.٢٥ لە گوندی "گەرمەڕووی" سەر بەشاری "قوم" لە ئێرانی عەجەم لە دایكبووە .

لەدیوەخانی "شاتەهمان سپی یەكەم" لەساڵی (١٥٤٣ تا ١٥٧٦) لەگەڵ كوڕەكانی ئەودا ژیاوە . لە ئێران شا ئیسماعیلی سەفەوی ساڵی ١٥٧٦ پایەو نازناوی میری میراز دەبەخشێتە شەرەفخان و دەیكاتە سەرۆكی هۆزی كوردەكانی ئێران.

لە كانوونی دووەمی ساڵی ١٥٧٨ لە جەنگی نێوان ئێرانییەكان و عوسمانییەكان دا پشتی ئێرانییەكان بەردەدات و لایەنگری عوسمانییەكان دەكات بەخۆی و ٤٠٠ چەكدارەوە دژ بە ئێران دەوەستێ سەركردایەتی عوسمانییەكان دەكات لە ساڵی ١٥٨٩ سوڵتان موڕادی سێیەم دژ بە ئێرانییەكان پایەو نازناوی خان دەبەخشێتە شەرەفخان و دەیكاتە میری ویلایەتی بەدلیس لە ساڵی ١٥٩٠ واتا لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا جڵەوی فەرمانڕەوایی خۆی دەداتە دەست كوڕەكەی خۆی شەمسەدین بەگ.

لە ساڵی ١٥٩١ تا ١٥٩٢ دەست دەكات بە نووسینی شەرەفنامەو لە ١٥٩٧.٠٨.٠٤ لە نووسینی شەرەفنامە تەواو دەبێت و پوختەی نووسینەكانی لەدوا دوای ساڵی ١٥٩٧دا كۆتایی پێهێنا بەم جۆرە پرۆژەی تۆماركردنی كوردی ئەنجامدا.

میر شەرەفخان لە ساڵی ١٠١٢ی كۆچی دا بەرامبەر بە ساڵانی ١٦٠٢-١٦٠٤ز كۆچی دوایی كردووە. بەساڵنامەی زایینی ٦٠ ساڵ ژیاوەو بە ساڵنامەی كۆچیش ٦٣ ساڵ ژیاوە .

شەرفنامە گەلێ بابەتی سەرەكی و گرنگی گرتۆتەخۆ وەكو ئەمانەی خوارەوە :

-١حكوومەتە كوردییەكانی مەڕوانی و حەسنەوی و فەچلەوی و ئەیووبی.

-٢حاكمه كوردييەكانی پشتاوپشت حوكمڕانیان كردووه .

-٣ئەو حاكمه كوردانەی پارەیان لێداوەو وتاریان بەناو خوێندراوەتەوه .

-٤جگه لەمانەش بەدووڕو درێژی باسی حكوومەتی بتلیسی كردووه .

ئەم پەرتووكەی شەرفنامه له كۆنەوه گرنگییەكی زۆری پێدراوه له ساڵی ١٩٧٨ی كۆچی بەرامبەری ١٦٦٧ی زایینی لەزمانی فارسیەوه لەلایەن شامی ناوێكەوه وەرگێڕدراوەته سەر زمانی توركی و له دواییدا "ولیامینۆف"ی ڕووسی كردوویەتییه ڕووسی و به چاپی گەیاندووه و "كارمۆی" مێژوونووسی فەڕەنسیش كردوییەتیه فەڕەنسی و له میسریش مێژوونووسی كورد له چلەكانی سەدەی ڕابردوو بەفارسی چاپی كردوەو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی لەساڵی ١٩٥٣دا به پەراوێزی بەنرخەوه كردوویەتییه عەرەبی و بەچاپی گەیاندووه دواجاریش هەژار موكریانی به پەراوێزو پێشەكیەكی درێژەوه كردوویەتییه كوردی و لەساڵی ١٩٧٢دا له چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد له بەغدا له چاپ دراوه .

## حوسێنی حوزنی موکریانی
## ڕۆژهەڵات کوردستان
## ( ١٨٩٣ – ١٩٤٧ ز )

حوزنی موکریانی مێژوونووس و ڕۆژنامەگەریی لێهاتووی کورد ناوی تەواوی "سەید حوسێنی کوڕی سەید عەبدوللەتیفی کوڕی شێخ ئیسماعیل"ە و لە ساڵی ١٨٩٣دا لە شاری مەهاباد چاوی ژیانی هەڵهێناوە و هەر لە منداڵییەوە نیشانەی بەهرەو بلیمەتی لێ بەدی کراوەو سەودای کورد پەروەریی بووە .

لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا کەس و کاری خۆی و مەهابادی بەجێهێشتووە ڕووی کردۆتە مەراغەو تەوریز و یەریڤان و ١٢ ساڵیش بە بەرگی ئەفغانی هەموو کوردستان و هەندەران گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەی مێژووی کورد و تۆمارکردنی و یەکەمین کەس بووە بایەخی تایبەتی دابێ بە نووسینی مێژووی کورد بەزمانی کوردی.

حوزنی لە هەموو چەشنە زانیارییەك دەداو، لە مێژوو، وێژە ، ڕۆژنامەگەریی، مۆرهەڵکەنی، وێنەگری و خۆشنووسی و کلێشەی وێنە هەڵکەندن لەدار. بۆیە دەبینین گەلێك بەرهەمی وێژەی و مێژوویی داناوەو چاپی کردوون و تا خۆی لە ژیاندا بووە لە نێوانی ١٩٢٥ تاکو ١٩٤٧ هەژدە پەرتووکی بەنرخی چاپکردووە کە زۆربەیان لەسەر مێژووی کورد و کوردستان و بایەخی زانیاری خۆیان هەیە .

لەناو کورد دا یەکەمین کەس بووە چاپخانەی بۆ بەرژەوەندی زمان و مێژووی و وێژەی کوردی دامەزراندووە و لە ساڵی ١٩١٥دا لەشاری "حەڵەب"ی داناوەو لە دوایی دا لە ساڵی ١٩٢٥دا گواستوویەتییەو بۆ کوردستانی باشوور و لەشاری ڕەواندزی داناوە و لە ساڵانی ١٩٢٦-١٩٣٢دا گۆڤاری "زاری کرمانجی" پێ چاپکردووەو لەو ماوەیەدا ٢٤ ژمارەی پتەوی لێ بڵاوکردۆتەوەو لە ساڵانی ١٩٣٥ و ١٩٣٦شدا لەشاری هەولێر لەگەڵ پارێزەر شێخ مستەفا گۆڤاری ڕووناکی دەرچوواندووە و لە ساڵانی ١٩٤٣-١٩٤٧یشدا گۆڤارو ڕۆژنامەی (دەنگی گێتی تازە)ی بە هاوکاریکردنی لەگەڵ مامۆستایان تۆفیق وەهبی و حەسەنی شێخ حەمە مارف لە شاری بەغدای پایتەختی عێراق دەرچوواندووە و گەلێك و تاری مێژووی و کۆمەڵایەتی و دەقی وێژەی فولکلۆری کوردی لەو گۆڤار و ڕۆژنامەیەدا بڵاوکردۆتەوەو دوای گەیاندنی خزمەتێکی زۆری زمان و کلتوور و مێژووی کورد و ڕۆژنامەگەریی .

له ڕۆژی ٢٠ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٧دا له بەغدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی هاتۆتەوه شاری هەولێر و له گۆڕستانی ئیمام محەمەد بەڕێزێکی زۆرەوه نێژراوه .

هەندێك لەو پەرتوکانەی که حوزنی لەسەر مێژووی کوردی نوسیونی ئەمانەن:

- مێرگەیدڵان .
- خونچەی بەهارستان .
- پێشکەوتن .
- ئاوڕێکی پاشەوه .
- میرانی سۆران .
- کوردستانی موکوریان .
- بەکورتی هەڵکەوتی دێریکی .
- لاپەڕەیەك لەدێریکی کوردستانی موکوری .
- ناودارانی کورد .

حوزنی گەلێك ڕوپەڕی گۆڤار و ڕۆژنامه و بەگەلێك نامیلکەی هێژا خزمەتی زۆری وێژه و مێژووی کورد کردوه .

# ڕەفـــیـــق حـــیـــلـــمـــی
## باشــوری کوردســتــان
(۱۸۹۸ – ۱۹٦۰ ز)

ماموٚستا ڕەفیق حیلمی لە ساڵی ۱۸۹۸دا لە شاری کەرکووك لە دایك بووە و خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکووك و سلێمانی و ئامادەیی لە بەغداو پەیمانگای ئەندازەی لە ئەستەمبوڵ تەواوکردووەو لە ساڵی ۱۹۲۰دا گەڕاوەتەوە کوردستان و بووەتە ماموٚستایەکی پسپوٚڕی ئەندازەو بیرکاری لەماوەی خوێندنی لە ئەستەمبوڵ فێری زمانی تورکی فەڕەنسی بووە جگە لە کوردی کە زمانی زگماکی خوٚی بووە .

کە شێخ مەحموودی حەفید بوٚ جاری دووەم لە مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۲ کابینەیەکی تازەی داناوە ناوی خوٚی نا مەلیکی کوردستان، ماموٚستا ڕەفیق حیلمی کردە ڕاوێژکاری ڕامیاری خوٚی و ئەم ناودارە گەلێك وتاری ڕامیاری لە ڕوٚژنامەی "ڕوٚژی کوردستان" زمانی میری مەلیك مەحموود نووسی.

کاتێك کە میری کوردستانی باشوور بە پیلانی بەریتانیا و بەزەبری هێزی چەکداری لەناوبرا، ماموٚستا ڕەفیق حیلمی لەو ناوچەیە دوور خرایەوەو کرا بە ماموٚستای بیرکاری، بەڵام دەستی لە کوردایەتی هەڵنەگرت و پتر لەسەر گەیشتنی کورد بە مافی چارەنووسی خوٚی هەوڵیدا بووە یەکێك لە ڕێکخەرانی شەڕەکەی بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە ساڵی ۱۹۳۰ و ماوەیەك لەسەر ئەم خەباتەی گیرا.

کاتێك دەستەیەك لە قوتابیان و لاوانی کوردی هەولێرو سلێمانی و کەرکووك و کوٚیە و کفری ڕێکخراوێکی ڕامیاریان بەناوی کوٚمەڵەی "دارکەر" دامەزراند و ئامانجیان ڕزگارکردنی کوردستان بوو، بەڵام نەبووە ئەو پارتە جەماوەرییە تاکو لە ساڵی ۱۹۳۹ ماموٚستا ڕەفیق حیلمی نەکرا بە سەروٚکی ئەو ڕێکخراوە، ناوەکەیشی لەسەر داخوازی ئەو سەروٚکە کرا بە "پارتی هیوا".

بە هەوڵ و کوٚششی بێوچانی ئەم سەرکردە نەتەوەییە لێهاتووە، زوٚر لە ئەفسەری کورد پەروەر و کاسبکار و ڕووناکبیر بوونە ئەندامی کارای ئەم ڕێکخراوە ڕامیارییەی کوردستان تا گەیشتە ڕادەیەکی وا بە هەوڵ و هیمەتی ئەو پارتە "مەلا مستەفای بارزانی"ی دەست بەسەر لە سلێمانی، دەرباز کرا بوٚ ناو خاکی کوردستانی ڕوٚژهەڵات و لەوەێوەش لە

١٩٤٣.٠٧.٢٨ گەیشتەوە خاکی بارزان بۆ خۆکۆکردنەوە بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی ١٩٤٣-١٩٤٥ی بارزان.

ئەو پارتەی هیوا تاکۆتایی ساڵی ١٩٤٣ و نیوەی یەکەمی ١٩٤٤ بەهێزترین کۆمەڵەی رامیاری کورد بوو، یارمەتیەکی باشی شۆڕشی رزگاریخوازی بارزانی دا، لە جێی پارتی هیوا دوو رێکخراوی رامیاری کورد دروستبوون و پەرەیان سەند ئەوانیش "پارتی شۆڕش" و "پارتی رزگاری" بوون و لە ١٩٤٦.٠٨.١٦یش لە شوێنی هەردوو رێکخراوە رامیارییەکە "پارتی دیموکراتی کوردستان" دروستبوو، مامۆستا "رەفیق حیلمی"ش وەك ناودارێکی رامیاریی گەورەی کورد مایەوە تاکو لە ١٩٦٠.٠٨.٠٤ کۆچی دواییکرد.

مامۆستا رەفیق حیلمی لەگەڵ ئەوەی ناودارێکی رامیاری گەورە بوو، لە هەمان کاتیشدا شاعیرو مێژوونووس و وەرگێرو رەخنەگری لێهاتووی وێژەی کوردیش بوو، لەماوەی ژیاندا ئەم بەرهەمانەی داناوەو بە چاپی گەیاندوون.

١- کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ١٩٢٠ بە زمانی عەرەبی

٢- خولاسەی مەسەلەی کورد (لەفەرەنسیەوە) کردوویەتی بە کوردی

٣- شیعرو ئەدەبیاتی کوردی - بەرگی یەکەم، لە ١٩٤١ و بەرگی دووەمیش لە ١٩٥٦ دا بەچاپ گەیاند

٤- یادداشت "کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود" ٦ بەرگە و هەموویان چاپکراون

٥- دیوانێکی شیعری بەناوی "پاش تەمووز"

جگە لەمانەش بەدەیان وتارو لێکۆڵینەوەی بەپێزی لە گۆڤارە کوردییەکانی وەك گەلاوێژ بڵاوکردۆتەوە .

## تـــۆفيــق وەهبـــی

## باشــوری کــوردستان

## ( ۱۸۹۱ – ۱۹۸٤ ز )

نووسەری لێهاتووی و زمانەوانی وردبین و مێژوونووسی ناوداری کورد "تۆفیق وەهبی بەگی کوڕی مەعرووف" لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۸۹۱دا لەشاری سلێمانی لەدایکبووە.

هەر منداڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، خوێندنی سەرەتایی لەشارەکەی خۆی تەواو کردووەو لەساڵی ۱۹۰٤دا چۆتە بەغدا و خوێندنی ناوەندیی و ئامادەیی سەرەبازی بەزیرەکی تەواو کردووە.

ئینجا ڕووی کردۆتە شاری ئەستەمبوڵی پایتەختی وولاتی عوسمانی بۆ تەواو کردنی خوێندنی بالاتری، لە کۆلێژی ئەرکان وەرگیراوەو بۆتە ئەفسەری ڕوکن لە سوپای عوسمانی.

کە جەنگی یەکەمی جیهانی لەساڵی ۱۹۱٤دا ڕوویداوە ، بەشداری لە شەڕی "چەنە قەلعە" لە دەردەنیل دا کردووەو لەدواییدا ڕەوانەی خوارووی عێراق کراوە بۆ بەشداریی کردن لەبەرەی جەنگ لەدژی هێزەکانی بەریتانیا لە "شعێبە" و لەکاتی کشانەوەی سوپای عوسمانی بەرامبەر بە هێزەکانی بەریتانیا لە مانگی ئەیلوولی ۱۹۱۷دا بەشداریی کردووە لەبەرەی جەنگی ڕومادی و کاتێکیش کە ئەو شارە کەوتۆتە چنگ هێزەکانی ئینگلیز ئەم بەخۆی و لەشکرەکەیەوە بەرەو شاری هیت کشاوەتەوە .

لەساڵی ۱۹۱۸دا گواستراوەتەوە بۆ بەرەی جەنگی فەلستین و پایەی سەرەبازی بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی ڕائید و مەدالیای قارەمانی لەسەرکردەی ئەڵمان وەرگرتووەو ئەوەی شایانی باسە زۆربەی سەرکردەکانی تیپی سوپای عوسمانی ژەنەڕاڵی ئەڵمان بووە ، چونکە لەو جەنگەدا عوسمانی و ئەڵمانیا هاوپەیمان بوون لە دژی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و ئەمەریکا شەڕەیان دەکرد.

کاتێك کە ئەو جەنگە جیهانییە بەشکانی دەوڵەتی عوسمانی هاوپەیمانەکانی لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی ۱۹۱۸دا کۆتایی هات، تۆفیق وەهبی بەگ گەڕایەوە کوردستان و ئینجا چووە بەغداو بووە یەکێك لە ئەفسەرە دیارەکانی کورد لەدامەزراندنی سوپای عێراق لە ڕۆژی ٦ی کانوونی دووەمی ۱۹۲۱دا.

کاتێك که شێخ مەحموودی حەفید له ساڵی ١٩٢٢دا له هیندستان گەڕێنرایەوە سلێمانی و بووەوە پاشای کوردستان، تۆفیق وەهبی بەگ لەمانگی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەی ١٩٢٢دا چووە پاڵ بزووتنەوەکەی ئەم سەرکردەیەی کورد و که ئەم بزووتنەوە و فەرمانڕاوەکەی شێخی حەفیدیش بەدەستی ئینگلیزەکان لەناوبران، تۆفیق وەهبی بەگ بۆ ماوەی ٤٢ ڕۆژ گیرا و که ئازادکرا له دوا دوای ساڵی ١٩٢٣دا کرا به کارگێڕی بزوتنەوەکان له شالیارێتی بەرگری عێراق و لەمانگی ئابی ١٩٢٥یشدا کرا به بەڕێوبەری قوتابخانەی سەربازی له بەغدا و پلەی سەربازی بووە موقەددەم و لەساڵی ١٩٢٩ دا ناردرا بۆ ئینگلتەرە بۆ بەشداریی کردن له خولێکی بەرزکردنەوەی شارەزایی سەربازی و لەساڵی ١٩٣٠دا پلەی عەقیدی پێدار و کرا به موتەسەریفی پارێزگاری سلێمانی، بەڵام بەر له قەومانی شەڕەکەی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی به دەرکی سەرای سلێمانی له کارەکەی دوورخرایەوە کەچی لەساڵی ١٩٣١ لەدوا شەڕی شێخ مەحموود له ئاوباریك لەدژی دەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوایی عێراق ماوەیەك گیرا و تاوانی هاندانی خەڵکیان بۆ داواکردنی فەرمانڕەوایەکی کوردی خستەپاڵ و ماوەیەك بێ کارو فرمان مایەوە تاکو لەساڵی ١٩٤٦ ئەم کەسایەتییە بەناو کورد کرا به شالیاری ئابووری عێراق له شالیارییەکەی حەمدی پاچەچی داو دوای ئەوەش تاکو ساڵی ١٩٥٨ گەلێك جار بەناوی کورد کراوە به شالیاری بەرگری و مەعاریف.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٨دا کراوە به ئەندام له ئەنجوومەنی پیاوماقووڵانی عێراق "مجلس الاعیان" و لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دا عێراقی جێهێشتووەو چووەتە شاری لەندەن و دوا ساڵەکانی ژیانی لێ بەسەر بردووەو هەر خەریکی نووسینی مێژووی کورد و نووسینی بابەتی زمانەوانی کوردی بووە تاکو له ڕۆژی ١٩٨٤.٠١.٠٥دا لەو شارە له تەمەنی ٩٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی هێنراوەتەوە بۆ سلێمانی و لەسەر ڕاسپاردەی خۆی لەچیای پیرەمەگروون له تەنیشت گۆڕی پیاوچاکی کورد پیرەمەگروون بەخاك سپێردراوە .

### بەرهەمەکانی تۆفیق وەهبی بەگ

مامۆستا تۆفیق وەهبی گەلێك پەرتووکی بەنرخی لەبارەی زمان و مێژووی کوردستانی کۆن بەزمانانی کوردی و تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی داناوەو زۆربەیانی چاپکردووە .

#### یەکەم: بەرهەمە کوردییە چاپکراوەکانی

١- دەستووری زمانی کوردی - بەغدا ١٩٢٨، ١١٤ لاپەڕەیە .

٢- خوێندەواریی باو - بەغدا ١٩٣٣، ٤٤ لاپەڕەیە .

٣- قسنێك لە كوردستان - بەغدا ١٩٤٧، ١٨ لاپەڕەیە .

٤- فەرهەنگی كوردی - ئینگلیزی (هاوبەش)، لەندەن ١٩٦٥، ١٧٩ لاپەڕەیە .

دووەم: بەرهەمە چاپكراوەكانی بە عەرەبی

١- رجعیە المانیا و عبادە القوە - بەغدا ١٩٤٢، ٣٦ لاپەڕەیە .

٢- الاصل و الاستگراد في اصل معنى بغداد - بەغدا ١٩٥٠، ٥١ لاپەڕەیە .

٣- قواعد اللغە الكردیە ج (١) بیروت ١٩٥٦، ١١٢ لاپەڕەیە .

٤- قواعد اللغە الكردیە ج (٢) بیروت ١٩٥٦، ٥٥ لاپەڕەیە .

٥- التون كوپری - بەغدا ١٩٥٦، ٢٨ لاپەڕەیە .

٦- سخرە من دربند بازیان الی تاسلوجە - بەغدا ١٩٥٦، ٣٦ لاپەڕەیە .

٧- حول مقال مسئوولیە الادیب الكردی للاستاژ عبدالمجید لگفی - بەغدا ١٩٧٣، ١٥ لاپەڕەیە .

سێیەم: بەرهەمە چاپكراوەكانی بە ئینگلیزی

١- ئەشكەوتی گندۆك - بەغدا ١٩٤٩

٢- پاشماوەی میسرازئیەكان (ئێزدییەكان) لەندەن ١٩٦٢

٣- خوێندنی كوردی - بەشی یەكەم لەندەن ١٩٦٨

ئەوەی شیاوی باسە مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ لە دوای دامەزراندنی كۆڕی زانیاری كورد لە ساڵی ١٩٧١دا بە ئەندامی شانازی هەڵبژێردراو گەلێك لێكۆڵینەوەی لە گۆڤاری كۆڕدا نووسی .

## قـــەدریـــجـــان

( ١٩١١ – ١٩٧٢ ز )

شاعیر و ڕامیاریناس و چیرۆک نووس و وتارنووس و وەرگێڕ، یەکێکە لەو شۆڕەسوارانەی بواری جیاجیا. لەساڵی ١٩١١دا لە شارۆچکەی "دیرک" لە نزیک "ماردین" لە دایکبووە.

لەساڵی ١٩٢٨ بۆ ١٩٣١ لەخانەی مامۆستایان خوێندوویەتی. بەهۆی جموجۆڵی ڕامیارییەوە لەدەست تەنگەتاوی دەسەڵاتی تورك نیشتمانەكەی بەجێهێشتووە و ڕووی كردۆتە ڕۆژئاوای كوردستان. لەوێ خوێندنی خانەی كشتوكاڵی تەواو كردووە. بۆتەمامۆستا. دوای چەند ساڵێك چۆتە مۆسكۆ، لەوێ چاوی بە بارزانیی كەوتووە. دوایی گەڕانەوەی بارزانی بۆ نیشتمان قەدری جان ڕوو دەكاتە بەغدا و دەبێتە میوانی بارزانی. لەساڵی ١٩٣٩دا ژنی هێناوە. لەساڵی ١٩٥٩دا گەڕاتەوە سوریا و لەوێ چەند جارێك بەندكراوە. شاعیر لە دونیای شیعرەكانیدا گەلێك دەست باڵا بووە. زۆربەی ئەو ڕووداوە مێژووییانەی، كە لە كوردستان ڕوویانداوە، جا لە هەر پارچەیەكی بێت، شاعیر لە پەسن و زیندووكردنەوەیان كەمترخەمی نەكردووە.

دەتوانرێت بووترێت، كە مێژوونووسێك ڕاستی ڕووداوەكانی بە شیعر تۆمار كردووە. بۆ نموونە لە ڕووخانی كۆماری كوردستان و لە سێدارەدانی قازی محەمەد بناغە و كۆڵەكەیەكی دیكەی دوو شیعری قەدری جانە ، لەناوچوونی ئەم كۆمارە ، كە لەو سەردەمەدا تەنها هیوا و مەبەستی هەموو كوردێك بووە، ڕووداوێك نەبووە، كە مرۆڤی كورد لێی بێدەنگ بێت، هەروەها لەسێدارەدانی پێشەوا، كە ویژدانی مرۆڤی هەژاندووە، بەتایبەتی ئەو كوردانەی لەگەڵ ڕووداوەكاندا بوون و بێئاگانەبوو. شاعیر ئەم ڕووداوە پڕ نەهامەتییە دڵ و گیانی بریندار كردووە و لەناخەوە هەژاندوویەتی. بۆیە لە شیعری "شینا پێشەوا" ناوەڕۆكی تەواوی ڕووداوەكەی وەرگرتووە. لە شیعرەكەدا نزا لەوانە دەكات، كە هاوكاری شای ئێرانیان كردووە، هەروەها لە شیعرەكەدا ئامۆژگاری ئێزگەی تاران دەكات و دەڵێت: "ئیتر با بەس بێت شاه پەرستی."

هەروەها دەڵێت: "بۆ پاشماوەی كۆمارە خەم هەڵگرە ، بۆ منداڵانی بێ باوك، بۆ ژنی بێ پیاو بگرین، بۆ دایكی شەهیدان فرمێسك برێژە ."

شاعیر لە بڵاوكردنەوەی یەكەم شیعری لە ژمارەیەكی گۆڤاری "هاوار"دا لەساڵی ١٩٣٢دا كێشی خۆماڵی بەكارهێناوە و بایەخی بە سامان و كەلەپووری نەتەوەییداوە و سوودی لە

ئەفسانە و پەند و کەرەسەی فۆلکۆری وەرگرتووە. جگە لە کاریگەری ویژەیی کوردی، سوودی لە ویژەی فەرەنسی و تورکیش وەرگرتووە. وەك شاعیرێکی داهێنەر هاتۆتە گۆڕەپانی نووسین. "قەدریجان" بە زمانە پاراوەکەی خۆی لە شیعری کۆن جودا دەکاتەوە.

چونکە نەتەوەکەی بەکەم تەماشاکراوە و لە منداڵییەوە هەستی بەم هەڵسوکەوتەی نەیرانی کورد کردووە، هەربۆیە هەستێکی نەتەوایەتی کوردی لەناخیدا چەسپییەوە و لە نووسینەکانیدا تیشکیانداوەتەوە. "قەدریجان" لە ۱۹۷۲.۰۸.۰۹ لە تەمەنی ٦١ ساڵیدا لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی لە گۆڕستانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بەخاك دەسپێردرێت.

لە کارەکانی قەدریجان:

**چیرۆك**

۱. Tayê Pora Sipî – ڕۆژنامەی ڕۆناهی، ژمارە ۳، ۱۹۳۱.
۲. Hewar hebe, Gazî li dayê – گۆڤاری هاوار ژمارە ۱، ۱۹۳۲.
۳. Gundê Nû Ava – گۆڤاری هاوار ژمارە ۲، ۱۹۳۲.
٤. Silêman Bedirxan – گۆڤاری هاوار ژمارە ۳، ۱۹۳۲.
٥. Hêviya çarde şevî – گۆڤاری هاوار ژمارە ٦، ۱۹۳۲.
٦. Gelo newisan – گۆڤاری هاوار ژمارە ۱۰، ۱۹۳۳.
۷. Tabûta bi xwînê – گۆڤاری هاوار ژمارە ۱۱، ۱۹۳۳.
۸. Bihara Dêrikê – گۆڤاری هاوار ژمارە ۱۳، ۱۹۳۳..
۹. Dabê – گۆڤاری هاوار ژمارە ١٤، ۱۹۳۳.
۱۰. Sehên zozanan – ڕۆژنامەی ڕۆناهی، ژمارە ١٤، ۱۹۳۳.
۱۱. Gulçîn – ڕۆژنامەی ڕۆناهی، ژمارە ١٦، ۱۹۳۳.
۱۲. Guneh – گۆڤاری هاوار ژمارە ١٦، ۱۹۳۳.
۱۳. Rojên Derbasbyî – گۆڤاری هاوار ژمارە ٥۲، ۱۹٤۳.
١٤. Sond – گۆڤاری هاوار ژمارە ۳۳، ۱۹٤٤.

**هۆنراوە**

۱. Tabûta bi xwînê – گۆڤاری هاوار ژمارە ۲، ۱۹۳۲.
۲. Berdêlk – گۆڤاری هاوار ژمارە ٦، ۱۹۳۲.
۳. Hesinker – گۆڤاری هاوار ژمارە ۷، ۱۹۳۲.

٤. Di Şorezarekêda – **گۆڤاری هاوار ژماره ١٠، ١٩٣٣.**

٥. Cegerxwîn – **گۆڤاری هاوار ژماره ١٢، ١٩٣٣.**

٦. Xewna hişyartî – **گۆڤاری هاوار ژماره ١٣، ١٩٣٣.**

٧. Dadê – **گۆڤاری هاوار ژماره ١٤، ١٩٣٣.**

**مەسعـود محمد جەلیـزادە**

**باشـوری کـوردستـان**

**( ۱۹۱۹ – ۲۰۰۲ ز )**

نووسەری کوردو کەسایەتی ناسراوی کوردستان مامۆستا مەسعود محەمەدی جەلیزادە لە ساڵی ۱۹۱۹دا لە شاری کۆیە لە بنەماڵەیەکی ئایینی و ویژەیە و زانست پەروەر هاتۆتە جیهانەوە و گەشتی خوێندنی لە ساڵی ۱۹۲٦دا لە کۆیە دەست پێکردووە و قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی لە هەولێر لە ساڵی ۱۹٤۰دا تەواوکردووە و لە ساڵی ۱۹٤٥یشدا خوێندنی کۆلیژی مافی لە بەغدا وەرگرتووەو بووەتە پارێزەرێکی یاساناس.

لە خوێندنی کۆلیژی مافدا هاوپۆل و دۆستی دڵسۆزی دڵداری شاعیری لێهاتووی کورد بووە بەیەکەوە زۆربەی ئێواران سەردانی سالۆنی ویژەی خاتوو "بەهیە فەرەجوڵڵای کچە کوردی میسریان لە گەڕەکی ئەعەزمیەی بەغدا کردووە ، کە ئەوسا ئەو خاتوونە زانایەی کورد مامۆستای "کۆلیژی کچان" بووە لە بەغدا. لەو ماڵەدا بەردەوام کۆڕی فەلسەفی و هزری دەبەسترا. مامۆستا مەسعود لەو ساوە بیری کەوتە سەر فەلسەفەو شیکردنەوەی دیاردەی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

ئەو مامۆستایە لێهاتووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و رامیاری گەلێك فەرمانی گرتە ئەستۆ وەك: نوێنەری خەڵکی ناوچەی کۆییە لە پەرلەمانی عێراق لە هەردوو دەورەی ساڵانی ۱۹٥۳ و ۱۹٥٤ و لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ۱۹٥۸دا کرا بە ئەندامی لیژنەی چاکسازی کشتوکاڵ لە عێراقدا و لەگەڵ چەند یاساناسێکی دیکەدا یاسای چاککردنی کشتوکاڵ و ئاودێریان دانا و ئەو یاسایە لە ۳۰ی ئەیلوولی ۱۹٥۸دا بەناوی "یاسای چاککردنی کشتوکاڵ لە کۆماری عێراق"دا بڵاوکرایەوە .

مامۆستا مەسعود محەمەد لە ساڵی ۱۹٦٤دا بە ناوی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان کرا بە شالیاری وڵات لە کابینەی "تاهیر یەحیا" دا تاکو ساڵی ۱۹٦٥ و لە دوا دوای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا کرا بە ئەندام لە "ئەنجوومەنی گشتی خدمە" و لە پاش دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کوردی لە ۱۹۷۰.۰۸.۲۹دا لە شاری بەغدا کرا بە ئەندامی کارای ئەو کۆڕەی زانیاری و بە جێگری سەرۆکی دەستەی کۆڕو کاتێکیش لە دوای هەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد مامۆستا مەسعود وەك سەرۆکێکی کارا لە کۆڕەکەدا مایەوە .

له دوای ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانی باشوور لە بەهاری ساڵی ١٩٩١و کێشانەوەی دەسەڵاتی سەنتەری عێراق لە کوردستان، گەڕایەوە کوردستان تاکو لە ڕۆژی ٢٠٠٢.٠٤.٠١ لە نەخۆشخانەی ڕزگاری هەولێر کۆچی دوای کرد و هەواڵی مەرگی ئەو ناودارە بەهەموو لایەکی کوردستاندا بڵاوبووەوە بۆ ڕۆژی ٢٠٠٢.٠٤.٠٢دا لە گۆڕستانی دەروێش خدر لە کۆییە لە تەنیشت گۆڕی مەلای گەورەی باوکیدا بەخاکی سپێردرا.

مامۆستا مەسعود محەمەد بیرمەندێکی گەورەی کورد بوو ڕووناکبیرێکی مەزنی کوردستان بوو سەرچاوەکانی فەلسەفەی هێگڵ و مارکسی بەوردی خوێندبوەوە لەگەڵ باری ئابووری و کۆمەلایەتی کوردستان بەراورد دەکرد و لەگەڵ هەندێ لایەنی پۆزەتیڤ و لە دژی هەندێ لایەنی نێگەتیڤی بوو.

مرۆڤ سەربەستە لەوەی باوەڕیی پێ یەتی دەری ببڕێ. نەك باوەڕیی پێی نەبێ و ڕووکەشەو لە ترسی ئەم و ئەو نەوێرێت ڕاستی هزرو بۆچوونی خۆی دەربڕێ. مەسعود محەمەد بە نووسین دەهاتە گۆڕەپانی دەمەتەقێ و وتووێژوو ڕاستی باوەڕی خۆی بوێرانە دەردەبڕی. با ئەو کەسانەی بۆچوونیان لە بیروبۆچوونەکانی ئەو نەبوو بە نووسین وەڵامیان بدایەوە .

شێوازێکی تایبەتی هەبوو لە نووسینەکانی، کە لەگەڵ بەرنامەی لێکۆڵینەوەی زانستیدا نەدەگونجا وەك ئەوەی ئەوەندە گوێی بە پۆلێن کردنی بابەتی نووسینەکانی نەدەدا. ناونیشانی سەرەکی و سەردێڕی لاوەکی بەسەر یەکەوە پێشکەش دەکردن و باکی نەبوو گەر پتر لە سەد لاپەڕە لە نووسینەکانی لە ژێر یەك ناونیشانی یاخود بێ ناونیشان بخاتە بەردەم خوێنەری بابەتەکانی بخوێنێتەوە . مەسعوود محەمەد لە ژیانی بیرمەندیندا زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی بەپێزی لە دوو توێی پەرتووکی زلدا بە چاپ گەیاندووە ، کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکیانن:

**پەرتووکە کوردییەکان**

١- حاجی قادری کۆیی - بەشی یەکەم - بەغدا - کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٣
٢- حاجی قادری کۆیی - بەشی دووەم - بەغدا - کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٤
٣- حاجی قادری کۆیی - بەشی سێیەم - بەغدا - کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٦
٤- ووردبوونەوەیەك لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی - کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٤
٥- چەپکێك لە گوڵزاری نالی - کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ١٩٧٦

٦- چەند حەشارگەیەكی ڕێزمانی كوردی - بەغدا - كۆڕی زانیاری كورد ١٩٧٦
٧- مرۆڤ و دەوروبەر - بەغدا - كۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی كورد ١٩٨٤
٨- بەرەو شەقامی ئاخاوتنی كوردی - بەغدا - كۆڕی زانیاری كورد ١٩٧٨
٩- گەشتی ژیانم - سوێد - ستۆكهۆڵم - ١٩٩٢ چاپی یەكەم

پەرتووكە عەرەبییەكان

اعاد التوازن الى ميزان - مختل - المجمع العلمى الكردى - بەغدا ١٩٧٧
٢- الى غورباشوفت العظيم
٣- التفسير البشرى للتاريخ
٤- المجتمع البشري لماذا يشبة مستشفى المجانين - اربيل - دەزطاي ئاراس

## حەپسەخانی نەقیب
## باشوری کوردستان
## (١٨٩١ – ١٩٥٣ ز)

ژنە ناوداری کوردپەروەرو خێرخوازو خەمخۆری ژنانی کوردستان، حەپسەخانی نەقیب-کچی مەعروف بەرزنجی نەوەی کاك ئەحمەدی شێخو ئامۆزای شێخ مەحمودی مەلیکی کوردستانو هاوسەری شێخ قادری حەفید" لە ساڵی ١٨٩١دا لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە.

بۆیە پێیدەڵێن حەپسە خانی نەقیب، چونکە مەعرووف بەرزنجی باوکی (نەقیب) بووە. ئەم پلەی (نەقیب)ییەشی لەلایەن حکومەتی عوسمانیەوە پێبەخشراوە بەو هۆیەوە کە نوێنەری (سادات–شێخان) بووە.

حەپسەخان لەو بنەماڵە گەورە ئایینو زانستپەروەرە خزمەتگوزارەی کورد پەروەردەبووەو بووەتە یەکێك لە ژنە هەرە بەناوبانگەکانی کوردستان، چونکە ژنێکی بەخشندەی چاوتێرو خێرخواز بووەو گەلێك زمان شیرینو دەروونپاك بووە، دیوەخانەکەی هەردەم پڕ لە ژنانی شاری سلێمانیو دەورو بەری بووەو هەر ژنێك تووشی کێشەیەکی کۆمەلایەتی یا دارایی بووبێو زۆریی لێکرابێ، پەنای بردۆتە بەر حەپسەخان و ئەویش بەدڵێکی فراوانەوە لە کێشەکەی کۆڵیوەتەوە بۆی چارەسەر کردووە، زۆر جار یارمەتییەکی باشی دارایی ئەو ژنانەشی داوە، تا وای لێهاتوە نەك هەر لە ناو ژناندا ڕۆڵ و نرخی کۆمەلایەتی خۆی هەبێت. بەڵکو لە ناو هەموو خەڵکی کوردستان دا ڕێزو پایەیەکی تایبەتی بووەو لەو کاتەی کە ماڵو دیوەخانەکەی حەپسەخان ببووە قوتابخانەیەکی کۆمەلایەتی کوردو ژنان لێیەوە فێری ڕەوشتی بەرزی کۆمەلایەتی دەبوون، لە هەمان کاتیش دا مەڵبەندێکی بەرزی نیشتمانپەروەریش بوو، ژنان لەو مەڵبەندە کۆمەلایەتییەی ئەو شێرەژنە کوردە، هەستی کوردایەتییان دەورووژاو بیری ڕامیارییان لەلا پەروەردە دەبوو.

لەکاتێکدا کە لە کۆڕو کۆبوونەوەی ژناندا باسی جلوبەرگی ئاڵووالای ژنانو باسی ئەمو ئەو دەکرا، لە کۆڕو دیوەخانی حەپسەخان–دا هەرباسی ڕەوشت پاکیو کورد پەروەرییو ماف نەتەوایەتی کوردو ئازادیی خاکی کوردستان دەکرا.

ساڵی ١٩٢٣ کە سمکۆی شکاك هاتە سلێمانیو پێشوازییەکی شاهانەی لێکراو ژنانی سلێمانی بەکاریگەریی حەپسەخان رۆڵی بەرچاویان هەبووەو رژاونەتە سەر شەقامەکان.

له ١٩٣٠/٦/٢٨ یەکەمین کۆمەڵەی ژنان بەناوی (کۆمەڵەی ئافرەتانی کورد) بە سەرۆکایەتی حەپسەخانی نەقیب دامەزراوە، حەپسەخانی عیرفانە فەنی، خێزانی جەمیل سائیب سکرتێری بووەو بارەگای تایبەتیشیان هەبووە. بێگومان دروستکردنی کۆمەڵەیەك لەلایەن ژنێکەوە بۆ داکۆکیکردن لە مافو داواکانی ژنان لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی رابردوودا، نموونەیەکی کەم وێنەیە، تەنانەت لەو رۆژگارەی خۆرهەلاتی ناوەڕاست-یشدا .

ئەم ژنە وریاو تێکۆشەرەی کورد، ساڵی ١٩٣٠، نامەیەکی رامیاریی مێژوویی بۆ رێکخراوی (کۆمەڵەی نەتەوەکان - عصبە الامم) لە "جنێف" نووسی و بە ڕاشکاوی داوای ماف چارەنووسی کوردی کرد، لەسەر خاکی کوردستان، کە ئەو داواکارییەی ئەو ژنە کوردە، دەنگێکی باشی دایەوە، بە تایبەتی لەو سەردەمە تاریکەی کورد پێیدا تێدەپەڕی.

کاتێکیش کە کۆماری دیموکراتیی کوردستان بە سەرۆکایەتی پێشەوا قازیی محەمەد لە ١٩٤٦.٠١.٢٢دا لە مەهاباد دامەزرا، حەپسەخان بەهەموو توانایەکی داراییی پشتگریی ئەو کۆمارە ئازیزە ساوایەی کوردی کرد بەرامبەر بەو هەڵوێستەی پێشەوا سوپاسنامەیەکی تایبەتی بۆ ناردو ڕێزێکی زۆری لێنا.

حەپسەخان لە بواری زانستپەروەریی‌و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لەناو ژنانی کورددا، ڕۆڵێکی باڵای بووە، بۆیە نەك هەر مایەی شانازیی پێوەکردنی ژنانی کورد بووە، بەڵکو جێگەی شانازی سەرجەم میللەتی کوردبووە، چونکە جگە لە هەڵوێستی چاکە خوازیی کۆمەڵایەتی‌و خزمەتگوزاریی خەڵکو یارمەتیدانی هەژارو نیشتمانپەروەریی پڕ لە دڵسۆزیی‌و ڕاستگۆیی، هەڵوێستێکی بەرزیشی هەبووە بەرامبەر بەکردنەوەی قوتابخانەی ژنان بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواریی، هەوڵێکی بێ پایانی دا بۆ کردنەوەی خوێندنگەیەکی ژنان کە بە ئێواران ژنانی کورد لەو قوتابخانەیە دەیانخوێند، تەنانەت حەپسەخان خۆشی بوو بە قوتابیی ئەو قوتابخانەیە کە یەکەم قوتابخانەی ژنان بوو لە مێژووی کورداو خانویەکی خۆی بەخشی کە بکرێت بە قوتابخانە، پاشانیش ئەو قوتابخانەیە کە ماڵی خۆی بوو لەسەر پەروەردەی تاپۆ کرد.

ئەم ژنە چاکەخوازەی کورد لە تەمەنی شەستو دوو ساڵیدا، لە ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ١٢ی نیسانی ١٩٥٣، بە نەخۆشی شێرپەنجە، کۆچیدوایی کردو لە لەگردی

(سەیوان)ی شاری سلێمانی بەخاکسپێردرا، بە کۆچیدوایی حەپسەخان، لەو رۆژگارەدا کەلێنێکی گەورە لە بواری تێکۆشان بۆ ئازادیو یەکسانی ژنانی کوردستاندا دروست بوو.

## مەستوورەی ئەردەلان
## رۆژهەلاتی کوردستان
## (١٨٠٤ز - ١٨٤٨ ز)

شاعیر و مێژوونووسی کوردە. ناوی خۆی ماه شەرەف خانم بووە و نازناوی مەستوورە بووە. دەوروبەری ساڵی ١٢٢٠ ك.م (١٨٠٤ ز) لە بنەماڵەی قادرییەکانی سنە دا ، کە ئەوسا زۆر لای والییەکان بەقەدر بوون، لە شاری سنە هاتە دنیا.

مامۆستا مەولەویی تاوەگۆزی لە پەسنی ئەودا ئەم شیعرەی گوتووە:

خورشیدەکەی ناز، ئەوجی بورجی سەور　　　سەرتوغرای دەفتەر مەحبووبان جە دەور

ها لە خانەکەی بورجی شـــەرەف دانوورئەفشانیشەن وە هەر تــەرەف دا

ناوی ماه شەرەف خانم و نازناوی مەستوورە بووە. دەوروبەری ساڵی ١٢٢٠ ك.م (١٨٠٤ ز) لە بنەماڵەی قادرییەکانی سنە دا، کە ئەوسا زۆر لای والییەکان بەقەدر بوون، لە شاری سنە هاتە دنیا. باوکی، ئەولەسەن بەگ (ئەبولحەسەن بەگ)، لە پیاوە رەسەنەکانی سنە بووە و بە ماەشەرەف خانمی خوێندووە تا وەهای پێ گەیاندووە کە ناو دەرکا. لە زەمانی خوسرەو خانی ئەردەلان، والیی سنە، کە بە ناکام ناو براوە، خان و ماڵە قادرییەکان لە یەکتر رەنجاون و ئاشت بوونەوە و بوونە خزم. مەستوورە بۆتە خێزانی خوسرەو خان. خانیش لە شیعردانان دا لە خانم نزیك بۆتەوە. لە دیوانی هەردووکیان دا شیعر بە یەکدا هەڵدانیان زۆر بەرچاوە. مەستوورە چل و چوار ساڵ تەمەنی بووە کە لە سلێمانی مردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

### شیعرەکانی

مەستوورە لە شیعردانان، چ بە کوردی و چ بە فارسی، زۆر خاوەن دەسەڵات بووە. بەداخەوە زۆربەی شیعرەکانی لە ناو چووگن و تەنیا دوهەزار بەیتێکی ماوەتەوە کە ساڵی ١٣٠٥ ك.ه (١٩٢٦ ز)، میرزا ئەسەدوڵڵا خانی کوردستانی، سەرۆکی فەرهەنگی سنە، لە تاران چاپیانی کردووە. کوردییەکانی هەر زۆر کەم ماون بەڵام لە قەسیدەیەکی دا کە بەم بەیتەوە دەست پێ دەکا:

گرفتارم بە نازی چاوەکانی مەستی فەتتانت
بریندارم بە نێشی سینەدۆزی تیری موژگانت

وا دیار ئەدا کە شیعرە کوردییەکانیشی زۆر رەوان بووبێتن. خێوی کتێبی حەدیقەی ناسری، کە ئامۆزای مەستوورە بووە، ژمارەی هەڵبەستەکانی لە قەسیدە و غەزەڵ و وردە بابەت، بە نزیکەی بیست هەزار بەیت نووسیوە بەڵام "توحفەی ناسری" کە ئەویش لە مەڕ کوردستان تاریخێکە، دە هەزاری لەو بیستە کەم کردۆتەوە و دەڵێ دەهەزار بەیتێکی وەهۆندووە.

## صلاح الدین ئەیوبی

ئەبوو موزەففەر یووسفی کوڕی ئەییووب ناسراو بە سەلاحەددینی ئەییووبی (٢٥ی کانوونی یەکەمی ١١٣٧- ٤ی ئازاری ١١٩٤ ) کوردێکی سەرلەشکری موسڵمانان بوو کە دەوڵەتی ئەییووبیی دامەزراند.

سەرەتا لەدژی فاتیمییان و دوایی لەدژی خاچپەرستان (ئەو مەسیحییانەی کە چووبوون خاکە پیرۆزەکان لە فەلەستین بۆ ئۆلی خۆیان بپارێزن) دەرکەوت و شاری قودسی پاش سەد ساڵ خستەوە دەستی موسڵمانان.

دوای ئەوەی سەلاحەددینی ئەییووبی ساڵی ١١٩٣ مرد، دەوڵەتی ئەییووبی لەنێوان کوڕەکانیدا بەش کرا و ئیتر ئەو هێزەی سەردەمی سەلاحەددینی پێ نەما.

سەلاحەددین موسڵمانی سوننە بوو و بە لێخۆشبوون و هەڵسوکەوتی مرۆڤانەی لەگەڵ دوژمنەکانی ناوی دەرکردبوو.

سەرەتای ژیان

ڕەوشتبەرزیی سەلاحەددین

جیهان لە سەدەی ١٢هەمدا

دامەزراندنی دەوڵەت

گرتنەدەستی وەزرات و ڕووخاندنی دەوڵەتی فاتیمی

سوڵتانی میسر

گرتنی شام

فەتحی دیمەشق

فەتحەکانی ناوخۆی شام

هەڵمەت بۆ سەر حەشاشیەکان

گەڕانەوە بۆ میسر و غەزووەکانی لە فەلەستین

شەڕ و ئاگربەست لەگەڵ بلدوینی چوارەم

کێشە ناوخۆییەکان

فراوانبوونی دەوڵەت

فەتحی دەورووبەری وڵاتی نێوان دوو ڕووبار

گرتنی حەلەب

له پێناوی موسڵدا

شەڕ دژی خاچپەرستەکان

شەڕی حەتین

ئازادکردنی کەنارەکانی شام

فەتحی قودس

گەمارۆی سوڕ و عەککا

هەڵمەتی خاچپەرستی سێیەم

کۆچی دوایی

دەوڵەتی ئەیوبی لە دوای سەلاحەدین

سەلاحەدین لە میراتدا

لە ڕۆژهەڵاتدا

لە ڕۆژئاوادا

سـەرەتـای ژیـان

وێنەیەکی گۆڕەپانی شاری دوین لە ئەرمەنستان، شوێنی لەدایکبوونی نەجمەددین ئەییووب (باوکی سەلاحەددین) و ئەسەدەددین شێرکۆ (مامۆی سەلاحەددین). وێنەکە شاری دوین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نیشان دەدا.

سەلاحەددین لە خێزانێکی کوردی سەر بە یەکێك لە هۆزە کوردییە ناودارەکان بە ناوی هۆزی ڕەوادی لەدایك بووە. شوێنی نیشتەجێبوونی هۆزی ڕەوادیش لە نزیك شارۆچکەی دوین لە ئەرمەنستاندا بووە. ئەییووبییەکانیش دەدرێنە پاڵ ئەییووبی کوڕی شادی.

شادی (باپیرە گەورەی سەلاحەددین) هەندێك پۆستی کارگێڕیی لە قەڵای تکریتدا پێ سپێردرا، کە لەو کاتەدا موڵکی بەهرۆزی خزمەتگوزاری سوڵتانی سەلجوقی محەمەدی کوڕی مەلیکشا بوو. شادی لەگەڵ دوو کوڕەکەیدا، نەجمەددین ئەییووب و ئەسەدەددین شێرکۆ، گواستیەوە بۆ ئەوێ و پلە-بە-پلە بە پۆستە کارگێڕییەکاندا سەرکەوت تا پۆستی پۆلیسیی (شەحنە) وەرگرت. کاتێ مرد نەجمەددین ئەییووب بووە جێنشینی و بەهۆی جوامێری و دەستپاکییەوە سوڵتانی سەلجوقی قەڵای تکریتی پێ سپارد و ئەویش بە باشترین شێوە بەڕێوەی برد. هەروەك ئەسەدەددین شێرکۆی مامی سەلاحەددین لە پێشەوەی ئەمیرەکاندا بوو لای سەلجوقییەکان و لە تکریت و دەوروبەریدا ناوچەیەکی بەرفراوانیان بۆ تەرخان کردبوو.

سەلاحەددین ساڵی ١١٣٨ لە قەڵای تکریت لەدایک بووە. ڕۆژی لەدایکبوونی هاوکات بوو لەگەڵ ئەو ڕۆژە کە موجاهیدەددین بەهرۆز، والیی بەغدا، بەهۆی کوژرانی یەکێك لە سەرکردەکانی قەڵا لەلایەن شێرکۆی مامی سەلاحەددینەوە، فەرمانی دا بە نەجمەددین ئەییووب و ئەسەدەددین شێرکۆی برای کە تکریت بەجێ بهێڵن. ئەوانیش بەجێیان هێشت و بەرەو مووسڵ بەڕێ کەوتن.

هەردوو برا، نەجمەددین و ئەسەدەددین، چوونە مووسڵ و لەلایەن عیمادەددین زەنگییەوە پێشوازییان لێ کرا. لەوێ بوو کە بنەماڵەی ئەییووبی گەشەی کرد و نەجمەددین و شێرکۆی برای بوونە یەکێك لە باشترین سەرکردەکانی عیمادەددین. ماوەیەك دواتر، عیمادەددین کوژرا و نوورەددین زەنگی کاروباری گرتە دەست. ئەویش بە یارمەتیی ئەییووبییەکان توانی دیمەشق بهێنێتە ناو دەوڵەتەکەی.

لە دیمەشقدا سەلاحەددین فێری زانستە ئیسلامییەکان، هونەرەکانی سوارچاکی، ڕاو، تیرهاوێژی و پێداویستییەکانی تری پاڵەوانێتی بوو. کاتێك نوورەددین زەنگی لە ساڵی ٥٣٤ی کۆچی بەعلبەکی داگیر کرد، نەجمەددین ئەییووبی کرد بە والیی ئەوێ. پاشان، نەجمەددین چوو بۆ دیمەشق و بەم شێوەیە سەلاحەددین تەمەنی منداڵیی لە بەعلەبەکدا بەسەر برد.

رەوشتبەرزیی سەلاحەددین

مێژوو کەسایەتی و ڕەوشتی سەلاحەددینی بەرز نرخاندووە. دادگەری، ئازایەتی، بەخشندەیی، لێبوردوویی، ئەمەکداری، ڕووخۆشی و نزیکبوون لە خەڵکەوە ژمارەیەك لەو تایبەتمەندییە ئەخلاقییانەن کە دراونەتە پاڵی.

سەلاحەددین دەسەڵاتدارێکی دادگەر بووە" دەڵێن هەموو ڕۆژێکی دووشەممە و پێنجشەممە لە مەجلیسێکی گشتیدا دادەنیشت و زانایان و دادوەرانی لەگەڵ خۆی ئامادە ئەکرد و دەرگای بۆ هەموو سکاڵایەك ئاوەڵا ئەکرد. ئەمەشی لە شاردا و لە کاتی گەشت و گەڕانیشدا ئەکرد. سەلاحەددین لێبوردە و میهرەبان بووە تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکانی کە لەگەڵی دەجەنگان. کاتێك ئاگربەستی بکردایە، پێی پابەند ئەبوو و ئەگەر بەڵێنیشی بدایە ئەیبردە سەر.

جیهان لە سەدەی ١٢هەمدا

جەنگەکانی سەلاحەددین لە میسر

کاتێك سەلاحەددین لە ناوەندی سەدەی ١٢هەمدا دەرکەوت، دەوڵەتی عەبباسی بووبوو بە چەند دەوڵەتێکی بچوك. لە میسر فاتیمییەکان حوکمیان ئەکرد و دانیان بە خەلافەتی بەغدا نەئەنا. خاچپەرستەکان کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستیان، لە ئاسیای بچووکەوە تا نیمچەدوورگەی سینا، داگیر کردبوو. ئەتابەکەکانیش دەستیان بەسەر بەشێك لە عێراق و سووریا گرتبوو.

ساڵی ٥٥٩ی کۆچی، سەلاحەددین لەگەڵ ئەسەدەددین شێرکۆی مامی، کە سەرکردایەتیی سوپاکەی ئەکرد، ڕۆیشت بەرەو میسر. ئەسەدەددین میسر ئەگرێت و وەکوو زانراوە سەلاحەددین ڕۆڵێکی گەورە لەو هەڵمەتەدا ئەبینێ.

پاشان، وەزیری دەوڵەتی فاتیمی غەدر ئەکا لە ئەسەدەددین و لەگەڵ فەڕەنگییەکاندا ئەبێ بە یەکێ. ئەسەدەددین بۆ ئەوەی میسر لە خاچپەرستەکان بپارێزێت، بۆ جاری دووەم و دیسان بە هاوڕێیەتیی سەلاحەددین، سوپاکەی لە دیمەشقەوە بەرەو میسر بەڕێ ئەکا.

گەیشتنی ئەسەدەددین هاوکات ئەبێ لەگەڵ گەیشتنی فەرەنگییەکان کە فاتیمییەکان لەگەڵیان ڕێك کەوتبوون. یەکەم شەڕی گەورە لە نێوانیاندا لە بیابانی جیزە ڕوو ئەدا و لە شەڕەکەدا سەلاحەددین یەکێك لە سەرکردە خاچپەرستەکان بە دیل ئەگرێت. دوای ئەم سەرکەوتنە، ئەسەدەددین ئەچێ بۆ ئەسکەندەرییە و و سوپای خاچپەرست و فاتیمی ئەسکەندەرییە گەمارۆ ئەدەن (گەرچی زیانێکی گەورەیان لێ کەوتبوو بەڵام هێشتا ژمارەیان لە سوپاکەی ئەسەدەددین زیاتر ئەبێ). تا دواتر، وا ڕێك ئەکەون کە هەردوو سوپای شام (ئەسەدەددین) و فەڕەنگییەکان لە میسر بڕۆنە دەرەوە (ساڵی ٥٦٢ك بەرامبەر ١١٦٧ز).

جاری سێیەم، دیسانەوە ئەسەدەددین لە شامەوە سوپا بەڕێ ئەکا بۆ میسر. هۆکاری لەشکەرکێشانی ئەمجارە ئەوە بوو کە فەڕەنگییەکان هەموو سوار و پیاوەکانیان کۆ کردبووەوە و ئەیانویست میسر بگرن. کە هەواڵ گەیی بە ئەسەدەددین ، شێرکۆ و نوورەددین زەنگی، بەپەلە ئەکەونە خۆ بۆ ناردنی سوپا. ئەسەدەددین لە ساڵی ٥٦٤ی کۆچی ئەگەیێتە میسر و فەڕەنگییەکان ناچار ئەکا میسری بۆ چۆڵ بکەن" لە ٨ی کانونی دووەمی ١١٦٩ی زایینیدا ئەچێتە ناو قاهیرەوە. ئەسەدەددین ئەزانێ "شاور"ی وەزیری فاتیمییەکان یاری ئەکات بەمان و بە فەڕەنگییەکان. لەبەرئەوە شاور ئەگرێ و خەلیفەی فاتیمی، عازید لیدینلا، فەرمانی کوشتنی دەر ئەکا و ئەسەدەددین ئەکاتە وەزیر.

دامەزراندنی دەوڵەت

## گرتنەدەستی وەزارەت و ڕووخاندنی دەوڵەتی فاتیمی

پێش هاتنی سەلاحەددین میسر مەڵبەندی دەوڵەتی فاتیمی بوو. خەلیفەی فاتیمی دەسەڵاتێکی وای نەبوو و هەموو کاروبارەکان بەدەست وەزیرەکانیەوە بوو. بەم شێوەیە ئەسەدەددین شێرکۆ بوو بە پیاوی یەکەم لە وڵاتدا و کاتێك ئەو مرد خەلیفەی فاتیمی وەزارەتی دا بە سەلاحەددین. مێژوونوسان باس لەوە دەکەن کە زەنگییەکان بۆ دانانی سەلاحەددین لەو جێگایەدا زۆریان بۆ خەلیفەی فاتیمی هێنا. لەبەر لاوازیی ئەو کاتەی فاتیمییەکان و بەهێزیی زەنگییەکان و زۆریی ژمارەی پشتیوانانی سەلاحەددین خۆی، خەلیفە ناچار بە پەژیران بوو. لەگەڵ ئەمانەشدا، وەرگرتنی وەزارەت بۆ سەلاحەددین بە ئاشتی نەڕۆیشت و چەند مانگێکی نەبرد کە سەرباز و فەرمانڕەوا فاتیمییەکان هەوڵی کوشتنییان دا.

لەم کاتانەدا نورەددین زەنگی سەرگەرمی کێشە ناوخۆییەکانی وڵاتەکەی لە شام بوو. دوای وەرگرتنی وەزارەت لەلایەن سەلاحەددینەوە، خاچپەرستان هەڵمەتێکی نوێیان برد و لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ١١٦٩ زایینیدا بە کەشتییەکانیانەوە بەندەری دومیاتیان گەمارۆ دا.

سەلاحەددین هەواڵی نارد بۆ نورەددین زەنگی، ئەویش لای خۆیەوە دەستی کرد بە هێرشبردن بۆ سەر میرنشینە خاچپەرستەکانی شام تا گوشاری سەر میسر کەم بکاتەوە. پاسەوانەکانی دومیات ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە پاراستنی شارەکە و دوای ٥٠ ڕۆژ گەمارۆدان خاچپەرستانیان ناچار بە گەڕانەوە کرد. گەردەلوولێکی بەهێزیش هەڵی کرد و دەریاوانەکان کۆنترۆڵیان بەسەر کەشتییەکاندا نەما و زۆربەیان نوقم بوون. لە باکوورەوە، سەلاحەددین بە سوپاکەیەوە دوای خاچپەرستە کشاوەکان کەوت هەتا لە شاری دەیر بەلەح بەیەکیان دا (ساڵی ١١٧٠). پاشای خاچپەرستان لەگەڵ پاسەوانەکانی لە شاری غەززەوە بۆ شەڕ لەگەڵ سەلاحەددین بەرەو ئەوێ دەرچوو. بەڵام سەلاحەددین ڕێگەی گۆڕی بەرەو غەززە و ئەو شارەی خاچپەرستەکان لە دەرەوەی قەڵای شارەکەدا دروستیان کردبوو ڕووخاندی. هەروەها، بەپێی هەندێك لە سەرچاوەکان، لەو ماوەیەدا سەلاحەددین قەڵای ئیلاتیشی گرت.

دوای ئەم سەرکەوتنە، زەنگییەکان پێیان لە میسر قایم بوو. نورەددین زەنگی ناردی بەشوێن سەلاحەددینا کە وتاری هەینی ڕابگرێت بۆ خەلیفەی فاتیمی و بیگەڕێنێتەوە بۆ خەلیفەی عەبباسی. بەڵام سەلاحەدین لەبەر دەسەڵاتی شیعە لە میسردا لەمە ئەترسا و دوای ئەخست. هەتا نورەددین هەڕەشەی لە سەلاحەددین کرد کە خۆی دێت بۆ قاهیرە،

سەلاحەددین هەموو کاروبارێکی بۆ ڕێك خستبوو بەڵام کەس غیرەتی نەئەکرد جێبەجێی کات تا شێخێکی سوننە لە مووسڵەوە هات و وتاری بۆ خەلیفەی عەبباسی دا (لە یەکەم هەینیی مانگی ئەیلولی ساڵی ١١٧١دا). پاشان، هەموو قاهیرە ئەوەیان ئەنجام دا. لە کاتێکدا خەلیفەی فاتیمی لەسەر جێی مردن بوو، زۆری نەبرد وەفاتی کرد. سەلاحەددین بوو بە حاکمی میسر. بەمەش، دوای ٢٦٢ ساڵ بەردەوامی، دەوڵەتی فاتیمی سەرەنجام کۆتاییی پێهات.

## سوڵتانی میسر

دوای ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمی سەلاحەددین دەستی کرد بە بەهێزکردنی حکوومەتی خۆی لە میسر و هەوڵی دا سەربەخۆی بکات. پایەکانی دەوڵەتی دا بە لایەنگر و نزیکەکانی. قازییە شیعەکانی لابرد و گۆڕینی بۆ قازیی شافعی، مەجلیسەکانی بانگەوازی هەڵوەشاندەوە و ئوسولی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلیی لابرد، ناوی عەلی کوڕی ئەبوتالیبی لە بانگدا سڕییەوە، بڕیاری دا ناوی هەر چوار خەلیفەی ڕاشدین لە وتاری هەینیدا بهێنرێت، دوو خوێندنگەی گەورەی بنیات نا لە فوستات بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی سوننە، ئەم دوو خوێندنگەیە زانستەکانی شەریعەتیان ئەوتەوە بەپێی مەزهەبی شافعی و مالکی.

مزگەوتی ئەزهەر، فاتیمییەکان دایانمەزراند بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ئیسماعیلی، سەلاحەددین گۆڕی بۆ خوێنگەیەکی سوننە، دوای ئەوەی دەستی گرت بەسەر فاتیمییەکان و دەسەڵاتی شیعە لە قاهیرەدا.

نێوانی نوورەددین زەنگی و سەلاحەددین ساردیی تێکەوت. چەند جارێك سەلاحەددین نامەی پۆزشی نارد بۆ نوورەددین، بەڵام هیچ لەوانە سودی نەبوو. نوورەددین سوور بوو لەسەر ئەوەی لە فرسەتێکدا هێرش بکاتە سەر میسر بۆ لابردنی سەلاحەددین.

لە هاوینی ساڵی ١١٧٢دا هەواڵ گەیشت کەوا سوپای نوبییەکان گەیشتوونەتە سنووری میسر و ئەیانەوێت گەمارۆی ئەسوان بدەن. سەلاحەددینیارمەتی بۆ ناردن و نوبییەکانیان ناچار بە گەڕانەوە کرد. جارێکی تر، سوپای نوبی لە ساڵی ١١٧٣دا گەڕایەوە. ئەمجارەیان سوپای ئەیووبی دوایان کەوتن تا وڵاتی نوبە.

لەم کاتانە نوورەددین زەنگی هیچ هەنگاوێکی سەربازیی بەرامبەر سەلاحەددین نەنا، بەڵام داوای گەڕانەوەی ٢٠،٠٠٠ دیناری لێکرد کە کاتی خۆی بۆ هەڵمەتەکەی ئەسەدەددین شێرکۆ بۆ فەتحی میسر و دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی خاچپەرستی و فاتیمیدا تەرخانی

کردبوو. سەلاحەددین وەک ئەمەکێک بۆ قەرزەکەی، ٦٠،٠٠٠ دیناری بۆ نارد لەگەڵ باشترین شتومەک و گەوهەردا، هەروەها ئەسپ و فیل.

سەلاحەددین لە کاتی ڕۆیشتنی بە خاکەکانی شامی خاچپەرستیدا بۆ گەیاندنی پارە و دیارییەکان بە دیمەشق، سوودی لە فرسەت وەرگرت و هێرشی بردە سەر خاچپەرستەکان و فەڕەنگییەکان و چەند شەڕێک لە نێوانیاندا ڕووی دا. کاتێک سەلاحەددین لە شام بوو باوکی مرد و چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی گەڕایەوە میسر لە ساڵی ١١٧٤دا، براکەی بە سوپایەکەوە نارد بۆ گرتنی یەمەن" وڵاتەکەیان گرت و بەمەش حیجاز چووە پاڵ میسر.

نوورەددین لە بەهاری ١١٧٤دا هێزێکی گەورەی کۆ کردەوە و لە هەوڵێکدا بۆ لابردنی سەلاحەددین هێرشی برد بۆ میسر. بەڵام ئەم هەڵمەتە تەواو نەکرا و لە ١٥ی ئایاری ١١٧٤ لە تەمەنی ٥٩ ساڵیدا نوورەددین گیانی لەدەست دا.

بە وەفاتی نوورەددین، سەلاحەددین بە کردەوە بوو بە پێشەوای میسر و سەربەخۆ بوو لە هەر شوێنکەوتوویییەکی سیاسی. بەم شێوەیە سەلاحەددین بوو بە سەرکردەی گەورەترین دەسەڵاتی ئیسلامیی ئەو سەردەمە کە بە دەوڵەتی ئەییووبی ناسراوە.

### گرتنی شام

#### فەتحی دیمەشق

**قەڵای دیمەشق، چوار ڕۆژ دوای گرتنی شارەکە سەلاحەددین چووە ناویەوە.**

نوورەددین زەنگی مرد و لەدوای خۆی کوڕێکی یانزە ساڵەی بەجێ هێشت بە ناوی ساڵح ئیسماعیل. سەلاحەددین لە نامەیەکدا بۆ ساڵح ئیسماعیل ئاماژەی بە مەرگی باوکی کرد و بیستنی هەواڵی مەرگی ئەوی بە "ڕاچڵەکیان لە بوومەلەرزە" وەسف کرد و بەڵێنی پێ دا لە بەرامبەر دوژمنانیدا "وەکوو شمشێر دەستبەکار بێ".

سەلاحەددین ئەیتوانی بەئاسانی دیمەشق بگرێ بەڵام لە بیروباوەڕی ئەودا هێرشکردنەسەر وڵاتێک کە پێشتر هیی سەروەر و گەورەی خۆی بووە کارێکی ناڕەوا بوو. سەلاحەددین وای بە باش زانی چاوەڕوانی بانگهێشت و داوای یارمەتیی ساڵح بمێنێتەوە، بەڵام بارودۆخەکە لە شام جیاواز بوو، ساڵح ئیسماعیل گوێزرایەوە بۆ حەلەب و گەورەی سەربازە زەنگییەکان (کەمشتەکین) ڕاسپێردرا لەسەری تا گەورە دەبێت. خێرا کەمشتەکین تەماعی کردە فراوانکردنی دەوڵەتەکەی و بڕیاری دا دیمەشق بگرێت. ئەمیری دیمەشق داوای یارمەتیی لە سەلاحەددین کرد و سەلاحەددینیش بە سەرکردایەتیی سوپاکەی، کە لە

ڕێگەدا چەند کۆمەڵێکی کورد و عەرەب دابوویانە پاڵیان، لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١١٧٤دا چووە ناو دیمەشقەوە.

**فەتحەکانی ناوخۆی شام**

سەلاحەددین دستبەکاری گرتنی شارەکانی تری شام بوو کە دوای مردنی نوورەددین تا رادەیەك سەربەخۆ بووبوون. حەمای بەئاسانی گرت، بەڵام خۆی لا دا لە هێرشبردن بۆ سەر حومس، لەبەر ئەوەی کە قەڵاکەی زۆر ئەستەمب بوو. پاشان سەرنجی چووە سەر حەلەب و دوای ئەوەی کەمشتەکین ڕەتی کردەوە ملکەچ بێت بۆی، سوپاکەی بەرەو ئەوێ بەڕێ کرد. ساڵح (کوڕەکەی نوورەددین) داوای لە خەڵك کرد کە بەرگری لە شارەکەیان بکەن، وەك ئەڵێن ئەو قسانە کاریگەریی زۆری لەسەر خەڵك هەبوو.

کەمشتەکین ناردی بۆ لای ڕەشیدەددین سینان (شێخی حەشاشییەکان، کە لەبەر ڕووخانی دەوڵەتی فاتیمی لەگەڵ سەلاحەددینا دوژمن بوو) و لەگەڵی ڕێکەوت کە سەلاحەددین لەناو بەرن. تیپێکی ١٣ کەسی لە حەشاشییەکانیان نارد تا لە سەربازگەکەیدا سەلاحەددین بکوژن، بەڵام پێش ئەوەی هێرش بەرن ئاشکرا بوون و پێیان زانرا.

لەم کاتانە ریمۆندی سێیەم لە تەرابلوس جوڵا بۆ هێرشکردنە سەر حومس، بەڵام خێرا پاشەکشەی کرد بێ ئەوەی ئامانجەکەی بپێکێت، و سەلاحەدین کەوتە بەر هێرشی دوژمنەکانی کە دژە هێرشیان ئەکردە سەری، دواتر سەلاحەدین ڕۆیشت بەرەو حەما لە سەرکردایەتی سوپاکەی بۆ ڕێگرتن لەو تیپە خاچپەرستیەی هاتبوون بۆی، بەڵام خاچپەرستەکان کشانەوە کاتێك هەواڵی زۆری هێزی ئەییوبییەکانیان پێگەیشت، سەلاحەدین بە ئاسانی چووە شارەکەوە و قەڵاکەی گرت لە ئازاری ١١٧٥ز، دوای بەرگریەکی بەهێز لەلایەن پاسەوانەکانیەوە. ئەمیری موسڵ سەیفەدین غازی ترسا لە گەورەبوونی سەلاحەدین، هێزێکی زۆری کۆکردەوە بەسەرکردایەتی عیزەدین مەسعودی برای، کە سەلاحەدین ئەمەی زانی گەمارۆی سەر حەلەبی لابرد و چووە حەما خۆی ئامادەکرد بۆ بەیەکگەیشتنیان، کاتێك عیزەدین مەسعود گەیشتە حەلەب سوپای کوڕی مامەکەی، پاشا ساڵح ئیسماعیل چوونە پاڵی و دەرچوون لەگەڵ سوپایەکی گەورەدا، چاوەڕێی کردن تا گەیشتنە شاخەکانی حەما، نوێنەری نارد بۆلایان و بۆیان نارد و هەوڵیدا لەگەڵیان ڕێبکەوێت، بەڵام ڕێنەکەوتن هەردوولا کۆبوونەوە لە شاخی حەما لە نزیك ڕووباری عاسی و شەڕێکی گەورە لە نیوانیان ڕوویدا و زەنگیەکان تێکشکان لەسەر دەستی سەلاحەدین، لە ٢٣ی نیسانی ١١٧٥ز سەلاحەدین لە

دوای ئەم سەرکەوتنە چووە حەلەبەوە و زەنگیەکان لەگەڵی ڕێکەوتن، و خۆی کرد بە پاشا بەسەر ئەو وڵاتانەی فەتحی کردبوون و وتاری هەینی بۆ خوێنرایەوە بە ناوی "الملك الناصر" واتە" (پاشای سەرخەر)، دیناری ئاڵتونی بەناویەوە لە میسر لێدرا، و ژنەکەی نورەدین زەنگی هێنایەوە، و خێرا سەرکردایەتی سەلاحەدین شەرعیەتی وەرگرت کاتێك خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا دەسەلاتی میسر و ڕۆژئاوای خوارو و نەوبە و ڕۆژئاوای نیمچەدوورگەی عەرەبی و فەلەستین و سوریای ناوەڕاستی پێدا.

دوای ئەم سەرکەوتنانە دوایین شەڕی نیوان زەنگی و ئەیوبیەکان ڕوویدا لە هاوینی ١١٧٦ز، سەلاحەدین سوپاکەی ئامادەکرد لە میسرەوە بۆ یەکلایکردنەوە، و سەیفەدین غازی ئەمیری موسڵ هەستا بە کۆکردنەوەی پیاوەکان لە دیاربەکر و گوند و شارەکانی دوورگەی فورات، ئەیوبیەکان هاتن بەرەو ڕوویان و لە شەڕێکی بەهێزدا بەسەریاندا سەرکەون و سەلاحەدین مامەڵەیەکی جوامێرانەی دیلەکانی کرد دیاری پێدان و ئازادیکردن، پاشان دەسکەوتەکانی جەنگەکەی بەسەر سەربازەکانیدا دابەش کرد و هیچی بۆ خۆی دانەنا.

دوای ئەم سەرکەوتنە سەلاحەدین گەڕایەوە بۆ گەمارۆی شاری حەلەب، لە کاتی ڕۆیشتنیاندا فەتحی قەلای بزاعە و منبجیان کرد، پاشان ڕۆیشت بەرەو ڕۆژئاوا بۆ گرتنی قەلای ئەعزاز، و کاتێك گەمارۆی قەلاکەیان دا هەندێك لە حەشاشەکان سەربازگەکەیان کرد و یەکێکیان توانی بچێتە خێمەکەی سەلاحەدینەوە و چەقۆیەکی دا لە سەری بەلام چەقۆکە بەر ڕومەتی کەوت و بریندراری کرد و توانی حەشاشەکە بگرێت و کوشتی، ئەم ڕووداوە کاریگەری زۆربوو لەسەر سەلاحەدین بڕیاریدا دەست بگرێت بەسەر کەمشتەکین ئەمیری حەلەب کە پێشتر ڕێکەوتبوو لەگەڵ حەشاشیەکان بۆ کوشتنی سەلاحەدین، و زۆر ئاگاداربوو دوای ئەوە.

دوای ئەوەی سەلاحەدین سەرکەوت و فەتحی قەلای ئەعزازی کرد، بەرەو حەلەب ڕۆیشت و گەمارۆیدا تا ئەمیر کەمشتەکین بگرێت ئەمجارەش بەرگریەکی بەهێزیان کرد پاشان سەلاحەدین ڕێکەوت لەگەڵیان کە زەنگیەکان بمێننەوە لە حەلەب لە بەرامبەر ئەوەی دان بنێن بە دەسەلاتی سەلاحەدین لە هەموو ناوچەکانی تر کە گرتویەتی، و خێرا میرەکانی ماردین و دەوروبەری دانیان نا بە سەرکردایەتی سەلاحەدین و بە دەسەلاتی لەسەر شامدا، دوای تەواوبوونی ئاگربەستەکە پاشا سالح خوشکە بچوکەکەی نارد بۆ لای سەلاحەدین داوای لێکرد قەلای ئەعزاز بگێڕێتەوە بۆ زەنگیەکان، سەلاحەدین وەلامی داواکەی دایەوە زۆر بە جوامێرانە و خۆی هاوڕێیەتی کرد تا دەروازەی حەلەب و دیارییەکی زۆری بۆ ناردن.

## هەڵمەت بۆ سەر حەشاشیەکان

دوای ئەوەی سەلاحەدین هاوپەیمانی بەست لەگەڵ زەنگیەکان و ڕێکەوتنی ئاشتی کرد لەگەڵ شانشینی بەیتولموقەدەس، هیچ مەترسیەك نەمایەوە بۆ دەوڵەتەکەی بێجگە لە حەشاشیەکان، کە ڕێگەی تیرۆر کردنیان بەکارئەهێنا بۆ ڕزگاربوون لە دوژمن و ڕکەبەرەکانیان، و چەند قەڵا و کەلویەکیان بەدەستەوەبوو لە شاخەکانی نەسیری، و کاتێك سەلاحەدین بڕیاریدا کە لێیانبدات، چەند یەکەیەکی سەربازی نارد بۆ شاخەکانیان، و سەربازەکانی تری گەڕاندەوە بۆ میسر و سەلاحەدین خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد و گەمارۆی هەموو قەڵاکانی حەشاشیەکانی دا لە ئابی ١١٧٦زدا، بەڵام نەیانتوانی هیچیان فەتح بکەن دوایی کشانەوە و پاشان ڕێکەوتن لەگەڵیان بەمەش سەلاحەدین سەرکەوتنێکی تری بەدەست هێنا بەوەی خاچپەرستەکانی بێبەش کرد لە هاوپەیمانیەکی گرنگ.

## گەڕانەوە بۆ میسر و غەزووەکانی لە فەلەستین

لە دوای کشانەوە لە شاخەکانی نەسیری سەلاحەدین گەڕایەوە میسر دوای ئەوەی دوو ساڵ بە جێی هێشتبوو بۆ داستانە یەك لەدوای یەکەکانی لە شام، دەستیکرد بە ڕێکخستنەوەی کاروباری میسر و چاکسازیکردن یەکەم ئیش هەستا بە دروستکردنی قەڵا لە چواردەوری قاهیرە و بنیاتنانەوەی بەشە ڕوووخاوەکانی، دیوارەکانی چاك کردەوە و فراوانی کردن، بڕیاری بنیاتنانی قەڵای قاهیرەی دا لە ساڵی ٥٧٢ز کە دواتر بە قەڵای سەلاحەدین ناسرا، و هەڵکەندنی بیری یوسف کە گەیشتە قوڵی ٨٥ مەتر، و لە ئیشەکانی تری سەلاحەدین بنیاتنانی پردێکی گەورە بوو لە جیزە تا هێڵێکی بەرگری دروست بکات بۆ پاراستن لە ئەگەری هێرشی ڕۆژئاوا.

سەلاحەدین مایەوە لە قاهیرە و سەرپەرشتی ئیشە بنیاتنانەوەکانی ئەکرد، هاوشان لەگەڵ بینا سەربازیەکاندا چەند خوێندنگەیەکی دامەزراند بۆ بڵاوکردنەوەی زانست، و خۆی بە دوای بەڕێوەبردنە ناوخۆییەکاندا ئەچوو، و گرنگی دا بە دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان کە یارمەتی خەڵکیان ئەدا و دژواریەکانی ژیانیان لێ کەم دەکردنەوە، و بەڵێنی بەخشینی دا بە هەژار و ڕێبوارەکان کە پەنایان ئەبردە بەر مزگەوت تیایدا بژین، و مزگەوتی ئەحمەد کوڕی تۆڵۆنی لە قاهیرە کرد بە شوێنێك بۆ ڕێبوارەکانی لە وڵاتەکانی مەغریبەوە ئەهاتن.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١١٧٧ز، خاچپەرستەکان هێرشیان کردە سەر کەنارەکانی دیمەشق، سەلاحەدین وای دانا کە ئاگربەست لەگەڵ شانشینی بەیتولموقەدەس کۆتایی

هاتووه بەم هێرشە، سوپای کۆکردەوە و ڕۆیشت بەرەو فەلەستین تا دەستبگرێت بەسەر هەندێك شوێنی خاچپەرستەکان، پاشان ڕۆیشت بەرەو عەسقەلان کە پێی ئەوترێت (بوکی شام)، و سەلاحەدین بەردەوام بوو غەزووی شوێنە دووەمیەکانی خاچپەرستەکانی یەك لە دوایەك کرد، هێرشی بردە سەر ڕامەڵە و لەد و گەیشتە دەروازەکانی قودس.

**شەڕ و ئاگربەست لەگەڵ بلدوینی چوارەم**

پاشای بەیتولموقەدیس، بلودینی چوارەم هێزەکانی کۆکردەوەو لە شاری غەزەوە چووە عەسقەلان، و کاتێك ئەم هەواڵە بە سەلاحەدین گەیشت، بە بەشێك لە سوپاکەیەوە هاتن بەرەو شارەکە و لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ١١٧٧ز خاچپەرستەکان هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەریان و شکاندنیان، دوای گەڕانەوەی بۆ میسر سەلاحەدین نەك ورەی نەڕوخا بەڵکو جارێکیتر هێزەکانی ڕێکخستەوە و هێزە ئەییوبییەکان لە نزیك حومس دابەزین، ولە ئابی ١١٧٨ز تاقمە خاچپەرستەکان هێرشیان کردە سەر حەما و هەندێك لە خەڵکەکانیان کوشت بەڵام شکێنران لەلایەن بەرگریکارانی شارەکەوە، سەلاحەدین ساڵێك لە شام مایەوە بێ ئەوەی جەنگی تر ڕوویدات، پاشان هەواڵی پێگەیشت کە خاچپەرستەکان پلان دادەنێن بۆ هێرش بردنە سەر سوریای ناوەڕاست، سەلاحەدین ئامادەسازی بۆ کرد و پلانی خۆی ڕێکخست، لە نیسانی ١١٧٩ز خاچپەرستەکان بەسەرکردایەتی بلدوینی چوارەم بەرەو دیمەشق ڕۆیشتن و چاوەڕێی بەرگریەکی لاوازیان ئەکرد، دەستیان کرد بە هێرشبردنە سەر بەرزاییەکانی جۆلان، یەکەیەکی هێزە ئەیوبیەکان ڕووبەڕویان بوونەوە پاشان پاشەکشەیان کرد لە بەردەمیاندا تا بێن بە دوایاندا بۆ باشوری ڕۆژهەڵاتی قنتیرە کە سوپای ئەییوبی چاوەڕێی ئەکردن، بەم شێوەیە شەڕ کەوتەوە و ئەییوبییەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و دوای ئەم سەرکەوتنە سەلاحەدین هیزەکانی زیاد کرد لە شام.

لە هاوینی ١١٧٩ز، بلدوینی چوارەم قەلایەکی سنوری بنیاتنا لەسەر ڕێگای دیمەشق پاشان ویستی پردێك بنیات بنێت لەسەر ڕووباری ئوردن (کە لە ئێستادا ناسراوە بە پردی کچەکانی یەعقوب) تا خاکەکانی خاچپەرستەکان ببەستێتەوە بە بانیاسەوە کە جیاکەرەوەیەك بوو لە نێوان میرنشینە خاچپەرستیەکان و خاکە ئیسلامیەکاندا، سەلاحەدین دژی ئەم پرۆژەیە وەستا و بە نیشێکی دوژمنکارانەی دانا بۆ سەر موسڵمانان، و ١٠٠،٠٠٠ پارچە ئاڵتونی دا بە بلدوین تا دەست لەم ئیشە هەڵگرێت، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە، لەبەرئەوە سەلاحەدین هێرشی کردە سەر قەڵا سنوریەکە و تێکیدا، پاشان بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت و بانیاسی کردە بنکەی خۆی، سوپای خاچپەرستەکان پەرتەوازە بوون، و سەلاحەدین لە

دووره‌وه ئاگای لێیان بوو تا کاتێك فرسه‌ت هاته به‌رده‌می و زانی سوپای خاچپه‌رستی هیلاك بوون، هه‌ردوولا به‌یه‌کیاندا و موسڵمانان سه‌رکه‌وتن، و زۆر له گه‌وره جه‌نگاوه‌ره‌کانی خاچپه‌رسته‌کان به‌دیل گیران پاشان سه‌لاحه‌دین به‌ره‌و قه‌لاکه ڕۆیشت گه‌مارۆی دا تاله ٣٠ی ئابی ١١٧٩ز فه‌تحیکرد و چووه ناویه‌وه.

له به‌هاری ١١٨٠ز سه‌لاحه‌دین خۆی ئاماده‌ئه‌کرد بۆ غه‌زووی به‌یتولموقه‌دیس، بلدوین داوای ئاشتی لێکرد، سه‌لاحه‌دین ڕازی بوو، ڕیمۆندی سێیه‌م له ته‌رابلس سه‌ره‌تا ڕه‌تیکرده‌وه به‌لام خێرا سه‌ری دانه‌واند بۆ ڕێکه‌وتن دوای ئه‌وه‌ی سوپای ئه‌یوبی هێرشیان کرده سه‌ر میرنشینه‌که‌ی و که‌شتیگه‌لی ئیسلامی ده‌رکه‌وت له به‌نده‌ری ته‌ڕتوس و هه‌ڕه‌شه‌ی هێرشیان لێئه‌کرد.

## کێشه ناوخۆییه‌کان

سه‌لاحه‌دین هه‌وڵیدا نێوان ئه‌میری حوسن کیفا، نوره‌دین محه‌مه‌د ئه‌رتقیونی و قه‌لج ئه‌رسه‌لانی سولتانی سه‌لجوقیه‌کانی ڕۆم یه‌کبخات، نوره‌دین ناوبژیوانی ئه‌ییوبی قبوڵ کرد پاشان قلج ئه‌رسه‌لانیش قبوڵی کرد و سه‌لاحه‌دین زۆر دڵخۆش بوو پێی به‌م یه‌ککرتنه‌ی خاکه ئیسلامیه‌کان پاشان دواتر ناکۆکی که‌وته نیوان نوره‌دین و قلج ئه‌رسه‌لان، سه‌لاحه‌دین هه‌ڕه‌شه‌ی له نوره‌دین کرد وتی خۆی ئه‌ڕوات بۆ مه‌ڵته‌یه‌ی پایته‌ختی نوره‌دین تا ده‌رسی دابدات و بۆ کۆتایی هێنان به ناکۆکی نێوان ئه‌م دوو فه‌رمانڕه‌وا موسڵمانه له کاتێکدا موسڵمانان ئه‌وپه‌ڕی پێویستیان به یه‌ککرتوویی هه‌بوو، له ڕاستیدا سه‌لاحه‌دین نه‌یئه‌ویست بچێت بۆی ته‌نها بۆ ئه‌وه‌بوو ملکه‌چی بکات و نوره‌دین که زانی ناتوانێت له‌به‌رامبه‌ر سوپای ئه‌ییوبی بوه‌ستێت، ملکه‌چ بوو بۆ فه‌رمانی سه‌لاحه‌دین، پاشان سه‌لاحه‌دین گه‌ڕایه‌وه قاهیره له ساڵی ١١٨١ز، که ئه‌یویست مانگی ڕه‌مه‌زان له میسر به‌سه‌رببه‌رێت، پاشان بڕوات بۆ حه‌ج به‌لام له‌به‌ر چه‌ند هۆکارێکی نادیار حه‌جه‌که نه‌کرا.

## فراوانبوونی ده‌وڵه‌ت

### فه‌تحی ده‌وروبه‌ری وڵاتی نێوان دوو ڕووبار

سه‌یفه‌دین غازی کۆچی دوایی کرد له ٢٨ی حوزه‌یرانی ١١٨٠ز، عیزه‌دینی برای میرنشینی موسڵی گرته ده‌ست، له ٤ی کانونی یه‌که‌می ١١٨١ز پاشا ساڵح کوڕی نوره‌دین زه‌نگی کۆچی دوایی کرد له حه‌له‌ب، کاتێك بێهیوا بوو له‌خۆی عیزه‌دین مه‌سعودی ئامۆزای دانا وه‌ك میری حه‌له‌ب به‌لام به‌ڕێوه‌بردنی حه‌له‌ب و موسڵ به‌یه‌که‌وه له سه‌روو توانای

عیزەدینەوە بوو، لەبەر ئەوە حەلەبی دا بە عیمادەدینی برای لە بەرامبەر سنجار و خاپور و ڕقە و نەسیبین و سروج و زۆر شوێنی تر، بەڵام سەلاحەین هەوڵی نەدا سوود لەو فرسەتانە وەربگرێت لەبەر ڕێزگرتنی بۆ ئەو پەیماننامەیەی پێشتر لەگەڵ زەنگیەکان بەستبووی.

لە ۱۱ی ئایاری ۱۱۸۲ز سەلاحەدین لە سەرکردایەتی نیوەی سوپای ئەییوبی و ژمارەیەك خۆبەخشدا دەرچوو لە قاهیرەوە بۆ شام، کاتێك زانی هێزە خاچپەرستەکان لەسەر سنوور کۆبوونەتەوە بۆ ڕێگرتن لێی ڕێگەی گۆڕی لە سیناوە بۆ ئەیلە، لێرەدا سەلاحەدین هیچ بەرگریەك نەکرا لەلایەن هێزەکانی بلدوین، گەیشتە دیمەشق پاشان هێرشیان برد بۆ دەستگرتن بەسەر بەیروتدا و سەلاحەدین سەرکردایەتی سوپاکەی ئەکرد لە دەشتی بیقاع، و کاتێك زانی هێرشەکە سەرکەوتن ناهێنێت، وەستاندی و خۆی کۆکردەوە بۆ ئیشەکەی لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبار.

موزەفەرەدین کوکبری یەکێك بوو لە میرەکانی حەڕان، بانگی سەلاحەدینی کرد تا وڵاتی جەزیرە بگرێت لەو کاتانە ئاگربەستی نێوان سەلاحەدین و زەنگیەکان کۆتایی پێ ئەهات لە کانونی یەکەمی ۱۱۸۲ز، پێش ئەوەی بڕوات بۆ وڵاتی جەزیرە کە کەوتۆتە باکوری وڵاتی نێوان دوو ڕووبار، گرژی نێوان زەنگیەکان لە زیادبووندا بوو، سەلاحەدین گەمارۆی حەلەبی دا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پاشان گەیشت بە قەڵای بیرە نزیك ڕووباری فوڕات، کوکبری و نورەدینی حوسن کیفا پێی گەیشتن و هیزە هاوبەشەکانیان شارەکانی جەزیرەکەیان یەك لە دوای یەك گرت، ڕەهایان گرت پاشان ڕقە و قرقیسیە و نەسیبین، سەلاحەدین بوو بە جێگەی خۆشەویستی خەڵکی شارەکە دوای ئەوەی زۆر لە باجەکانی لەسەر لابردن کاتێك وتی" ((خراپترین حاکمەکان ئەوانەن خۆیان قەڵەو ئەبن و نەتەوەکەیان برسیە)). پاشان غەزووی ماکسین و دورین و عرابان و خاپوری کرد.

**قەڵای حەلەب، لە ۱۲ی حوزەیرانی ۱۱۸۳ز سەلاحەدین چووە ناویەوە .**

**گرتنی حەلەب**

لە دوای موسڵ سەلاحەدین گرنگی دا بە گرتنی حەلەب، هێزی نارد بۆ گرتنی تەل خالد فەرمانڕەواکەی تەسلیم بوو لەگەڵ گەیشتنی سەلاحەدین خۆیدا، پاشان سەلاحەدین بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت بۆ گرتنی عینتاب پاشان بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای حەلەب، عیمادەدینی میری حەلەب زۆر بەرگری نەکرد لەبەرئەوەی جەماوەری نەبوو لە ناو خەڵکەکەدا و حەزی بە گەڕانەوە ئەکرد بۆ سنجار ئەو شارەی پێشتر بەڕێوەی ئەبرد، وتووێژی کرد لەگەڵ

سەلاحەدین کە حەلەب ئەدات بە دەستەوە لە بەرامبەر ئەوەی سنجار ونەسیبین و ڕقە و سروجی بگەڕێننەوە بۆی هەروەها هێزە زەنگیەکان لە ڕیزی سوپای سەلاحەدیندا ئەوەستن. بەم ڕێکەوتنە لە ۱۲ی حوزەیرانی ۱۱۸۳ حەلەب هاتە ژێر دەستی ئەییوبیەکانەوە، سەلاحەدینی دادگای حەنەفی گۆڕی بۆ شافعی، لەگەڵ ئەوەی چەند پێویستی بە پارە بوو ڕێگەی دا بە زەنگی چەند ئەتوانێت لە خەزێنەکانیان ببات و ئەوەی مایەوە بۆ سەلاحەدین.

**لە پێناوی موسڵدا**

لەگەڵ نزیکبوونەوەی سەلاحەدین لە موسڵ، زەنگیەکانی موسڵ پەنایان گرت بە خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا، ئەویش یەکێکە لە کەسایەتیە ئاینیە گەورەکانی نارد تا بکەوێتە نێوانیان، سەلاحەدین گەیشتە شارەکە لە ۱۰ی تشرینی دووەمی ۱۱۸۲ز، و عیزەدین مەرجەکانی قبوڵ نەکرد، لەبەرئەوە سەلاحەدین گەمارۆی شارەکەی دا، دوای چەند پیاهەڵپژانێك لە بەردەم خەلیفەدا، سەلاحەدین بڕیاری کشانەوەی دا لەبەرئەوە بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر سنجار کە ئەمیرەکەی برای عیزەدین بوو، و هێزی بە جێهێشت بۆ بەردەوام بوونی گەمارۆ، سنجاری گرت دوای گەمارۆدانی ۱۵ ڕۆژ لە ۳۰ی کانونی یەکەمی ۱۱۸۲ز، پاشان سەلاحەدین هەموو هێزەکانی کۆکردەوە و کاتێك عیزەدین بە هاتنی سوپاکەی سەلاحەدینی زانی، ناردی بۆ لای و داوای ئاشتی کرد. لە ۲ی ئازاری ۱۱۸۳، عادل لە میسر نووسی بۆ سەلاحەدین کە خاچپەرستەکان لە وڵاتی ئیسلامیان داوە کەشتیەکیان ناردووە لە کەنداوی عەقەبەوە بۆ تێکدانی شار و گوندەکانی کەناری دەریای سوور، وا باس دەکرێت کە خاچپەرستەکان کەشتی موسڵمانانیان سوتاندبوو و هێرشیان کردبووە سەر کاروانی حەج، و هەروەها ویستبوویان هێرش بکەنە سەر مەدینە و گۆڕی پێغەمبەر محەمەد تێکبدەن، بەڵام موسڵمانان ڕووبەڕوویان بوونەوە لە کەشتیگەلەکانی دەریای سووردا و تێکیان شکاندن، و سەلاحەدین بڕیاری کوشتنی دیلەکانی خاچپەرستەکانی دا کە ژمارەیان لە ۱۷۰ جەنگاوەر زیاتر بوو.

دواتر هەندێك لە سوپاکەی سەلاحەدین بڵاوەیان لێکرد و گەڕانەوە، عیزەدینی میری موسڵ ئەمەی بە فرسەت زانی و ویستی هێرش بکاتە سەر هێزەکانی سەلاحەدین، لە سەرەتای نیساندا سەلاحەدین بە هێزەکەیەوە چووە پێشەوە و ئامەدیان گرت پاشان سەلاحەدین ناردی بۆ لای خەلیفەی عەبباسی و داوای لێکرد حەقی بداتێ بۆ گرتنی موسڵ.

## شەڕ دژی خاچپەرستەکان

دوای ئەوەی سەلاحەدین سەرکەوت لە کۆکردنەوەی میسر و سوریا و ڕۆژئاوای نیمچەدوورگەی عەرەبی و عێراق لە یەك دەوڵەتی ئیسلامی یەکگرتوودا دەوری شانشینی بەیتولموقەدیس و میرنشینە خاچپەرستەکانی دابوو لە باکوور و ڕۆژهەڵات و باشوورەوە، و دڵنیا بوو لە یەکڕیزی و تۆکمەیی دەوڵەتەکەی، دەستیکرد بە بەدیهێنانی بەشی دووەمی پلانەکەی کە دژایەتی خاچپەرستەکان و دەرکردنیان بوو لە وڵاتدا، فرسەتی هاتە بەردەم کاتێك ئەرنات ئال شاتیۆن خاوەنی کرك دوای ئەوەی کاروانێکی گرت و ماڵ و چەکەکانی تاڵان کردن، سەلاحەدین لۆمەی کرد و داوای لێکرد کە دیلەکان ئازادبکات و ماڵەکەیان بۆ بگێڕێتەوە، کاتێك ئەرنات ڕەتی کردەوە، سەلاحەدین ئەو کاتە لە دیمەشق بوو هەموو سەربازەکانی کۆکردەوە و ڕۆیشت بەرەو ئوردن، لە ٢٩ی ئەیلولی ١١٨٣، لە ڕووباری ئوردن پەڕییەوە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر بیسان کە بینی چۆڵ بوو، پاشان لایاندا بەرەو ڕۆژئاوا، تا ڕێگە لە هێزە خاچپەرستەکان بگرن قەڵاکانی کرك و شوبکیان گرت لە سەر ڕێگەی نابلس و چەند کەسێکیان بە دیل لێگرتن، لەو کاتانەدا هێزە خاچپەرستەکان خۆیان کۆکردەوە کە گەورەترین هێز بوو شانشین لە هەموو شتەومەکەکانی کۆیکردبووەوە، بەڵام هێشتا کەمتر بوو لە هێزی موسڵمانان، ئەییوبییەکان بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کشانەوە بۆ عەین جالوت لەگەڵ بوونی چەند هێزێکی ئەییوبی، لەگەڵ ئەمەشدا هێرشە خاچپەرستیەکان سەلاحەدینی توڕەکرد، ئەرنات ئال شاتیون بەردەوام بوو لە هێرش کردنە سەر کاروانە بازرگانیە موسڵمانەکان و ڕێگەی حەج بە کەشتیگەل لە دەریای سووردا، بۆ ئەمەش سەلاحەدین کەشتیگەلێکی دامەزراند کە لە ٣٠ کەشتی پێك هاتبوو بۆ هێرش کردنە سەر بەیروت لە ساڵی ١١٨٢ز، ڕیناڵد هەڕەشەی هێرشکردنە سەر شارە ئیسلامیە پیرۆزەکانی مەککە و مەدینەی ئەکرد، کە سەلاحەدین وەڵامی ئەمەی دایەوە بە گەمارۆدانی قەڵای کرك دووجار لە ساڵی ١١٨٣ و ١١٨٤، و ڕیناڵد وەڵامی دایەوە بە تاڵانکردنی کاروانێکی حەج ساڵی ١١٨٥،، پاشان سەلاحەدین گەڕایەوە بۆ هێرشکردنە سەر عیزەدینی میری موسڵ، بەڵام عیزەدین هاوپەیمانی بەست لەگەڵ ئازەربایجان و شانشینی شاخدا کە ئەمانەش هاوکات بوو لەگەڵ نەخۆشی سەلاحەدیندا لەبەر ئەوە لە ئازاری ١١٨٦ز ڕێکەوتنی ئاشتی لەگەڵ بەستن.

**شەڕی حەتین**

نەخۆشیەکەی پاشا بلدوینی چوارەم زیادی کرد و لە ساڵی ١١٨٥ز کۆچی دوایی کرد و بلدوینی پێنجەم لە جێگەی دانرا، ئەمیش ساڵێکی نەبرد کۆچی دوایی کرد و سیبێلای دایکی دەسەڵاتی گرتە دەست، کە ئەمیش گی ئال لۆزینیانی دەست نیشانکرد بۆ پاشایەتی، لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵاتی گی، جیابوونەوە کەوتە ڕیزی خاچپەرستەکان و فراوان بوون، ژمارەیەك لە فەرمانڕەواکان ناڕازی بوون لە وەرگرتنی دەسەڵاتی گی لەوانە ریمۆندی سێیەم خاوەنی تەرابلس کە ئەمە وایلێکرد بنێرێت بۆ لای سەلاحەدین و لەگەڵی رێبکەوێت کە دژایەتی نەکات و شمشێری لێ بەرز نەکاتەوە، سەلاحەدین ڕۆیشت و لە نزیك تەبریا دابەزی، و خاوەنی تەرابلس دای بە دەستەوە، کە پاشای فەرەنجیەکان ئەمەی بیست هەموو سەربازەکانی کۆکردەوە بۆ ڕووبەڕوونەوەی سەلاحەدین و خاوەنی تەرابلسیش چووە ریزی فەرەنجیەکان بۆئەوەی ئیشەکەی خۆ دابپۆشێت.

**سوڵتان سەلاحەدین ئەرنات لەناو دەبات بە دەستی خۆی**

لە ٢٥ تەموزی ١١٨٧ز، خاچپەرستەکان لە نزیك شاخی حەتین دابەزین، بەڵام سەلاحەدین پێشیان کەوت بۆ ئەوێ و سوپاکەی کۆکردەوە لە بەرزاییەکانیدا لەو شوێنەی ئاوەکە هەڵئەقوڵێت، و ئامادەسازییە جەنگییە قورسەکانی فەرەنجیەکان هۆکاری دواکەوتنیان بوو، کە گەیشتن هیلاك بوون لە تینوودا، پەلاماری هێزی سەلاحەدینیان دا و ژمارەیەك لە هەردوو لا کوژران، و لە سەرەتادا خاچپەرستەکان زۆر بە حەماس بوون بۆ بەدەستهێنانی ئاو، لە سەرەتای ڕۆژەکە سەرکەوتن بەڵام لە کۆتایی ڕۆژەکەدا ئەیوبییەکان پەرتەوازەیان کردن، و شەڕەکە چەند کاتژمێرێك بەردەوام بوو، خاچپەرستەکان زیانێکی گەورەیان لێکەوت زۆربەی سەربازە لاوەکانیان لە دەستدا و شا غی ئال لوزینیان و براکەی و ئەرناتی خاوەنی کرك و زۆر لە گەورە خاچپەرستەکانی تر بە دیل گیران، بەڵام ڕیمۆندی سێیەم ڕۆیشت بەرەو شاری سور و تیایدا مایەوە.

لە دوای ئەم سەرکەوتنە سەلاحەدین دانیشت لە خێمەکەی و فەرمانی کرد بە ئامادەبوونی شاغی و براکەی و ئەرنات، خواردن و خواردنەوەی بۆ دانان، بەڵام سەلاحەدین سوێندی خواردبوو کە ئەرنات بکوژێت لەبەر ئەوەی زۆری لە موسڵمانان کوشتبوو، داو ئەوەی فەرمانی کرد بە ئامادەکردنی ئەرنات و داوای لێکرد موسڵمان بێت، ئەو ڕەتی کردووە و سوکایەتی بە پێغەمبەر (د.خ) کرد، سەلاحەدین شمشێرەکەی لێبەرزکردەوە و کوشتی،

سەربازەکانی مەیتەکەیان هێنایە دەرەوە و فڕیان دایە بەردەم دەرگای خێمەکە کاتێک شاغی بینی ڕەنگی تێکچوو و وای ئەزانی کە ئەویش وای لێئەکرێت، بەڵام سەلاحەدین پێی وت کە ئەرنات زۆر هەڵەی کردووە بەرامبەر موسڵمانان و ئازاری داون لەبەرئەوە وایلێکردووە، پاشان داوای ئامادەکردنی خێمەیەکی کرد بۆ شا و براکەی و پاسەوانی بۆ دانان، و ناردنی بۆ دیمەشق هەتا تەواوبوونی شەڕ و فەتحی قودس.

**ئازادکردنی کەنارەکانی شام**

سەلاحەدین وای ئەبینی کە ڕاستەوخۆ نەڕوات بۆ فەتحی قودس لە دوای سەرکەوتنی حەتین، وای باشتر ئەبینی کە بڕوات بۆ فەتحی شارە کەنارییەکان و پاشان هێرش بکاتە سەر قودس، ڕۆیشت بۆ گرتنی عەککا و دیلە موسڵمانەکانی لەوێ ئازاد کرد کە زیاتر لە ٤ هەزار کەس بوون، دەستی گرت بەسەر هەموو شتومەك و ئازوقە و ماڵەکانیدا لەبەرئەوەی بەندەرێکی بازرگانی سەرەکی خاچپەرستەکان بوو و پەنجەرەیان بوو لەسەر وڵاتی دایکیان لە ئەورووپا، پاشان سەربازە ئەیوبییەکان بلاوبوونەوە لە کەنارەکەدا قەڵا و کەلو و شوێنگەکانیان ئەگرت، فەتحی نابلس و حەیفا و ناسرە و قیساریە و سەفوریەیان کرد، دوای ئەوەی چۆڵکرابوو لە پیاوان بە هۆی جەنگانیان لە خاکەکانی شەڕدا یان گیرابوون بە دیل یان ڕایانکردبوو لە بەردەم هێزی ئەیوبی دوای ئەوەی ژمارەیان کەم بووبوو. کاتێك بنکەکانی عەککا جێگیر بوون، سەلاحەدین ماڵەکەی دابەشکرد بەسەر خەڵکەکەدا، هەندێك لە سەرکردە خاچپەرستەکانی هێشتەوە و هەندێك لە سەربازەکانی ئازادکردپاشان ڕۆیشت بۆ گرتنی قەڵای تەبنین دوای گەمارۆدان دەستی بەسەراگرت و دوای ئەوە ڕۆیشت سەیدای گرت.

پاشان ڕۆیشت بۆ فەتحی بەیروت و دوای حەوت ڕۆژ گەمارۆدان چووە ناویەوە، هەر لە هەمان کاتدا ئەیوبییەکان جوبەیلیان گێڕایەوە پاشان رۆیشت بۆ فەتحی عەسقەلان و لەڕێگەدا زۆر شوێنی گرت وەك ڕامەڵە و دراوم، و لە عەسقەلان مەنجەنیقی دامەزراند و گەمارۆی دا تا خۆیاندا بەدەستەوە پاشان غەزە و بەیت جەبرین و نەترون بە بێ کوشتار خۆیان دا بە دەستەوە، بەم شێوەیە سەلاحەدین زۆربەی کەنارەکانی شامی گێڕایەوە تەنها هەردوو شاری تەرابلس و سوڕ و بەشێك لە میرنشینی ئەنتاکیە نەبێت.

**فەتحی قودس**

**گەمارۆدانی قودس لە لایەن سەلاحەدینەوە**

سەلاحەدین لە قودس مایەوە تا هەموو کاروبارەکانی ڕێکخست و پاشان ڕۆیشت بەرەو قودس بۆ فەتحکردنی، و گەیشت لە ٢٠ی ئەیلولی ١١٨٧ز، لەلای عەین سەلوانەوە تا ئاو نزیك بێت لە سوپاکەیەوە و لە شارەکەدا هێزێکی گەورە نەبوو بۆ بەرگری نزیکەی ١٤٠٠ سەرباز بوون، ئەوانەی تر خەڵکی هەژاری شارەکە بوون کە هیچ لە شەڕ و کوشتار نازانن. بالیان کوڕی بارزان یەکێك لە سوارچاکەکانی فەڕەنجیەکان بوو و کاروبارەکانی گرتبووە دەست دوای ئەوەی شا غی بەجێی هێشتبوو، و بالیان خاوەنی شاری ڕامەڵە بوو پێشتر. سەرکردایەتی شەڕەکەی کرد و لێهاتووبوو لە بەڕێوەبردنی کوشتاردا، و ئەترسا لەوەی موسڵمانان هەموو مەسیحی شارەکە بکوژن وەك ئەوەی خۆیان پێش زیاتر لە سەدەیەك کردیان لە کاتی گرتنی شارەکە، و داوای لە خەڵك کرد کە بەرگری لە خۆیان بکەن و کاتێك سەلاحەدین داوای لێکرد خۆی بدات بە دەستەوە نەیکرد و سووربوو لەسەر کوشتار و شەڕ ١٤ ڕۆژ بەردەوام بوو.

سەلاحەدین کە بینی شەڕەکە قورس ئەبێت، یوسف بەتیت کە یەێك بوو لە پیاوە ئەرسەدۆکسیە پیرۆزەکان، ڕایسپارد وەك نوێنەر تا مەسیحیە عەرەب و ڕۆمەکان دڵنیا بکات و بەڵێنیان پێ بدات کە سەلاحەدین لێیان خۆشدەبێت ئەگەر یارمەتی فەڕنجیەکان نەدەن، ئەوانەی سەلاحەدین نەیئەویست لێیان خۆش بێت ئەگەر شارەکەی فەتحکرد هەڕەشەیان ئەکرد بە کوشتنی دیلە موسڵمانەکان کە ٤٠٠٠ کەس بوون و هەڕەشەی ڕوخانی شوێنە پیرۆزە ئیسلامیەکانیان ئەکرد یان قوبە سەخرە و مزگەتی قبلا کە مزگەوتی ئەقسا پێك دەهێنن، ئەگەر سەلاحەدین لێیان خۆش نەبێت.

**بالیان کوڕی بارزان قودس تەسلیمی سەلاحەدین ئەکات**

سەلاحەدین ڕاوێژی بە مەجلیسەکەی کرد و مەرجەکانی قبوڵ کرد بە مەرجێك فدیە بدەن بۆ هەر پیاوێك ١٠ دینار و ژنان ٥ دینار و کچ و کوڕان ٢ دینار، ئەوەی لە ماوەی ٤٠ ڕۆژدا بیدات سەربەست دەبێت، ئەوەی نەیتوانی لەو ماوەیەدا بیدات پێویستە بڕوات لە شارەکە، لە شەوی میعراج لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١١٨٧ز سەلاحەدین چووە قودسەوە، و ڕێگەیدا بە یەهود تا بگەڕێنەوە شارەکە، و کەنیسەی قیامەی داخست بە ڕووی فەڕەنجیەکاندا لە دوای فەتحی شارەکە، و فەرمانی کرد بە چاکسازی میحرابی عومەری دێرین و لابردنی ئاسەوارە مەسیحیەکان لە مزگەوتی ئەقسا وەك ئەو خاچەی فەڕەنجیەکان بەرزیان کردبوویەوە لەسەر مزگەوتەکە، و بەردە پیرۆزەکایان بە ئاوی گوڵ پاککردەوە و ومزگەوتەکەیان ڕێکخستەوە و کردی بە خوێندنگەیەك بۆ زاناکانی شافعی، پاشان گەڕایەوە کەنیسەکەی کردەوە.

موسڵمانان زۆر دڵخۆش بوون بە گەڕانەوەی قودس بۆ سەر زەوییە ئیسلامیەکان، و خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون تا سڵاو لە سوڵتان سەلاحەدین بکەن و هەروەك یەکێك لە شاعیرە گەورەکان بە قەسیدەیکی گەورە پیرۆزبایی و دەست خۆشی ئەو فەتحەی لێکرد.

**گەمارۆی سوڕ و عەککا**

زۆربەی حاکمە فەڕەنجیەکان ڕۆیشتن بۆ شارە بەسەنگەر بەندکراوەکانی وەك ئەنتاکیە و سوڕ کە هێشتا بە دەست خاچپەرستەکانەوە بوون، سوڕ یەکێك لە پاشاکانی ئەورووپا، کونوارد مەرکیز مۆنفیراتۆ حوکمی ئەکرد و هەروەك سوڕ گرنگیەکی ستراتیژی زیاتری هەبوو لە قودس، لەبەرئەوە وا گومانیان ئەبرد یەکەمجار فەتحی ئەویَ بکرێت، بەڵام سوڵتان سەلاحەدین بۆ بەرزکردنەوە ورەی موسڵمانان لە پێشدا قودسی گێڕایەوە، پاشان ڕوویکردە قەڵای سەفد و ۷ مانگ گەمارۆیدا تا ناچاری کردن قەڵاکە بدەن بەدەستەوە، سەربازە فرەنجیەکان ڕۆیشتن بۆ سوڕ، بەم شێوەیە هێزە فەڕەنجیەکان لە سوڕ بەهێز بوون تا توانیان ساڵێك لە بەردەم سەلاحەدیندا بوەستن، مەرکیز بە بەردەوامی پێداویستیەکانی شارەکەی دابین ئەکرد لە ڕۆژانی گەمارۆداندا، تا سوڵتان بیَ ئومێد بوو گەمارۆی لەسەر لابرد بە ئومێدی ئەوەی لە فرسەتێکی داهاتوودا فەتحی بکات، لە ساڵی ۱۱۸۸ز شا غی لوزینیانی ئازادکرد. ڕۆیشتن تا لە تەڕابلس بژین پاشان ڕۆیشتن بۆ ئەنتاکیا پێش ئەوەی بڕیار بدەن بڕۆن بۆ سوڕ، بەڵام مەرکیز ڕێگەی پێنەدان لەبەرئەوە دانی نەئەنا بە شەرعیەتی شاغی.

دوای ئەوەی سەلاحەدین لە سەفەد ڕۆیشت بەردەوام بوو لە فەتحی شار و قەڵاکان، فەتحی جەبلە و لازقیە و قەڵای سەهیون و بکاس و شەغر و سەرمینیە و بەرزیە و دەرب ساك و کرك و کەوکەبی کرد، بوهمەندی سێیەم خاوەنی ئەنتاکیە هەوڵیدا لەگەڵ سەلاحەدین ڕێبکەوێت بۆ ماوەی هەشت مانگ، سەلاحەدین قبوڵی کرد بە مەرجێك دیلە موسڵمانەکان بەربدات، دوای ئەوەی فەڕەنجیەکان لە سوڕ کۆبوونەوە، هەندێك لە ڕوهبان و قەسیسەکانیان هەستان بە هاندانی خەڵکەکە لەبەر لە دەستدانی بەیتولموقەدیس، ویستیان هێرش بکەنە سەر عەککا، هێزەکانیان کۆکردەوە و گەمارۆیان دا لە دەریا و وشکنیەوە لە ۲۸ی ئابی ۱۱۸۹ز، پارێزەرانی شارەکە داوای یارمەتیان لە سەلاحەدین کرد، ناردی بۆ هاوپەیمانەکانی داوای لێکردن خێرا فریای شارەکە بکەون، سەربازەکانی موسڵ و ئامەد و سنجار و شوێنەکانی تری وڵاتی جەزیرە و حەڕان و ڕەها هاتن بەدەم داواکەیەوە، هەروەك پاشا عادلی برای هات بە دەم داواکەوە سەربازە میسریەکان و کەشتیگەلی میسری بۆ نارد، بەم شێوەیە شەڕی گەرە کەوتەوە لە نێوانیاندا بیَ ئەوەی هیچ لایەکیان سەربکەون.

## هەڵمەتی خاچپەرستی سێیەم

شەری حەتین و فەتحی قودس دوو هۆکاری سەرەکی بوون بۆ هەڵمەتی خاچپەرستی سێیەم، پاپا گریگۆری هەشتەم هانی پاشاکانی ئەورووپای دا بۆ بردنی هەڵمەتێکی خاچپەرستی نوێ بۆ گێرانەوەی بەیتولمەقەدیس، ئەوەی یەکەم کەس بە دەنگ داواکەوە هات ئیمپراتۆری ئەڵمانی فریدریش بربروسا ئیمپراتۆری ڕۆمانی بوو، کە بە سوپاکەیەوە هات لە مەجەڕ و رۆمانیاوە تا گەیشتە قوستەنتینیە، کە ئیمپراتۆرەکەی ئیسحاقی دووەم بە نهێنی لەگەڵ سوڵتان سەلاحەدین ڕێکەوتبوو، کە هیچ کامیان ڕێگە بە هیچ هێزێك نەدەن هەڕەشە لە خاکی ئەویتریان بکات، بەڵام نەیتوانی ڕێگە لە سوپای ئەریدریك بگرێت لەبەر زۆری ژمارەیان، بەڵام ڕێگەی نەدا بەوەی کەرەستەی چەکیان بۆ دابینبکرێت، فریدریش ناردی بۆ لای سوڵتانی سەلجوقی ڕۆمی، قلج ئەرسەلان تا بە خاکەکانیاندا تێپەڕ ببێت، ئەویش ڕێگەی دا لە هەمان کاتدا نامەی پۆزشی نارد بۆ سەلاحەدین و وتی نەیتوانیووە ڕێگەیان لێبگرێت، سەلاحەدین ئاگادار کرا لە کاتێکدا گەمارۆی عەککای ئەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا هەڵمەتەکەی فریدریش شکستی خوارد لەوەی بگاتە ڕۆژهەلات، لەبەر دووری ماوەکە و هاتنی زستان و کەمی کەرەستە و بەرگری هەندێك لە ئەمیری ناوچەکان، بەتایبەت دوای ئەوەی ئیمپراتۆری ڕۆم، ئیسحاقی دووەم ڕێگەی کرد لەوەی کەرەستەیان بۆ دابین بکرێت، لەگەڵ نوقمبوونی فریدریش خۆی لە یەکێك لە ڕووبارەکاندا لە نزیك ئەنتاکیە، و ئەو ناکۆکیانەی بەجێما لە دوای بۆ جێگەگرتنەوەی، شکست هێنانی ئەم هەڵمەتە وەك مژدەیەك بوو بۆ سەربازگە موسڵمانەکانی بەرگریان لە عەککا ئەکرد.

هەڵمەتەکە لێرەدا نەوەستا، بەڵکو دووان لە پاشا گەورەکانی تری ئەورووپا هاتن بە دەنگیەوە کە ئەوانیش ریچاردی یەکەم (دڵی شێر) پاشای ئینگلتەرا و فیلیپ ئۆگستەس پاشای فەڕەنسا بوون، ریچارد سێ هەزار بەندی موسڵمانی کوشت کە ژن و منداڵیان لە نێودا بوو، سەلاحەدین وەڵامی دایەوە بە کوشتنی هەموو ئەو فەڕەنجیانەی لە نێوان ۲۸ ئاب و ۱۰ی ئەیلولدا گرتبوونی، لە ۷ی ئەیلولی ۱۱۹۱ز، سوپای سەلاحەدین و خاچپەرستەکان دایان بەیەکدا لە شەری ئەرسوف کە سەلاحەدین شکا، بەڵام خاچپەرستەکان نەیانتوانی بڕۆنە ناوەوە و لە کەنارەکەدا مانەوە، و شەڕ مایەوە لە نێوان هەردوولادا، و هەموو هەوڵی فەڕنجەکان بۆ گرتنی قودس شکستی هێنا.

دوای ئەوە هەردوولا ڕێکەوتن لە ١ی ئەیلولی ١١٩٢ کە بە ڕێکەوتنی ڕەملا ناسراوە بۆ ماوەی سێ ساڵ و هەشت مانگ بەردەوام بێت، کە بە پێی ئەمە شانشینی خاچپەرستی تەنها لە یافا و سور دەبێت، قودس لە دەستی موسڵمانان دەبێت بەڵام ڕێگە بە حەجی مەسیحیەکان ئەدەن، لەو کاتانە پەیوەندی سەلاحەدین لەگەڵ ریچاردا ڕیزلێنانی لە خۆ ئەگرت و دوور بوو لە ڕکەبەری سەربازی، و کاتێك ڕێکەوتنەکە کرا سەلاحەدین ڕۆیشت بۆ قودس دیوارەکانی سەنگەربەند کرد، خوێندنگە و نەخۆشخانەی تیا دامەزراند، مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٥٨٨ك لەوێ بەسەر برد پاشان ڕۆیشت بۆ دیمەشق و دوایین ڕۆژەکانی لەوێ بەسەر برد.

## کۆچی دوایی

ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ شا ریچارد و پەیماننامەی ڕامڵە دوایین ئیشی سەلاحەدین بوون، لە دوای ڕۆیشتنی ریچارد بە ماوەیەکی کەم سەلاحەدین توشی نەخۆشی بوو لە ٢٠ی شوباتی ١١٩٣ز، وردە وردە نەخۆشیەکی زیادی کرد تا کۆچی دوایی کرد لە ٣ی ئازاری ١١٩٣ز، بە مردنی موسڵمانان کۆبوونەوە بە تایبەت دیمەشقیەکان زۆری بۆ ئەگریان، نوێژیان لەسەر کرد و زۆر بەداخ بوون بۆی تەنانەت فەرەنجیەکان بەداخ بوون، نێژرا دوای نوێژی عەسری هەمان ڕۆژ لە نزیك مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق لەلای پاشا نورەدین زەنگیەوە، و کاتێك خەزێنە تایبەتەکانی کرایەوە بینرا ماڵی تەواوی تیا نیە بۆ بەڕێکردنی جەنازەکەی، و هیچ ماڵ و موڵکێکی بەجێ نەهێشت و زۆربەی لە خێردا بەخشیبوو.

## دەوڵەتی ئەیوبی لە دوای سەلاحەدین

سەلاحەدین پێش مردنی دەوڵەتەکەی دابەش کرد لە نیوان کوڕەکانی و ئەندامانی خێزانەکەی، میرنشینی دیمەشقی دا بە ئەفزەڵ نورەدین عەلی کوڕە گەورەی و وەسیەتی بۆ کرد بە دەسەڵات، میسری دا بە عەزیز عوسمانی کوڕی، حەلەبی دا بە زاهیر غازی غەیاسەدینی کوڕی، کرك و شوبك و وڵاتی جعبر و چەند شارێکی تری لای فوراتی بە جێهێشت بۆ عادلی برای، حەمای دا بە کوڕی براکەی محەمەد کوڕی تەقیەدین عومەر، و حومس و ڕەحبە و ئەوانی تری دا بە حەفیدی شێرکۆی مامی، یەمەنیش بە زوهەیرەدینی برای، بەڵام ناکۆکی نیوان کوڕەکانی سەلاحەدین وایکرد کە عادلی مامیان لایبردن و دەوڵەتی ئەیوبی یەکخست لە ژێر ئاڵاکەیدا، وەك ئەوەی سەلاحەدین پێشتر کردی، عادل خاکەکانی دابەشکرد لە نیوان کوڕەکانیدا و هێشتا لە ژیاندا مابوو، بەڵام ئەم برایانە بوو بە ناکۆکیان

دوای مردنی باوکیان، لەگەڵ ئەوەی کە خاچپەرستەکان سودمەند ئەبوون لەم ناکۆکیانە. منداڵەکانیشیان لە دوای خۆیان بە هەمان شێوە بوون هەتا (ساڵح ئەیوب) حەفیدی عادل دەرکەوت، جارێکی تر دەوڵەتی سەلاحەدینی لە ژێر ئاڵای خۆیدا یەکخست، لە دوای مردنی ساڵح ئەیوب تۆران شای کوڕی دەسەلاتی گرتە دەست، بەلام مەمالیکەکانی گەلەکۆمەیان لێکرد و کوشتیان بەمەش دەوڵەتی ئەییوبی کۆتایی پێهات و دەوڵەتی مەمالیکەکان دامەزرا.

**لە ڕۆژهەلاتدا**

لەگەڵ ئەوەی ئەو دەوڵەتەی سەلاحەدین بنیاتی نا زۆر نەمایەوە، بەلام سەلاحەدین لە وشیاری ئیسلامیدا بە ئازادکەری قودس ئەژمێررێت، لەگەڵ بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوەیی عەرەبی لە سەدەی بیستدا، و لەگەڵ بوونی ناکۆکی عەرەبی ئیسرائیلی. پاڵەوانیتی و سەرکردایەتی سەلاحەدین گرنگیەکی نوێی بە دەست هێنا لە ئازادکرنیدا بۆ قودس لە دەستی خاچپەرستەکان سەرچاوەیەکی ئیلهامە بۆ ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی نوێ دژی سەهیۆنیەت، هەروەها دروشم و کەسایەتی سەلاحەدین دانراوە لە پرۆگرامی خوێندنی دەوڵەتە عەرەبیەکاندا، هەروەك هەزاران کتێب لەسەر ژیانی دانراون، و شانۆ و دراما و نواندنی لەسەر کراوە.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، سەیری یەکڕیزی جیهانی عەرەبی لە ژێر ئاڵای سەلاحەدین ئەکرێت وەك هێمایەك بۆ یەکڕیزیەکی نوێ کە نەتەوەییە عەرەبە تازەکان هەوڵیان بۆ ئەدا، بە سەرکردایەتی جەمال عەبدول ناسر، لەبەر ئەوە دروشمی سەلاحەدین بوو بە دروشمی شۆڕشی میسر، پاشان بوو بە دروشمی چەند دەوڵەتێکی تر وەك عێراق و فەلەستین و یەمەن و سوریا، لە عێراقدا شارێك بە ناوی سەلاحەدینەوە ناونراوە هەروەها زانکۆی سەلاحەدین لە شاری هەولێر بەناوی ئەوەوە ناونراوە. ژمارەیەکی کەم بینا ماونەتەوە تا ئێستا کە لە سەردەمی سەلاحەدین دروستکراون لە ناو شارە نوێکاندا، سەلاحەدین یەکەم کەس بوو قەلای قاهیرەی دامەزراند هەروەها قەلای سەربازی دروستکرد لە سینا کە ئەڕوانێت بەسەر ڕێگەی ئەو کاروانانەی میسر بە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە ئەبەستن، زۆر لە موسڵمانان منداڵەکانیان ناوئەنێن (سەلاحەدین) بە ناوی ئەم سەرکردەیەوە، لە کاتێکدا ئەم ناوە وەك نازناوێك بە سوڵتان ئەیوبی درا دوای ئەوەی دەوڵەتی فاتیمی ڕوخاند و جەنگا لەگەڵ خاچپەرستەکان.

**لە ڕۆژئاوادا**

لەگەڵ ئەوەی سەلاحەدین دوژمنیان بوو بەڵام لە وشیاری ئەوروپیدا وەك نمونەی سوارچاكێكی جوامێر ماوەتەوە كە هەموو ڕەوشتەكانی سوارچاكی تیایە بە تێگەیشتنی ئەوروپی، تەنانەت داستانێكی شیعری هەیە لە سەدەی چواردەدا وەسفی پاڵەوانتیەكانی سەلاحەدین ئەكات، لەگەڵ ئەو كوشتارگەیەی خاچپەرستەكان كردیان لە دژی موسڵمانان دوای ئەوەی قودسیان داگیر كرد ساڵی ١٠٩٩ز، سەلاحەدین لە مەسیحیە ڕۆژئاواییەكان خۆشبوو ڕێگەی دان بڕۆن، لەگەڵ ئەوەی ئەیانتوانی ئەو فدیەیە بدەن كە لەسەریان دانرابوو، هەروەك مامەڵەی جوانی ئەرسەدۆكسیەكانی ئەكرد لەبەر ئەوەی ئەوان لە دژی غەزوی ئەوروپی خاچپەرستی بوون.

لەگەڵ جیاوازی بیروباوەڕیاندا سەركردە مەسیحیەكان ستایشی سەلاحەدینیان كردووە، بەتایبەت ڕیچارد دڵی شێر، وتویەتی" سەركردەیەكی مەزنە، بە بێ شك مەزنترین و بەهێزترین سەركردەیە لە جیهانی ئیسلامیدا، سەلاحەدینیش لە وەڵامدا وتویەتی هیچ سەركردەیەكی مەسیحی نیە لە ڕیچارد ئەشرەفتر بێت، و لە دوای ڕێكەوتننامەی ڕامڵە، سەلاحەدین و ڕیچارد دیاریان گۆڕیوەتەوە وەك هێمایەك بۆ ئەو ڕێزەی بۆ یەكتر هەیانبووە لەگەڵ ئەوەی یەكتریان نەبینیبوو ڕووبەڕوو.

مێژونوسە ئەوروپییەكان دەربارەی ئەڵێن" (ڕێز ودانایی و لەسەرخۆییەكەی و پاكی و لیبرالیەتیەكەی بوو كە وەك ئیلهامێك بووە بۆ مێژنووسە كۆنەكانمان، ئەو ڕێزەی بەدەستی هێناوە لە سوریای فەرەنجی كەمتر نەبووە لەوە كە لە خاكی ئیسلامدا هەیبووە) .

لە دیارترین ئەو ئیشە هونەریانەی كە لەسەر كەسایەتی سەلاحەدین كراون، فیلمی سینەمایی (شانشینی ئاسمان) Kingdom of Heaven لە دەرهێنانی دەرهێنەری بەریتانی ڕیدلی سكوت، كە پێشوازیەكی گەرمی لێكرا لە جیهانی عەرەبی ئیسلامی، كە بە ئەمانەتەوە وێنەی سەلاحەدینی كێشابوو و لایەنە سوارچاكی و بەرێزییەكەی دەرخستبوو.

لە هەمان كاتدا بە پێی هەندێك سەرچاوە، لە ماوەی شەڕی جیهانی یەكەمدا سەركردەی بەریتانی، ئیدمۆند ئەللنبی بە شانازییەوە ڕایگەیاند (ئەمڕۆ شەڕی خاچپەرستی تەواو بوو) شمشێرەكەی بەرز كردەوە بەلای پەیكەری سەلاحەدینی ئەیوبی دوای دەستگرتنیان بەسەر دیمەشقدا، كەئەم دەربڕینە لە ئیدمۆند نەبوویەوە بە دێژایی ژیانی، ئەوەبوو كە زۆر بە توندی ڕەتی ئەوانەی ئەدایەوە كە داگیركردنی فەلەستین لە ساڵی ١٩١٧ بە هەڵمەتی خاچپەرستی دابنرێت، ساڵی ١٩٣٣ ئیدمۆند وتی گرنگی قودس لە گرنگیە

ستراتیژیەکەیەتی و هیچ پاڵنەرێکی ئاینی نیە بۆ ئەو مەبەستە، ڕۆژنامەی بەریتانی ئاهەنگیان گێڕا بۆ داگیرکردنی شام بە وێنەیەکی کاریکاتێری ڕیچارد دڵی شێر سەیری قودس ئەکا و لە ژێریدا نوسراوە" ((دوا جار، ئاواتەکەم هاتەدی)) ، دوای ئەوەی هنری غوری فەرەنسی چووە ناویەوە لە حوزەیرانی ١٩٢٠، بەلای ئارامگەی سەلاحەدین ئەییوبیدا هاواری کرد (هەستە ئەی سەلاحەدین، هاتینەوە، بوونی من لێرە سەرکەوتنی خاچە بەسەر هیلالدا).

## محمد ئەمین زەکی بەگ

## باشوری کوردستان

( ١٨٨٠ – ١٩٤٨ ز )

زۆرن ئەوانەی تەمەنی پڕ بەخششیان لە پێناو مرۆڤایەتی بوراند، بە بەهرە و تواناکانیان خزمەتیان بە گەلەکەیان کرد دیارە کوردیش بە سەدەها کەڵەمێرد و مێرخاسی لەم جۆرەی تێدا هەڵکەوتووە .

محەمەد ئەمین زەکی بەگ ناوی تەواوی محەمەد ئەمینی کوڕی حاجی عەبدولڕەحمانی کوڕی مەحمود باپێرە لەساڵی ١٨٨٠دا لە گەڕەکی گوێژەی شاری سلێمانی لە دایکبووە و باوك و دایکی نەخوێندەوار بوون و خاوەن وڵاخ و کاروان بوون.

لە ساڵی ١٨٩٢ چووتە فێرگەی "موڵکیی" سەرەتایی سلێمانی پاشان ماوەیەکیش لە فێرگەی مەلا عەزیز خوێندویەتی ..

لە ساڵی ١٨٩٣ چووەتە فێرگەی ڕوشدیەی سەربازی سلێمانی و دوای دووساڵ خوێندن چووەتە ڕوشدیەی سەربازی بەغدا ساڵی ١٨٩٨ چووەتە کۆلێژی سەربازی هەروەها بەشی ئەرکانی ئەستەمبوڵ کە لە ساڵی ١٩٠٢ بە پلەی "ڕەئیس چاك" دەرچووە و لە لەشکری عوسمانی شەشەمی بەغدا دامەزراوە .

ساڵی ١٩٠٣ تا تەمووزی ١٩٢٤ لە لەشکری عوسمانیدا چەند جۆر پلەی بڕیووە ، لەگەڵ گەڕانەوەشی بۆ عێراق لە ١٩٢٥.٠٢.٠٢ تاکو ١٩٢٥.٠٧.١٥ فەرمانی دووەم پشکنەر فەرماندەی فێرگەی سەربازی عێراقی بووە .

ساڵانی ١٩٢٥ – ١٩٢٨ – ١٩٣٧ نوێنەرەی هەڵبژێراوی بۆیەکەمجار لە شالیارێتی عەبدولموحسین ئەلسەعدوندا بووە بە شالیاری (کارداری و هامووشۆ) تا ١٩٤١.١١.١٠ بۆ ١٠ جار لە شالیاریتیەکانی زانستی، بەرگری، ئابووری و هامۆشۆدا بووە لە ١٩٤٢.٠٢.١٠ لە بەر نەخۆشی بەیەکجاری دەستی لە کاروباری میری هەڵگرت. لە شەوی ٩ لەسەر ١٩٤٨.٠٧.١٠ لە دیدەنی شاری سلێمانیدا کتوپڕ گورچیلەکەی لە کارکەوتوە و خوێنی لێ پیس کردووە بەو جۆرە گیانی پاکی سپارد بە خاك و نیشتمانەکەی.

ئەمین زەکی بەگ ئارەزووی لە هۆنراوە، وێژە ، خۆشنووسین، نیگارکێشان بووە ، زمانەکانی کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی، ئەڵمان و فەرەنسی زانیووە ، بە

توركی و عەرەبی و كوردی لە بارەی مێژووی جەنگ، لەشكر، مێژووی ڕامیاری خاوەنی بەرهەمی بەنرخە .

خاوەنی زیاتر لە ١٢ بەرهەمە ئەمەش چەند بەرهەمێكی "محەمەد ئەمین زەكی بەگ"ە :

١- محاسەبەی نیابات - ١٩٢٨ (كە تیایدا پەراوی كردەوەكانی لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا بۆ خوێنەر كۆكردۆتەوە)

٢- خولاسەیەكی تەئریخی كوردستان بەشی یەكەم ساڵی ١٩٣١ و بەشی دووەم ساڵی ١٩٣٧ (وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیش)

٣- دوو تەقەللای بێ سوود ١٩٣٥ (كە یاداشتێكی ٦٩ لاپەڕەیە : ساڵی ١٩٣٠ بۆ مانی كورد دابوویە میری، بڵاوكردنەوەی قەدەغەكرا)

٤- تاریخی وڵاتی سلێمانی ١٩٣٩

٥- كورد بە ناوبانگ بەشی یەكەم ساڵی ١٩٤٥ و بەشی دووەم ساڵی ١٩٤٧

٦- تاریخ الدوله و الامارات الكردیه ١٩٤٥

## سمكۆی شكاك

## ڕۆڵی له بزووتنه‌وه‌ی كوردایه‌تیی ڕۆژهه‌ڵاتی كوردستاندا

### پێشه‌كی

یه‌كێك له لاپه‌ڕه گرنگه‌كانی بزووتنه‌وه‌ی كوردایه‌تی له ڕۆژهه‌ڵاتی كوردستاندا، جووڵانه‌وه‌كه‌ی سمكۆی شكاك_و شۆڕشه‌كانیه‌تی به‌رامبه‌ر به ده‌سه‌ڵاتدارانی ئێرانی به درێژایی ساڵانی ١٩٠٥-١٩٣٠.

ئامانج له‌م توێژینه‌وه‌یه ده‌ست نیشانكردنی هۆكاره‌كانی ده‌ركه‌وتنی سمكۆو هه‌روه‌ها ئامانجمان تێڕوانینه له ئاراسته‌كردنی ئه‌و ئه‌نجامانه‌ی كه له‌ئه‌نجامی هه‌وڵه‌كانی سمكۆو هه‌ڵه‌كانیه‌وه له‌ماوه‌ی بزووتنه‌وه‌كانی دا كه‌وتنه‌وه.

وێڕای بینینی چه‌ند سه‌رچاوه‌یه‌كی جۆراوجۆر، به‌ڵام ئه‌وه‌ی كه زیاتر سوودمان لێیان بینیوه كتێبه‌كانی (محمد رسولْ هاوار: سمكۆ (ئیسماعیل ئاغای شكاك)و بزووتنه‌وه‌ی نه‌ته‌وایه‌تی كورد، صالح محه‌مه‌د ئه‌مین: كوردو عه‌جه‌م، مێژووی سیاسیی كورده‌كانی ئێران) و چه‌ند سه‌رچاوه‌یه‌كی دیكه‌ش.

له‌م توێژینه‌وه‌یه‌دا ڕێبازی هه‌ڵێنجانی زانیارییه‌كانمان گرتۆته‌به‌ر له‌سه‌رچاوه زانستییه‌كانداو وێڕای لێك به‌ستنه‌وه‌یان به‌یه‌كتری، هه‌وڵمانداوه سه‌رنج‌و تێبینییه‌كانمان به‌شێوه‌یه‌كی زانستییانه بخه‌ینه‌ڕوو.

توێژینه‌وه‌كه‌مان جگه له پێشه‌كی، له سێ ته‌وه‌ری سه‌ره‌كی پێكهاتووه، له ته‌وه‌ری یه‌كه‌مدا باسێكمان خستۆته‌ڕوو ده‌رباره‌ی كه‌سێتی سمكۆو هۆكاره‌كانی ده‌ركه‌وتنی. وه له ته‌وه‌ری دووه‌م: هۆكاره‌كانی به‌رپاكردن‌و شۆڕشه‌كانی سمكۆو ته‌وه‌ری سێیه‌م‌و كۆتایش تایبه‌ته به هۆكاره نێوخۆیی‌و ده‌ره‌كییه‌كانی شكستی شۆڕش‌و ڕاپه‌ڕینه‌كانی سمكۆ.

### كه‌سێتی سمكۆو هۆكاره‌كانی ده‌ركه‌وتنی:

ئیسماعیل ئاغای شكاك (سمكۆ) ساڵی(١٨٧٥) ، له دایك بووه، كوڕی محه‌مه‌د ئاغایه له هۆزی شكاك، باوكی سه‌رۆكی هۆز بووه‌و ناوو ناوبانگی له ئه‌سته‌مبوڵ_و تاراندا ده‌ركردبوو، دوای مردنی باوكی برا گه‌وره‌كه‌ی (جه‌عفه‌ر ئاغای شكاك) ده‌سه‌ڵات ده‌گرێته ده‌ست‌و پاشان به‌پێی پیلانێكی دوژمنانی له ساڵی ١٨٩٥ له ناوده‌برێت، ئه‌مه‌ش وا ده‌كات ڕاسته‌خۆ سمكۆ بێته شوێنی. واته له ته‌مه‌نی ٢٠ ساڵیدا بۆته سه‌رۆكی هۆزی شكاك، به‌ڵام لاوێكی چالاك‌و لێهاتوو بووه‌و هه‌رله ته‌مه‌نی منداڵییه‌وه دووچاری ژیانێكی سه‌خت بۆته‌وه.

هەروەها سمکۆ بەهێزترین کەسایەتی نێو هۆزی شکاك بوو، دوای وەرگرتنی سەرۆکایەتی هۆزەکەی لە پەلاماردانی دەوڵەتی قاجاریدا بەردەوام بوو، ئەمەش وایکردبوو ژمارەیەك لاوی ئازاو بوێر لە دەوری کۆببنەوەو پشتیوانی لێبکەن، وە لەوانەشە شوێنی جوگرافیاو دیالەکتیکی زمانو پەیوەندی باشی لەگەڵ کەسایەتییەکانی کوردی کرمانشانو سنەو عیلامو سەرۆك هۆزەکانی دیکەی کورددا، ڕۆڵی باشیان هەبوو بێت لە پێگەی هێزو دەسەڵاتیەوە.

کەسێتی سمکۆ بەزۆر شێوەو لە زۆرێك لە سەرچاوە مێژوویەکاندا بە شێوازی جۆراو جۆر باسی لێوەکراوە، هەرچەندە ئێرانییەکانو تورکەکان بە تاڵانچیو ڕێگر ناوی دەبەن، بەڵام لە ڕاستیدا مرۆڤێکی نەتەوە پەروەر بووە، وە لە قۆناغو سەردەمی خۆیدا کەسایەتییەکی نوێخوازبووە. بۆیە دەبینین هەریەکە لەنەیارو دۆستانی کورد بەجۆرێ باسیان لێوەکردووە. کە هەندێك وەك ڕێگرو هەندێکی دیکەش وەك شۆڕشگێڕو نەتەوە پەروەر وەسفیان کردووە. بۆ وێنە: هاملتۆن دەڵێت: " سمکۆ ناودارترین کەسی شۆڕشگێڕی کوردستانە".

شێخ لەتیفی حەفیدیش لەبارەیەوە نوسیویەتی: " کەسێکی چالاکو ووریا بوو، لە جەنگدا کەسێکی بەتواناو لێهاتوو بوو، دەیویست دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنێو دژی داگیرکاریو تالانچێتی بوو، لەڕووی دبلۆماسیەوە کەسێکی بەتوانابوو، هەمیشە پەیوەندی باشی هەبووەو کۆبوونەوەی دەکردو لەوسەرۆکانە بوو قەد بیری لەوە نەکردۆتەوە کە وڵاتەکەی بە پارە بفرۆشێ یان حەز لە پایەی بەرز بکات".

لە ڕاستیدا چەند هۆکارێك بوونە هۆی زیاتر ناووناوبانگ دەرکردنی سمکۆ، هەم لەئێرانو هەمیش لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا، کە گرنگترینیان بەکورتی ئەمانەن:

١- بەهێزی هۆزی شکاك لە قۆناغە مێژوویەکانی ئێرانو هەوڵەدژایەتیە بەردەوامەکانیان بۆ پاراستنی ماڵو موڵکەکانیان لەدەست قاجارەکان، ئەمەش زیاتر بۆ سمکۆ گرنگیەکەی دەرکەوت کاتێك بوو بە سەرۆکی هۆزەکەیان.

٢- ڕووداوەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئێرانو ناوچەکە، وە هاتنی عەبدولرەزاق بەدرخان بۆلایو بەیەکەوە کارکردن بۆ یەك ئامانجی هاوبەش بەبرەودان بەچالاکی ڕۆشنبیری لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا. بەتایبەتی دوای ئەوەی ساڵی ١٩١٣ لە شاری (خۆی) سمکۆ بەهاوکاری عبدالرزاق بەدرخان یەکەم خوێندنگای بۆ منداڵانی شارەکە کردەوە کە ٣٠ منداڵی کورد تێیدا دەیان خوێند ، خەرجی خوێندنگاکەش لەسەر ئەرکی دانیشتوانی

ناوچەکە بوو. هەروەها روسەکانیش هاوکاری فەرهەنگیان دەکردو زمانی روسیش تێیدا دەخوێندرا.

٣- کاتێك سمکۆ بوو بەزاوای سەید تەهاو خوشکەکەی خواست، زیاتر ناوبانگی دەرکرد، چونکە نەك تەنها لەبەرئەوەی سەید تەها شۆڕشگێڕبوو، بەڵکو کەسایەتییەکی ئایینی بەهێزیشی هەبوو، ئەم پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە- خزمایەتیەی لەگەڵیاندا زیاتر وایکرد سمکۆ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ناودەربکاتو بناسرێ.

٤- هۆکارێکی دیکەش بێلایەنی سمکۆ بوو لە ڕووداوەکان دوای کشانەوەی هێزەکانی ڕووسیا لە ساڵی ١٩١٧و پاشان خۆی سازدا بۆ هەڵایسانی شۆڕش لە دژی قاجارییەکاندا.

**هۆکارەکانی بەرپاکردنو شۆڕشەکانی سمکۆ**

پێویستە ڕاشکاوانە ئەوە بخەینە ڕوو یەکێك لەهۆ پاڵنەرە سەرەکیەکانی هەڵایسانی شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی سمکۆ، وێڕای زوڵمو ستەمەکانی دەسەڵاتدارانی قاجاریو دژایەتیە بەردەوامەکانیان بۆ کوردو نەسەلماندنی مافەکانیان، لەهەمان کاتدا کوژرانی (جەعفەر ئاغای شکاك) برا گەورەکەی سمکۆ، دەکرێت بەخاڵی سەرەکی وروژێنەر دابنرێت بەرامبەر بە دەسەڵاتدارانی ئێرانی، بۆیەش بەردەوام لە چاوەڕوانی دەرفەتێکدا بوو تا لەڕێیەوە ڕقو قینەو تۆڵەی بنەماڵەکەیانیان لێبکاتەوە.

یەکێك لەودەرفەتانەی بۆ سمکۆ هاتە پێشەوە هەڵایسانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩٨١) بوو، کەوا زیاتر بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی پێوە تێکچوو، چونکە یەکێك لە ڕووداوە هەرەگرنگو چارەنوسازەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم، هەڵایسانی یەکەمین جەنگی جیهانی بوو، کە لەو سەردەمەدا گەلی کورد لەنێوان هەردوو حکومەتی عوسمانیو قاجاریدا دابەشکرابوو، هەربۆیە دوابەدوای بەشداریکردنی دەوڵەتی عوسمانیو تێوەگلانی لەوشەڕەدا، ئاگری شەڕ بۆ نێو کوردستان تەنیەوە، لەم ڕووەوە (لازاریێف) دەڵێت "لەڕاستیدا دەنگی یەکەم تەقەی شەڕ لەڕۆژهەڵاتی نزیکدا لەکوردستانی ئێران بەرزبۆوە نەك لەدەریای ڕەشدا".

بەمەش سمکۆ سەرەتا هەوڵی دا لە ڕێگەی برەودان بە شۆڕشەکانی کوردەوە ئاگرەکە خۆشتر بێتو پاشان ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش ئازاد بکەن، بۆیەش کاتێك لەپاڵ ئەم بارودۆخانەدا شۆڕشێکی کورد لە بەتلیس سەر هەڵدەدات بەبەشداریو سەرکردایەتی ژمارەیەك لە سەرکردە دیارەکانی کورد لەوانە: عبدالرزاق، یوسف کامل، شێخ تەها،

سمكۆش بەشدار دەبێت تیایدا، وە پاشان شۆڕشەکە فراوان بوو و سەرەتاش سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا، کە توانرا گەمارۆی شاری بەتلیس بدرێتو پاشان بچنە ناویەوە، بەڵام نەتواندرا لەناوی دا بمێننەوە بەهۆی هاتنی یارمەتی سەربازی زۆری تورك بۆ ناوچەکە، لە کاتێکدا هێزەکانی کورد لەڕووی چەكو ڕێکخستنەوە لاوازبوو، بەمەش تورکەکان توانییان شۆڕشەکە لەناوببەنو هەروەها ئەوپەڕی توندو تیژیو سزادانیان پەیڕەوکردوو بەشێکیش لە سەرکردەکانی شۆڕششیشیان لە سێدارەدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە گەلی کورد لەناوچەکانی دیکە بێزاری و توڕەیی خۆی نیشان بدات بەرامبەر ئەو ڕەفتارە ناشیرینانەی کە ئەنجام درا لەلایەن سوپای تورکەوە بەرامبەر شۆڕشگێران.

بەڵام سمکۆ دوای جەنگ لە سالآنی (١٩١٩-١٩٣٠) خەباتی ڕزگاریخوازی گرتەئەستۆ بەئامانجی بەدەست هێنانی سەربەخۆیی.

لەساڵی ١٩١٩دا شۆڕشو ڕاپەڕینی سمکۆ زۆرێك لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانی گرتەوەو بەشێکی زۆری سەرۆك هۆزەکان دایەنە پاڵی، وە ناوچەیەکی فراوانی ڕزگارکرد، هەر لە ورمێ تا سنووری تورکیا، لە وێشەوە تا سابلاغو سەقزو بانەش، وە لەوکاتەشدا بەڕێوەبەرایەتییەکی لەو نێوچانەدا دامەزراندو شاری ورمێ ی کردە نێوەندی دەسەلاتەکەی، ڕۆژنامەیەکیشی بەناوی (ڕۆژی کوردو شەوی عەجەم) دەردەکرد وەك ئۆرگانی دەسەلاتەکەیو دواتر ئەمە بوو بە ڕۆژی کوردو پاشانیش کورد.

لەدوای ئەو بڵاوکراوەیە بزوتنەوە چەکداریەکەی سمکۆی شکاك لەگەشە کردندا بوو ناوچەیەکی زۆری کوردستانی ئێرانی گرتبۆوە دەسەلاتی خۆی چەسپاندبوو بۆیە لەپاڵ ئەو گەشە کردنە سیاسیو سەربازیە سمکۆ بیری لەدەرکردنی بڵاوکراوەیەکیش کردەوە وەك پێویستیەکی گرنگ بۆ گەشە پێدانی لایەنی فەرهەنگیو ڕۆشنبیری و بیری نەتەوەی بۆیە لەساڵی ١٩٢١ دوایی ئەوەی شاری وورمێ ی خستە ژێر دەسەلاتی خۆی دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك دوایی ئەوەی محمەد تەمەدونی خاوەنی چاپخانەی (تەمەدن) رایکرد و شاری وورمێ ی بەجێهێشت لەبەر ئەوەی ئازەریەکی شیعەی دژ بەکوردو جوڵانەوەکەی سمکۆ بوو ، لایەنگرانی سمکۆ دەستیان بەسەر چاپخانەکەدا گرتو ناوەکەیان لە (تەمەدون) کرد بە (غیرات) ئەوجا دەستیان کرد بە دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بەناوی (ڕۆژی کورد – شەوی عەجەم) پاشان کردیان بە (ڕۆژی کورد) دوایی تەنها (کورد) محەمەد تورجانی بەرپرسیاری بووە لەسەرەوەی کورد نوسراوە (واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا) لەژێریشەوە دوودەست لەیەکدا وەك نیشانەی یەکێتی تێدابێ وەردەگیرێ جاری

لەهەفتەیەکدا چاپ دەکرێ لەژێر ڕۆژنامەکەش نوسراوە (ڕۆژنامەیەکە سیاسی ادبی ، اخباری ، سر مقالی ترجمە دکرد بفارسی ، دینوسی کوردیك بۆ هەموو کوردان).

هەموو نوسەرانی کورد هەر تەنها ئەوەندەیان لەبەردەستدایە لەبارەی ئەو ڕۆژنامەیەکە بەمێژووی کۆچی دەرچووە گوایە ژمارەی یەکەمی لە ١٢ ی مانگی شەوالی ١٣٤٠ بلاوبۆتەوە کەمەندێك پێیان وایە دەکاتە تەمموزی ساڵی ١٩٢٢ ی زاینینی بەلام نازانرێ تیراژی چەند بووەو چەند ژمارەی لێ دەرچووە بەکۆتایی هاتنی بزوتنەوە شۆڕشگێرییەکەی سمکۆ کۆتایی بەدەرچوونی ڕۆژنامەکەش هات.

ئەم هەولانەی سمکۆ لەلایەن ئێرانەوە وا بەسانایی پەسند نەدەکراو بۆیە لەساڵی ١٩١٨ لەلایەن (مکرم الملك) حاکمی تەبرێز بۆمبێك بە شێوەی دیارییەکی پێچراوە دەنێرێت بۆ سمکۆ بەمەبەستی لەناوبردنی، بۆیە کاتێك زەرفەکە دەکەنەوە بۆمبەکە دەتەقێتەوەو دەبێتە هۆی کوژرانی کەس لەپیاوەکانیو بریندار بوونی ژمارەیەکی لەوەیش پتر لە دەستو پێوەندەکانی.

پاشانیش کە گۆڕانکاریە سیاسییو سەربازییەکان لە ئێراندا هاتە کایەوە بە دەرکەوتنی ڕەزاشای پەهلەوی، سمکۆ لە هەوڵەکانی خۆی بەردەوام بوو بۆ سەردانەنواندن بەرامبەر بە ئێرانو پاراستنی سەربەخۆیی کوردستان، وە دەسەلاتەکەشی فراوانکردبوو دەستی بەسەر ناوچەکانی نێوان خۆیو سەلماسدا گرتبوو.

بەلام دەسەلاتی تۆتالیتاریانەی ڕەزاشا بێ ئاکام نەمایەوە لەسەر سمکۆ، بەلکو دەسەلاتی سمکۆ وردە وردە دایە لاوازیو بۆ ماوەیەك لە چالاکیەکانی وەستا، چونکە نەیتوانی بەرامبەر هێرشی ئێران خۆی ڕابگرێتو بۆیەش شاری ورمێی لەدەستدا کە چوار ساڵ بوو حوکمی تێدا دەکرد، لە (١٩٢٢/٨/٤) هێزەکانی خۆی کشاندەوە بۆ تورکیاو دوای کەوتنە داوی سوپای تورکو زەبرلێوەشاندنو زیان پێگەیاندنێکی زۆری گیانیو ماددی توانی خۆی دەربازبکات لەدەستیانو پاشان خۆی گەیاندە باشووری کوردستانو لە ناوچەی ڕەواندزدا نیشتەجێ بوو، بەلام ئەم شکستەی سەرجەم لایەکی گرتەوەو لە ڕۆژنامەکانی ئێراندا بە شێوازی جیا جیا باسیان لێوەدەکرد، وەهەوڵی دا پەیوەندی بەهێز لەگەڵ ئینگلیزدا دروست بکات بەمەبەستی هاوکاریکردنیان لە دژی تورکو فارسەکان. بەلام دواتر سمکۆ هەڵوێستەکانی خۆی لەمەڕ بەریتانیاو فریودانی کوردو هاوکاری نەکردنەکانی بۆ

بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردو بەتایبەتیش لە باشووری کوردستان دا خستەڕوو، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ئەحمەد تەقیدا.

ئەم بارودۆخەی ژیانی سمکۆو هەوڵەکانی بەپێی هەڵبەزو دابەز لە دەسەڵاتیدا ڕوویداوە. کە ئەمەش بەئاشکرا لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا ئاماژەی پێکراوەو تێیدا هاتووە: "سمکۆ ڕەهبەرێکی کوردی بەناوبانگە، ساڵو نیویك دەبێت ناوی زۆر لەناو ناواندا نەماوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەموو کات لەوانەیە بێتەوە مەیدانو هێندەی شێخ محمود لەسلێمانیو باشوور گێرمەو کێشە بۆ حوکمەتی ئێرانو تەنانەت عێراقیش دروست بکات".

هەروەك لە بەڵگەنامەی بەریتانیەکاندا پێشبینی کرابوو وئاماژەی بۆکراوە، دەبینین دوای دوو ساڵێك، سمکۆ هاتەوە مەیدانی خەباتو لەساڵی ١٩٢٣دا چوو بۆ سلێمانیو سەردانی شێخ محمودی کرد بۆ باسو مەسەلەکانو ستراتیژیەتێکی هاوبەش بۆ بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوردستاندا. بەڵام دوای ئەوەی ئێران لەسەر داوای تورکیا بڕیاری لێبووردن دەردەکاتو لەساڵی ١٩٢٤دا جێبەجێی دەکات، دوای ساڵێك سمکۆ بەخۆیو چەکدارەکانیەوە دەگەڕێتەوە ناوچەکانی خۆیانو لە (ضهریقة) نیشتەجێ دەبێت.

لەڕاستی دا ئەمەش لەئاکامی سیاسەتی تاکتیکی ڕۆژی ڕەزاشای پەهلەوی بوو، بۆ هێمن ڕاگرتنی ئاسایشی نێوخۆی وڵاتو تا خۆ قایم کردنو جێگیربوونی، ئینجا یەکلایی کردنەوەی نەیارو پاراستنی یەکپارچەیی خاکی ئێران، وەك چۆن دەبینین لەدواتردا بەرامبەر بە سمکۆ هەر وایکرد.

دواتر سمکۆ لە ساڵی ١٩٢٨ جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ باشووری کوردستانو دەوڵەتی بەریتانیش داوای لە حکومەتی عێراق کرد کەوا هاوکاری ئێران بکات بۆ لە نێوبردنی سمکۆ، بۆیەش هەندێك وای بۆ دەچن کە کوژرانی سمکۆ دەستی بەریتانیەکانیشی تێدا بێت. وە لە مایسی ١٩٢٨دا ناچارکرا خاکی عێراق بەجێبهێڵێت، وە ڕووی لە تورکیاکرد، بەڵام ئەوانیش ڕێگایان لێگرتوو بەناچاریو بە زۆری هێز گەڕایەوە ناوچەکانی پێشووی خۆی لە عێراقدا، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات لەم قۆناغەدا سمکۆ لە هەڵومەرجێکی زۆر ناخۆشدا بووە، چونکە هەرسێ دەوڵەتی تورکیاو عێراقو ئێران دژایەتیان کردووەو لەدژی وەستاون.

دواتر ئێران وای بەباشتر زانی سمکۆ بگەڕێتەوە بۆ ئێران، لە ڕاستیشدا ئەمە بۆ لەناوبردنی بوو، بەڵام سەرەتا کەسێکیان بەناوی (تەیمور ئاغا) ناردە لایو بەڵێنیان بۆ

ناردبوو کەوا پارێزراودەبێت گەر بە هێمنی لەناوچەکانی خۆیاندا دابنیشێت، وە بۆ زیاتر بڕواهێنان بە سمکۆ بڕیارێکی لێخۆشبوونیشیان لە نێو قورئانێکدا بۆ ناردبوو تا پێوەی فریوی بدەن، بەمەش سمکۆ فریوی خواردوو لەهەمان کاتیشدا هیچ ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەمدا نەمابۆوە بۆ خۆ دەربازکردن، بۆیە بەناچاری دەگەڕێتەوە بۆ ئێران. پاشان بەفێڵی بینینی ڕەزاشاو گفتوگۆ بانهێشتی دەکەن بۆ شاری شنۆو سەرەنجام لەلایەن سوپای ئێرانەوە بە فەرمانی ڕەزاشا لە ڕۆژی (١٩٣٠/٧/٢٠) ، تیرۆر دەکرێتو کۆتایی بەخۆیی‌و شۆڕشو ڕاپەڕینەکانیشی دەهێنن.

**هۆکارە نێوخۆیی‌و دەرەکیەکانی شکستی شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی سمکۆ**

**یەکەم: هۆکارە نێوخۆییەکان:**

١- سمکۆ هەرچەندە ناسراوترین کەسایەتی بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دا، بەڵام خاوەن ڕێکخراوێکی سیاسیی‌و کۆمیتەیەکی سیاسیی نەبوو، تا بەیەکەوە کارەکان ببەن بەڕێوە، بەڵکو هەرخۆی سەرکردەو بەرنامەدانەرو نەخشەدانەری شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی بوو.

٢- هەروەها هێزە چەکدارەکانی سمکۆ هێزێکی ڕێکخراو نەبوون بەدیسپلینی سەربازی‌و دوای گرتنی ناوچەیەك نەیان دەتوانی پارێزگاری لێبکەن‌و بەڕێکو پێکی ببەن بەڕێوە.

٣- بناغەی شۆڕشەکەی لەسەر بنەمایەکی پتەوو لەسەر بیری نەتەوایەتی پێك نەهێنابوو، وە هەموو ئەوانەشی لەگەڵیدا بوون زۆربەیان زیاتر بەنا بەدڵی بوو، وەکاتێك هەلێکی دیکەیان بۆ هەڵکەوتایە جێیان دەهێشت.

٤- وە کوژرانی مارشمعون لە ساڵی ١٩١٨ بەدەستی سمکۆ بە هاندانی ئێران، بووە مایەی ئاژاوەی نێوخۆیی‌و دژایەتی ئاشووریەکان بۆیی‌و لاوازکردنی.

٥-وە پێمان وایە هۆکارێکی دیکە بۆ لاواز نیشاندانو بە خراپ لەسەر کەوتنی، ئەوە بوو کە سمکۆ خەباتی بەردەوامی نەتەوەیی‌و ئاگری تۆڵە لە جوڵانەوەکەیدا تێکەڵ بەیەك بوو بوون، بەهۆی ئەو زوڵمە بەردەوامانەی لەبەرامبەر بنەماڵەو خۆیدا کرابوو بەردەوامیش هەوڵی لەناوبردنیان دەدا.

٦- هەروەها پێویستە باری کۆمەڵایەتی ئەوقۆناغەی کوردستان بەگشتی لەبەرچاوبگرین، بەتایبەتی زاڵبوونی هەستی هۆزایەتی‌و ناوچەگەرێتی‌و یەکنەگرتنی سەرانی کورد دژ بەداگیرکەرانو هەریەکەو بەجیاو بەبیری جیا هەوڵی دەدا، لەم نێوەندەشدا سمکۆ لێی بەدەر نەبووەو تەواو لەم چوارچێوەیەدا قەتیس ماوە.

**دووەم: هۆکارە دەرەکییەکان:**

١- ئینگلیزەکان بەهیچ شێوەیەك هاوکاری سمکۆیان نەکردو بەڵکو بەپێچەوانەوە یارمەتی زۆری ڕەزا شایان دا تا بتوانێ دەسەلاتی بەسەرئێراندا بسەپێنێو ناوچە کوردیەکانیش کۆنترۆڵ بکاتو بەرژەوەندیەکانی بەریتانیاش لە ئێراندا بپارێزێت: .

٢- بەهەمان شێوە سمکۆ ئومێدەکانی خۆشی لەسەر هاوکاری سۆڤیەتیەکاندا بنیات نابوو، لە سالانی بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانیو سالانی جەنگو دواتریش، بەلام هیچ کات سۆڤیەت ئامادەنەبوو هاوکاری ڕاستەقینەی سمکۆو بزووتنەوە نەتەوایەتیەکانی کورد بکات، چونکە وەك بۆمان دەردەکەوێت سۆڤیەت زیاتر پاڵپشتی دەوڵەتەکانی ئێرانو تورکیا بووە بۆ زیاتر بەدەستهێنانی بەرژەوندیەکانی خۆی، بۆ وێنە باڵیۆزی روسیا بەتوندی ڕەخنەی لە تورکیا گرتووە، کاتێك تورکیا داخوازی ئێرانی لەمەڕ بەدەستەوەدانی سمکۆ جێبەجێ نەکردووە.

وە سمکۆ سەرەتا زۆر لەژێر کاریگەری عەبدولڕەزاق بەدرخاندا بوو بۆ باوەڕبوونی بە ڕووسیا، هۆی ئەم باوەڕبوونەی عەبدولڕەزاقیش بە ڕووسەکان، (د.کەمال عەلی) لە گۆڤاری (چوار چرا) دا وتوویەتی: " هۆی پەیداکردنی پەیوەندی لەگەڵ ڕووسدا ئەوە بووە کە کورد لەڕێگەی ڕووسەکانەوە ئەتوانێت ڕزگاری بێتو هەوڵی ئەوەی ئەدا سوود لەو ناکۆکیەی کە لە نێوان ڕوسو تورکەکانی عوسمانیدا هەبوو بۆ سوودی کورد بەکاری بێنن".

وەپێویستە ئەوەش بخەینەڕوو کەوا (د.کەمال عەلی) لەم دواییانە ئەوەی بە ڕاشکاوانە خستەڕوو، کەوا سۆڤیەتو ڕووسەکان زیاتر تێڕوانینیان بۆ بەرژەوەندیە بالاکانی خۆیان بووەو هەروەها لەلایەنی پەیوەندی هەڵپەرستانەوە لە دۆزی کوردو شۆڕشو ڕاپەڕینەکانیان ڕوانیوە. ئەمەش لەکاتی خۆیدا کاریگەری خراپی کردە سەر سمکۆو هاوکاری نەکردنی کوردو ناسینی کێشەی کورد وەك کێشەیەکی نێوخۆیی ئەو وولاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوەو داگیریان کردووە. بۆیە ئەم هۆکارانەو چەند هۆکارێکی دیکەش بوونە هۆی لەنێوبردنی سمکۆو کۆتایی هاتن بەگیانیو شۆڕشەکەشی لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا.

**ئەنجام**

لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا بەچەند خاڵێکی سەرەکی گەیشتین، لێرەدا وەك ئەنجامی توێژینەوەکەمان دەیانخەینەڕوو، گرنگترینیان بریتین لە:

١- سمكۆ له تەمەنی ٢٠ ساڵیدا بۆته سەرۆكی هۆزی شوكاك، بەڵام لاوێكی چالاكو لێهاتوو بووەو هەرله تەمەنی منداڵیەوە دووچاری ژیانێكی سەخت بۆتەوە.

٢- چەند هۆكارێك بوونە هۆی زیاتر ناووناوبانگ دەركردنی سمكۆ، هەم لەئێرانو هەمیش له بەشەكانی دیكەی كوردستاندا، وەك بەهێزی هۆزی شكاكو خزمایەتیو پەیوەندی كۆمەلایەتی لەگەڵ سەید تەهاو یاخی بوونە بەردەوامەكانی له دژی دەسەلاتدارانی ئێرانی.

٣- یەكێك لەهۆ پاڵنەرە سەرەكیەكانی هەلایسانی شۆڕشو ڕاپەڕینەكانی سمكۆ، وێڕای زوڵمو ستەمەكانی دەسەلاتدارانی ئێرانیو دژایەتیە بەردەوامەكانیان بۆ كوردو نەسەلماندنی مافەكانیان، لەهەمان كاتدا كوژرانی (جەعفەر ئاغای شكاك) برا گەورەكەی سمكۆ، دەكرێت بەخاڵی سەرەكی ورووژێنەری دابنرێت بەرامبەر به دەسەلاتدارانی ئێرانی. هەربۆیەش له ساڵانی (١٩١٩-١٩٣٠) خەباتی ڕزگاریخوازی گرتەئەستۆ بەئامانجی بەدەست هێنانی سەربەخۆیی.

٤- سمكۆ هەرچەندە ناسراوترین كەسایەتی بوو له ڕۆژهەلاتی كوردستاندا، بەلام خاوەن ڕێكخراوێكی سیاسییو كۆمیتەیەكی سیاسیی نەبوو، تا بەیەكەوە كارەكان ببەن بەڕێوە، بەڵكو هەرخۆی سەركردەو بەرنامەدانەرو نەخشەدانەری شۆڕشو ڕاپەڕینەكانی بوو. وە پێمان وایە هۆكارێكی دیكە بۆ لاواز نیشاندانو به خراپ لەسەر كەوتنی، ئەوە بوو كه سمكۆ خەباتی بەردەوامی نەتەوەییو ئاگری تۆڵە له جوڵانەوەكەیدا تێكەڵ بەیەك بوو بوون، بەهۆی ئەو زوڵمە بەردەوامانەی لەبەرامبەر بنەماڵەو خۆیدا كرابوو بەردەوامیش هەوڵی لەناوبردنیان دەدا. جگەلەمانەش لەهەندێك ڕووەوە بناغەی شۆڕشەكەی لەسەر بنەمایەكی پتەوو لەسەر بیری نەتەوایەتی پێك نەهێنابوو. ئەمانەش خاڵی هەرەلاوازی شۆڕشەكەی بوون.

## ئیبن خەلەكان

**( ٦٠٨ – ٦٨١ك )( ١٢١١- ١٢٨٢ ز)**

ئیبن خەلەكان نازناوی زانای بەناوبانگی كورد ئەحمەدی كوڕی محمدی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی ئەبوبەكری كوڕی خەلەكانی بەرمەكیە كە بە بنەچە دەگەڕێتەوە سەر مالكی كوڕی جەعفەری كوڕی یەحیای كوڕی بەرمەكی سەر بە بنەماڵەی بەرمەكییەكانە. لە ساڵی (٦٠٨)ی كۆچی كە دەكاتە ساڵی (١٢١١)ی زایینی لە شاری هەولێری ئێستا لەدایك بووە و، لە ساڵی (١٢٨٢)ی زایینی لە دیمەشق وەفاتی كردووە. سەبارەت بە گەڕانەوەی بۆ سەر بنەماڵەی بەرمەكییەكان دەڵێن ڕاست ناكات. بۆیە ڕۆژێك خۆی لە هاوڕێكانی دەپرسێ كە ئایا خەڵكی دیمەشق سەبارەت بەوە چی دەڵێن. ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: لەوەدا بە درۆزنت دەزانن و، ئەویش دەڵێ: ئەگەر درۆم بكردایە دەمووت كە من دەگەڕێمەوە سەر عەباس، یان عەلی كوڕی ئەبی تالیب، یان یەكێك لە یاوەران. درۆی گەڕانەوە سەر نەتەوەیەك كە فارس بوون و هیچ ئاسەوارێكیشیان نەماوە سودی چییە؟ شەرەفەددینی كوڕی مستەوفیی خاوەنی كتێبی مێژووی ئەربیل بنەچەی ئیبن خەلەكان دەگێڕێتەوە بۆ سەر بەرمەكییەكان. ئیبن خەلەكان لای كوڕەكەی خۆی موسا وتوویەتی كە ئەو سەر بە بنەماڵەیەكی كوردە و ناویان زەرزاری بووە. واتە: بەچكەی گورگ.

دوكتۆر ئەحمەد خەلیل دەڵێ: كاتێك دەگەڕام بە دوای مێژووی كورد دا بۆم دەركەوت كە توێژەرەوەی ئینگلیزی ویلیام ئێگلتون لە دوو جێی كتێبەكەیدا دەروازەیەك بە ڕووی فەرشی كورد و چنراوەكانی تریاندا ئاماژەی بۆ خێڵی زەرزار كردووە. ئەو كتێبە بە زمانی ئینگلیزی لە ساڵی (١٩٨٨) لە بەریتانیا دەرچووە. ئەو توێژەرەوەیە كاتێك باسی خێڵەكانی كوردی نیشتەجێی ڕۆژئاوای ئازربایجانی كردووە، ئاماژەی بۆ ئەو خێڵەش كردووە.

بۆ ئەوەی كە خێڵێكی كورد نیشتەجێی ناوچەیەك بێت و لە ناوچەیەكی تر بوونی هەبێت، ئەوە شتێكی سروشتییە، چونكە لە كۆمەڵگەی كوردەواریدا شتی وا دەبێت هەروەك چۆن خێڵەكانی قەیس و شەمەر كە لە بنەڕەتدا دانیشتووی نیوەدورگەی عەرەب بوون و بوونیان لە عێراق و شامیش هەیە.

ئیبن خەلەكانیش بنەچەی خۆی بردۆتەوە سەر بەرمەكی و خێڵی زەرزار. ئیبن خەلەكان كە دوو كاری گرنگی لە خۆیدا كۆكردۆتەوە، یەكێكیان دادوەری و ئەوی تریان مێژوو نووس، شتێكی نەشیاوە كە بنەچەی خۆی نەنووسێت. بۆ ئەوەش كە خۆی فارسەكانی بە فورسی

مەجوس ناوبردووە ئەوە لەسەر زمانی ڕەشە خەڵکەوە بووە و ، لەناو خەڵکدا وایان پێوتوون. خەڵکی ئەوەیان زانیوە کە بەرمەکییەکان فارس بوون و فارسیش لە پێش ئیسلامدا ئاگر پەرست بوون.

هۆکاری تێکەڵ بوونی ناوی کورد بە فارس و عەجەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کورد پێش هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکانیان سەر بە دەوڵەتی ساسانی فارس بوون و ، بردنەوەیان بۆ سەر ساسانییەکان مەسەلەیەکی سیاسی بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە بنەچەی نەتەوایەتییەوە نەبووە. لە سەدەی شەشەمی زاینیدا دەوڵەتی ئەخمینییەکان ، کە فارس بوون ، نازناوی پاشای میدی و ناوی پاشاکانی میدیایان لە پاشاکانی خۆیان دەنا ، لەوانە: کۆڕشی دووەم و قەمیزی کوڕی و دارای یەکەمی جێنشینی. میدیەکانیش پێش فارس دەوڵەتی خۆیان هەبووە و فارس لە بن ڕکێفی ئەواندا بوون. (سەنتەری لێکۆڵینەوەی سیاسی: لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئێستا قەیرانێکی گەورە لە سەر سرووودی ئەی ڕەقیب هەیە کە تیایدا شاعیر بنەچەی کورد دەباتەوە بۆ سەر میدیا و کەی خوسرەو و ، گەلێك لە خەڵکی کورد پێیان وایە ئەوە ڕاست نییە و ، کەی خوسرەو فارس بووە). باکگراوندی زانستیی ئیبن خەلەکان ئیبن خەلەکان لە بنەماڵەیەکی ناسراوی مەیدانی دینداری و زانستی دینی بووە. شەهابەددین محمدی باوکی بۆ فێربوونی زانست چۆتە شام و میسر و عێراق و ، لە شاری موسڵ و بەغداد وانەی فیقهی خوێندووە. یەکێك لە هاوڕێکانی ناوی عیزەدین بووە کە بە ئیبن ئەسیر ناسراو بووە. هەروەها هاوڕێی ئیبن شەدادی قازی بووە. باوکی ئیبن خەلەکان دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە موسڵ دەمێنێتەوە دەگوێزێتەوە بۆ شاری ئەربیل و لەوێ لای حاکمی ئەربیل موزەفەرەددینی مێردی خوشکەکەی سەلاحەددینی ئەیوبی ڕێزێکی تایبەتی دەبێت و دەکرێتە مامۆستا لە قوتابخانەی موزەفەرییە و ، لە بواری فەتوادا ناوبانگ دەردەکات. ئیبن خەلەکان کوڕە بچکۆلەی شەهابەددین بووە و لە ساڵی (٦٠٨)ی کۆچیدا لەدایك بووە. تەمەنی دوو ساڵان بووە کە باوکی وەفاتی کردووە. شەهابەددین حەزی کردووە ئەم کوڕەی ڕێگای زانستی دینی بگرێ. ئەویش ئاواتەکەی باوکی هێناوەتەدی و بڕوانامەی زانستی لە گەورە زاناکانی سەردەمی خۆی وەرگرتووە. ئیبن خەلەکان لە قوتابخانەی موزەفەرییە دەستی کردووە بە خوێندن و لە مەجلیسی زانای بەناوبانگ ئەبولبەرەکاتی ناسراو بە ئیبن مستەوفی دانیشتووە. لە ساڵی (٦٢١)ی کۆچیدا سەحیحی بوخاری لای زانای بەناوبانگ عەلی کوڕی ئەبی جەعفەر محمدی کوڕی هیبەتوڵا الموکەڕەم السوفی بەغدادی خوێندووە.

ئیبن خەلەكان هێشتا تەمەنی (١٨) ساڵی پڕ نەكردۆتەوە كە ئەربیلی بەجێ هێشتووە و بۆ زیاتر خوێندن ڕووی لە جێیەكانی تر كردووە. لە گەڵ خۆی براكەیی و چەند كتێبێكی بردووە و بەنیاز نەبووە بگەڕێتەوە بۆ ئەربیل. سەرەتا لە شاری موسڵ گیرساوەتەوە و لەوێ لەسەر دەستی كەمالەددین موسای كوڕی یونس وانەی خوێندووە و ، هێندە هۆگری ئەو زانایە بووە و بۆی بۆتە سەرچاوەی زانست كە بڕیاری داوە ئەگەر ژنی هێنا و كوڕێكی بوو ناوی بنێ یونس.

ئیبن خەلەكان دوای موسڵ رووی كردۆتە حەڕان و لەوێشەوە چۆتە شاری حـــەلەب و بوونی لە

شاری حەلەب گونجاوترین هەل بووە بۆی ، چونكە لای بەهاددینی كوڕی شەدادی قازی و جەمالەددین ئەبوبەكر ماهاتیفەقیە و ، ئیبن خەبازی موسڵی و مۆفەقەددینی كوڕی یەعیش وانەی دینی خوێندووە. چاویشی بە مێژوونووسی بەناوبانگ عیززەدین ئیبن ئەسیری هاوڕێی باوكی كەوتووە. لە ساڵی (٦٣٢) كۆچیدا ڕووی كردۆتە دیمەشق و ، لەوێ تەفسیر و حەدیس و فقهی لە لای شێخ ئیبن سەلاحی شارەزووری كوردی خوێندووە و ، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ حەلەب. وادیارە نەیویستووە بگەڕێتەوە بۆ ئەربیل چونكە لەو كاتەدا تەتار بەسەریدا كشاون و كاولیان كردووە. هەروەها وا سەیری خۆی كردووە كە هەر پێویستی بە وەرگرتنی زانست ماوە ، بۆیە ڕووی كردۆتە میسر و ، لە ساڵی (٦٣٦)ی كۆچیدا گەیشتۆتە شاری ئەسكەندەرییە.

ئیبن خەلەكانی قازی بەدرەددین السنجاری قازی قازییەكانی میسر دەبێت و ئەویش كورد بووە و سەر بە خێڵی زەرزاری بووە. بەدرددینی سەرۆك قازییەكان ئیبن خەلەكانی كردۆتە جێگری قازی میسر. كاتێكیش مەمالیكەكان گەیشتنە دەسەڵات و شوێنی ئەیوبییەكانیان گرتەوە ئیبن خەلەكان لەسەردەمی شا زاهیردا بووە قازی شام و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شامدا كشا. ئیتر ئیبن خەلەكان كەوتە دانانی قازی و جێگر بۆ خۆی لە هەموو شارەكانی شامدا و ، چاودێری ئەوقاف و قوتابخانەكانی دەكرد و ، مەسەلە قەزاییەكانی یەكلا دەكردەوە. تا ساڵی (٦٦٩)ی كۆچی لەو پلەیەدا مایەوە و ، دوای ئەوە لابرا. لابردنەكەی لەبەر كەمتەرخەمی نەبووە ، بەڵكو لەبەر ئەوە بووە كە بە ویستی شا زاهیر كە سەردانی شامی كردووە ، عیزەددین السایغ لە جێی دانراوە و ، عیزەددین چارەی ئیبن خەلەكانی نەویستووە. ئیبن خەلەكان چۆتەوە بۆ میسر و لەوێ لە قوتابخانەی فەخرییە بۆتە مامۆستا و ، دوای ئەوە هەژاری ڕووی تێكردووە ، بە تایبەتی كە وەزیری میسر زۆر تینی بۆ هێناوە.

بەڵام لە ساڵی (٦٧٦)ی کۆچی بەدواوە بارودۆخی مەعیشەتی بەرەو باشی گۆڕاوە ، چونکە جارێکی تر کاری لە دادگانی دیمەشقدا دەست کەوتووە. لەو پلەیەدا سێ ساڵ ماوەتەوە ، بەڵام دوای ئەوە ئاژاوە دەکەوێتە ناو کوڕەکانی شا زاهیر کە پێشتر ناوی پێرس بووە و ، ئاژاوەکە هەموو شام و میسر دەگرێتەوە و لە کۆتاییدا دەسەڵات دەکەوێتە دەست چەرکەسییەکان و شا مەنسور قەلاوون دەبێتە فەرمانڕەوا. بەڵام ئیبن خەلەکان حەزی لە چارەی ئەو پاشایە نەکردووە و لە دەستوپێوەندی ئەو نەبووە. ئیبن خەلەکان بۆ ماوەیەکی کورت گیراوە و ، پاشا لێبوردنی بۆ دەرکردووە و کارەکەی لە دادگای حەلەب وەرگرتۆتەوە. بەڵام لە ساڵی (٦٨٠)ی کۆچیدا جارێکی تر ئیبن خەلەکان لە کارەکەی دەرکراوەتەوە. ئیبن خەلەکان دوای ئەوە بووە بە مامۆستا لە قوتابخانەی نەجیبە و قوتابخانەی ئەمنییە و ، تا کۆتایی تەمەنی بە مامۆستایی ماوەتەوە. ئیبن خەلەکان لە (٢٦/ڕەجەبی/٦٨١)ی کۆچیدا کە دەکاتە (١٢٨٢)ی زایینی وەفاتی کردووە و ، لە شاخی قاسیون لە شاری دیمەشق بە خاك سپێردراوە.

ئیبن خەلەکانی زانا و مێژوو نووس ئیبن خەلەکان شارەزاییەکی زۆر باشی لە فیقە و ئوصول و زمانی عەرەبیدا هەبووە و ، تا ڕادەیەکی بەرچاو شارەزای مەزهەبی شافیعی بووە و ، لە فەتواکانیدا دیار بووە کە بەردەوام سەیری ئەو مەزهەبەی کردووە. ئیبن خەلەکان هاوڕێی کتێب بووە و پارە و ماڵەکەی هەموو داوە بە کتێب. لە سەرەتای ژیانیدا حەزی کردووە ببێت بە شاعیر ، بۆیە شیعرێکی زۆری داناوە و ، لە ئاستی شاعیرانی وەك زوهەیر و ئیبن مەتروح و ئیبن الخیمی و جەزاردا بووە. تەنانەت دوای کارکردنیشی لە دادگا و قەزادا لە شیعر دوور نەکەوتۆتەوە و هەر گرنگی پێداوە. بەوە ناسراوە کە شارەزاترین کەس بووە لە دیوانی موتەنەبیدا و ، شیعرەکانی موتەنەبی زیاتر هاندەری بوون بۆ گرنگی دان بە ڕێزمانی عەرەبی و زمانەکەی خۆشی.

ئیبن خەلەکان خاوەنی دەموچاوێکی جوان و زمانێکی فەسیح بووە. کابرایەکی بەرچاوتەنگ نەبووە و ، زۆر لە شاعیرەکانی سەردەمی خۆی بە باشی باسیان کردووە. هەمیشە دەستگیرۆیی هەژارانی کردووە و ، کابرایەکی ییرمەند و لەسەرخۆ بووە. بە وقار بووە و بۆ کاری قازێتی و دادگا لێوەشاوە بووە. لە مەجلیسەکانیدا هەمیشە باسی زانست و ڕەوشتی بەرز کراوە و ، مرۆڤ بە دەست خاڵی لە دانیشتنەکانیدا نەهاتۆتە دەرەوە. جگە لەوانە ئیبن خەلەکان مێژوو نووس بووە و خاوەنی کتێبی وفیات الاعیان و انباو ابناو الزمان بووە کە لە ساڵی (٦٧٢)ی کۆچیدا لە نووسینی بۆتەوە ، بەڵام تا ساڵی (٦٨٠)ی

کۆچی هەر زانیاری بۆ زیاد کردووە. ئیبن خەلەکان بەنیاز بووە کتێبێکی گەورەی مێژوویی وەك الكامل في التاريخی ئیبن ئەسیری مامۆستای بنووسێت ، بەلام کارکردنی لە دادگا و پلەکانی قەزادا ئەو بوارەی بۆ نەکردۆتەوە و ، ئەوەندەی پێی کراوە تەرجەمەی کردووە. لەوەشدا ئەم ڕێچکەی خوارەوەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە:

١. لەسەر ئەو کەسانەی نووسیوە کە بەرواری وەفات کردنیانی زانیوە.

٢. تەنها لەبەر ناوبانگ دەکردنیان لەسەر یاوەرانی نەنووسیوە.

٣. لەبەر ناوبانگ دەرکردنیان لەسەر خەلیفەکانی نەنووسیوە.

٤. لەو کەسانە زانیاری وەرگرتووە کە بینیوونی.

٥. هەرکەسێك بەناوبانگ بووە لەسەردەمی خۆیدا ناوی لە کتێبەکەیدا نووسیون.

٦. هەوڵی داوە بنەچەکانیان بە پێی توانا بنووسێت.

٧. جاروبارێك قسەی خۆشی خەڵکانی بەناوبانگی نووسیوە تا کتێبەکەی بێزارکەر نەبێت.

٨. نەیویستووە زانیارییەکانی کورت و کوێر بن. هەرچەندە زیاتر لە حەوت سەدە تێپەڕیوە بەسەر خەلەکاندا ،بەلام ناوی هەر زیندووە و ،کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکانی خەڵکی باوەشیان کردووە بە کتێبەکانی ئەو زانایەدا ، بە تایبەتی کتێبی (وفيات الاعيان) کە باسێکی مێژووییە.

## شێخ مەحموودی حەفید

## پاشوری کوردستان

## (١٨٨١ – ١٩٥٦ ز)

شۆڕشگێڕی ناوداری کورد و پاشای کوردستان شێخ مەحموودی کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ لە ڕۆژی ١٩٥٦.١٠.٠٩دا لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی بەغدا کۆچی دوایی کرد و تەرمی پیرۆزی بەڕێزێکی زۆر لەناو ئاپۆڕەی خەڵکی دڵسوزی شێخی نەمر و کورد و کوردستان لە تەنیشت گۆڕی کاك ئەحمەدی شێخ لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی بەخاك سپێدرا.

ئەم کەسایەتییە مەزنەی کورد لەساڵی ١٨٨١دا لەسلێمانی لەدایکبوووە ، زانستی شەریعەت و فیقە و داڕشتن و بنچینەی تەصەوف خوێندووە و لەساڵی ١٩٠٤دا لەگەڵ شێخ سەعیدی باوکی سەردانی ئەستەمبوڵیان کردووە و چاویان بەسوڵتا عەبدولحەمیدا کەوتووە و ڕێزێکی زۆریان لێنراوە .

کاتێك لە دەسەڵاتی عوسمانی لە دوا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە ناوچەی سلێمانی هۆزەکانی خۆی دەکێشێتەوە ، شێخ مەحموود لە ١٩١٨.١١.١٥دا میرییەکی کوردی لە کوردستانی باشوور دادەمەزرێنێ، لەم هەنگاوەیدا "مەیجەر نۆئێل"ی فەرمانڕەوای ڕامیاری بەریتانیا لە کوردستان پشتگیریی دەکات و حەز دەکات کورد دەسەڵاتێکی ڕامیاری خۆی هەبێ و جودابێ لە عێراق.

"ستیڤن لۆنگریك لە پەرتووکەکەی "عێراق لە ١٩٠٠ – ١٩٥٠"دا لەبارەی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودەوە دەڵێ:"دەسەڵاتی فەرمانڕاویی شێخ مەحموود ناوچەکانی هەڵەبجە و سلێمانی تا دەگاتە ڕەواندزی گرتەوە و ماوەیەکیش کۆیە و ناوچەکەیشی سەربە میرییەکی شێخ بوون و بەدەیان سەرۆك خێڵی کوردی کەوتنە پاڵی و کوردی بووە زمانی فەرمیی میرییەکەی و فەرمانبەری لە کورد بەولاوە کەسی تر نەبوون."

شێخ مەحموود هەستی دەکرد بەریتانیا بەدڵ لەگەڵ کورد نییە و وردە وردە لە پەیمان و بەڵێنەکانی، کە بەکوردی دابوون پاشگەز دەێتەوە ، بۆیە لە ڕۆژی ٢١ی مایسی ١٩١٩دا سەربەخۆیی دەسەڵاتەکەی ڕاگەیاند و ئینگلیزەکانی لە سلێمانی و ناوچەکانی وەدەرنا و هەندێکیشی بەدیلگرتن.

بەڵام پێنەچوو ئینگلیزەکان هێزێکی چەکداری گەورە و گرانی خۆیان کۆکردەوە و لە قوڵی کەرکووکەوە بەرەو سلێمانی هاتن و لە دەربەندی بازیان بەلەشکری خۆبەختکاری شێخ مەحموود گەیشتن، بە چەکی نوێ لە کوردیان داو لە ئەنجامدا شێخی نەمر لە پەنا بەردە قارەمان بە برینداری بەدیلگیراو بردرا بۆ بەغدا و دادگای سەربازی فەرمانی لەسێدارەدانی دا، بەڵام دوایی بیریان لەوەکردەوە ، گەر شێخ مەحموود بکوژرێ باری کوردستان پتر ئاڵۆز دەبێ و شێخیش دیلەکانی ئینگلیزی نەکوشتوون و هێرشی نەکردۆتە سەر سوپای بەریتانیا، بەڵکو لەباری بەرگری لە خۆکردن دابووە ، بۆیە بڕیاریان دا فەرمانی سزاکەی سووك بکرێ و دوور خرێتەوە بۆ هیندستان.

لەپاش دوورخستنەوەی شێخ مەحموود لە سلێمانی، باری ئاسایشی کوردستان پتر تێکچوو، بۆیە بەریتانیا بیری لە هێنانەوەی ئەو پاشایەی کوردستان کردەوە بۆ دامرکاندنەوەی ئەو پەشێوییە ، وابوو ئینگلیزەکان لـە دوای مـانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢دا شێخ مەحموودیان هێناوە کوردستان و پێشوازییەکی گەرمی لێکراو ناوی نا پاشای کوردستان و لەمانگی تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا میرییەکی نوێ دامەزراند و میری بەریتانیا و مەلیکی عێراق فەیسەڵی یەکەم دانیان پێداهێنا.

بەڵام ئەم جارەش بەریتانیا لەگەڵ کورد سەر ڕاست نەبوو، بەتایبەتی کە پەیمانی سیڤەر پووچەڵکرایەوە و لەشوێنی ئەو پەیمانی لۆزان لە ١٩٢٣.٠٧.٢٤دا لەگەڵ تورکیا کەمالی مۆرکرا، دووبارە لە میریەکەی شێخ مەحموود دراوە و ماوەیەك پاشا مەحموود چووە چیای سورداش و دوایی گەڕایەوە سلێمانی.

بەڵام لەساڵی ١٩٢٤دا سوپای عێراق بە پشتگیری تانك و تۆپ و فڕۆکەی بەریتانیا سلێمانی داگیرکرد و ئەندامی بەریتانیا خودموختاریش بۆ کورد ڕەوانەبینی تەنیا ئەو مافەی دا بە کورد، "کە فەرمانبەرەکانی کوردستان کوردبن یا کوردی زان بن و زمانی کوردی بکرێ بەزمانی فەرمی لەناوچەکەدا."ئەمەیش بەنامەیەکی فەرمی بۆ شێخ مەحموود ناردوو تێیدا نووسی لەوە زیاتر چی دیکەتان پێ نادرێ.

دوا ڕاپەڕینی شێخ مەحموود لەدژی میری عێراقی ژێر چاودێری بەریتانیا لەدوای شەڕەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی و کوشتنی دەستەیەك لەخۆپیشاندەران بوو، کە ئەو ساکە لەدیوی کوردستانی ئێران لە (پیران) دادەنیشت، کە هەواڵی ئەو ڕاپەڕینەی میللەتی زانی، هاتە دیوی پێنجوێن و ئەو ناوچەیەی ئازادکرد و پیاوماوقوڵی ئەو ناوەی کۆکردەوە و

بەهەموویان لەسەر ڕاسپاردەی شێخی نەمر یادداشتێکی توندیان بۆ نوێنەری بەریتانیا لەبەغدا نووسی و داخوازییەکانی گەلی کوردیان تێدانووسی، کە بریتی بوون لە مانەی خوارەوە :

١. دامەزراندنی ولاتێکی کوردی لە زاخۆوە تا پشتی خانەقین و هیچ عەرەبێك نە سەرباز نە سیڤیل لەم شوێنەدا نەمێنێ.

٢. ئەم ناوچەیە واتە "کوردستان" لەژێر چاودێری بەرتیانیا دابی تاکو کۆمەڵی ئەقوام (عصبە الامم) بڕیارێکی لەسەر دەدات.

٣. بەرەڵڵاکردنی ئەو کەسانەی بەهۆی (شەڕی بەردەرکی سەرا)وە گیراون و دوورخراونەتەوە بگەڕێنرێنەوە شوێنی خۆیان.

٤. هەر ئەفسەر و فەرمانبەرێکی کورد لە ولاتی عەرەبستاندا هەیە بنێردرێنەوە بۆ کوردستان.

لەگەڵ پێشکەشکردنی ئەم یادداشتە ، دەستەیەك لە ئەفسەرانی کورد لە سوپای عێراق هاتنەدەر و چوونە پاڵ بزووتنەوەکەی شێخی نەمر لەوانە "مەحموود جەودەت، حەمید جەودەت، کامیل حەسەن" هەروەها "ماجید مستەفا"ش خۆی ئامادەکرد بۆ گۆڕەپانی جەنگ لە پێناوی سەرخستی داخوازییەکانی کورد.

کاتێك کە شێخ مەحموود هیچ وەلامێکی بەدەست نەگەیشت، لە ئاوباریك لەوتە شەڕێکی قورس لەگەڵ سوپای عێراق، بەلام لەبەر ناهاوکوفی لەچەك و تەقەمەنی و هێزی شەڕکەر بۆیە شێخی حەفید ناچاربوو لە ڕۆژی ١٩٣١.٠٥.١٣دا خۆی بەدەستەوەبدات و بردرا بۆ بەغدا و سەماوە و لەدواییدا بۆ ناسریە ، ئینجا گەڕێنرایەوە بۆ بەغدا، تاکو لەساڵی ١٩٤١دا لەکاتی شەڕەکەی ڕەشید عالی گەیلانی لەدژی بەریتانیا خۆی لەژیانی دەست بەسەری لە بەغدا ڕزگارکرد و چوو لە گوندی "داری کەلی" دانیشت دواکاتی ژیانی لێ بەسەربرد هەتا کۆچی دوایی کرد، میللەتی کورد هەر بەپاشای کوردستانیان زانی و گیانی پاکی چووە بەهەشتی نەمرانی کورد و کوردستان

## قەدەم خێر
## شۆڕشگێڕ و شا ژنی کورد

ڕۆڵی ژنان لە کۆماری کوردستانداو لە کاروباری سیاسیی و کۆمەڵایە تی بە تایبەت دامەزراندنی ڕێکخراوی یەکێتیی ژنان و دە رکردنی ڕۆژنامە بۆ هەمووان ڕوون و بە رچاوە . بە تایبەت دەوری مینا خانمی خێزانی پێشەوا لەو بەشەدا خاڵ وەرچەرخانێکی تربوو لە مەڕ ڕۆڵی ئەرێنی و کاریگە ری ژنان لە کۆمە ڵگای کوردەواریدا ، بەڵام بێجگە لە ڕۆڵی ئەرێنی ژنان لە کۆماردا و بەتایبەت لە ساڵەکانی پێش دامەزراندنی کۆماردا ژنانێکیش هەبوونە کە تەنانەت توانیویانە ڕێبەرایە تی بزووتنەوەی نەتەوەیی و کۆمەڵایە تی بگرنە ئەستۆی خۆیان .

یەکێك لە و شۆڕە ژنانەی کە بەداخە وە کەمتر هاتۆتە سەرزاران و کەم لە کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا ئاوڕی لێدراوەتە وە ، (( قە دە م خێر)) ە قەدەم خێر ئەو ژنە ئازاو لێهاتوویە بوو کە ( سەید مورداخانی ) برای و ( عە لی مەهخان ) ی مێردی بە پیلانی ڕێژیمی ڕەزاشای پەهلەوی لە نێوبردران ، قە دەم خێر کەسێك بووە کە بڕوای بە یە ککرتووی و تەوەیی هەبووە و شۆڕشەکەشی هاوکات بووە لە گەڵ شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفید لە سلێمانی بۆیە پێوەندی پێوە دەگرێ و داوای لێدەکات کە پێکەوە بۆ ئازادی کوردستان تێبکۆشن و لە پێناو ئەو ئامانجەدا حازرە هەموو هاوکارییەکی ماددی و مرۆییش بکات .

سەرهەڵدانەکەی قەدەم خێر لە ناوچەی لوڕستان پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیت و لەهەموو لایەکەوە تەنگی بەدەسەلاتی زۆرە ملی ڕەزاشادا هەڵێنا و شاری ئیلامیش دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ، بۆیە ڕەزاشا نامەیەکی بۆ دەنێرێ و داوای لێدەکات کە ببکاتە شابانووی ئێران ! بە لام قە دەم خێر زۆر بوێرانە لە وەڵامی نامەکەیدا دە ڵێ : لە نێو ئێمەدا کەس نییە خۆی بە دوژمن بفرۆشێت ، دواتریش من ژن نیم ، تۆ ژنی ! ئە مە ش نموونە یە ك لە ئازایە تیی و بوێری و هەروەها ڕۆڵی ئەرێنی ژنێکی کورد کە بەداخەوە لە ئاکامدا هەروەکوو گشت ڕێبەرانی تری کورد بە زەبری فرت و فێڵ و سوێندی درۆی قورئانی پیرۆز کە وتە داوی دوژمن و دواتریش هەرلە گرتووخانە دا کۆچی دوایی کرد و شۆڕشە کەشی کۆتایی پێهات .

شاژن (قەدەم خێر) یەکێکە لەو ژنە ناسراو ناودارانەی میللەتی کورد، شێرە ژنێکی سەرکردەو سوارچاکو ئازاو بەهەڵمەت بووە، خۆشەویستی بۆ کوردو کوردستان زیاترو

شیرین تربووە لەڕوحو ژیانی خۆی، ئاواتی ئەوەبووە کە کورد ڕزگاری بێت لە داگیرکەرە خۆپەرستو خراپەکارەکان، ئەم شا ژنە نەیتوانی بەرگەی ئەو هەموو زوڵمو زۆرە بگرێت کە ڕوبەڕووی میللەتی کورد بووە لەسەر دەستی( ڕەزا شای پەهلەوی)، بە نمونەی ئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێت: ( کەم بژیو کەڵ بژی)، مردنی پێ باشتربوو لەژیانی ژێر دەستەیی، بۆیە چەکی کوردایەتی هەڵدەگرێتو بانگەشەی ڕاپەرینی ناوچەی (لۆرستان)ی ڕۆژهەڵاتی دەکات، کە ئەم ڕاپەرینە یەکی گرتەوە لەگەڵ ڕاپەڕینەکەی ڕابەری گەورەی کورد سمکۆ شکاک ( ئیسماعیل خانی شکاک).

قەدەم خێر کچی پێشەوا( قەند قەلاوەندی)یە، کەیەکێك بوە لە فەرمانڕاوەکانی میرنشینی لۆڕستانی بچوك لە هۆزەکانی (لوڕی فەیلی)ە، ئەم خانمە کوردە لەسەرەتای سەدەی بیست لەدایك بووە، کە کچێکی جوانو بالاڕێکو ڕۆشنبیرو زیرەکو سوارچاکو ئازابووە، لەساڵی ١٩٢٥ شارەزای پەهلەوی، ( شا موورادخان) کە کۆتا فەرمانڕەوای میرنشینی بچوك بووەو برای (قەدەم خیر) بووە، دەکوژێت، ئەمەش وا لە (قەدەم خێر) دەکات کە ڕقو قینەی بەرامبەر شا دروست بێتو بەڵێنی داوە کە زولمو زۆری قبول نەکات، شا بەمەی زانی تاوانباری دەکات، لە ماوەیەکی کورتدا قەدەم خێر هەڵدەستێت بەئامادەکردنی سوپایەك لەکوردە فەیلەیەکانو ڕاپەڕینی ڕاگەیاندو خۆی ڕابەری سوپاکەی دەکاتو ویستویەتی سەربەخۆی لۆڕستانی ڕابگەیەنرێت، بۆیە لەشاخەکانی کوردستانەوە هێرشیان کردە سەر سوپای (شا) لەچەندین لاوە زەرەرو زیانی زۆریان بەسوپاکەی شا گەیاند .

شا چەندین هۆزی کوردی بانگهێشت کرد، هەوڵی دا بەپارەو پلەوپایە ڕازیان بکات کە لەدژی ئەو شۆڕشە بوەستنەوە، بەلام ئەم هۆزانە ڕازی نەبوون دەستیان خوێناوی بکەن بەخوێنی ڕۆڵەکانی خۆیان.. بۆیە سوپاکەی (شا) بەناچاری چەندین جار هێرشیان کردە سەریو بەشکستخواردویی گەڕانەوە، لەو کاتەدا (قەدەم خێر) نامەیەك دەنێرێت بۆ( شێخ مەحمودی حەفید) کەتێیدا باس لەو زوڵم و زۆریان دەکات کە ڕوبەڕویان دەکەنەوە، داوای لێ دەکات کە سوپاکەیان یەکبگرێتو، ڕازییە لەژێر فەرمانڕوای (شێخ)دا بێت خۆیو سوپاکەشی، چەکو تفاقی دووساڵی سوپاکەشی هەبووە، بەلام شێخ ڕازی نابێت لەترسی ئەوەی کەلایەنگرانی بەهەڵە تێبگەنو بڵێن تەماحی لەسەروەتو سامانیو ئەوخانمە کرد بێت .

شارەزا وەفدێك دەنێرێت بۆ لای (قەدەم خێر) لەگەڵ کۆمەڵێك دیاری بەنرخو گران بەهاو، بەڵێنیش دەدات کە لۆڕستان بگەڕێنێتەوە باری پێشوویو لێخۆش بونی گشتی دەربکات

بۆئەو کەسانەی کە دەجەنگان لەدژیو، داوای هاوسەرگیری لە(قەدەم خێر) دەکات، قەدەم خێر بەم داواکاریانەی ڕەزا شا تووڕە دەبێتو، هەموو دیارییەکانی بەنێردراوەکەدا دەنێرێتەوەو، دەڵێت بڕۆن بە (شا) کەتان بڵێن کەمن پێویستم بەودیاری ئەو نیەو پێی بڵێن:(( من ژن نیم تا شووی پێ بکەم، بەڵکو ئەو خۆی ژنە)) بۆیە شا زۆر تووڕە دەبێت، سوپایەکی زۆر دەنێرێت بۆ لۆرستان بەهەزاران ژنو مندالو بێ تاوان دەکوژێتو بەدەیان لادێ وگوند دەسوتێنێو خاپوری دەکات، شا بەسوپاکی زۆرەوە هێرشیان کردەوەو کۆتاییان بە سوپاکەی قەدەم خێرهێنا، جارێکی تر (ڕەزا شا) بە فرتو فێڵو باوەڕی درۆزنانەی و بەڵێنی هەنگوینی کە زۆر گەورەتر بوولە فرتوفێڵەکانی پێشووی، یەکەم جار نەبوە کەفێڵ بکەن لەکوردو ڕوپۆشی بکەن بە ئاینی ئیسلام، نێردراوێکی تری نارد بۆ لای قەدەم خێر لەگەڵ نوسخەیەك لەقورئانی پیرۆز کە ئیمزاو پەنجەمۆری شای لەسەر بوو هەتا بڕوابکات کە مسوڵمانێکی لەخواترسەو، سوێندی خواردووە بەوقورئانە کە نیازی پاکەو ئەو قورئانەش شایەتیەتی، بەڵێنی پێداوەکە جارێکی تر لۆرستان بگەڕێنێتەوە بۆ جارانی پێشوو، دەرکردنی لێبوردنی گشتی بۆ هەموو سوپاکەی، بۆیە هەندێك لەسوپاکەی بڕوایان کردوو خۆیانو چەکەکانیان تەسلیم بە سوپای شا کرد، قەدەم خێرو ژمارەیەك کەس لەسوپاکەی زانیان کەئەمەش فێڵێکە لەفێڵەکانی تر، بۆیە سوپاکەی ڕەزا شا ڕۆیشتن هەر ئەو شەوە پاسەوانەکانیان کوشتنو قەدەم خێرو حەڤدەکەس لەگەورەکانیان دەستبەسەر کردوو ڕەوانەی تارانیان کردن، بۆ ڕۆژی دوای حەڤدەکەسەکە لەسێدارەدراو نینۆکەکانی قەدەم خێری دەرهێناو کردی بەڕەشووەی ولاخەکەیەوە، ئەو خاتونە مەزنەش هەموو لاشەیان تێکشکاندو خستیانە زیندانەوە.

شۆڕشەکەی قەدەمخێر سێ ساڵی خایاند.. بەپێی ئەوەی کە لەدوای شەهیدکردنی شامراد خانی کاکی،شۆڕشەکەی ڕاگەیاند ، لەوانەیە لە کۆتایی ساڵی «١٩٢٨» یا سەرەتای ساڵی«١٩٢٩»دا قەدەمخێر کۆچی دوایی کردبێ ، تا ئێستا زانیاری زۆر کەمە دەربارەی ئەم سەرکردە کورد و کوردستانپەروەرە قارەمانە نەمرەی گەلەکەمان..

ئەوەی کە شایانی باس و جێی داخە بە لای ئێمەوە، ئەوەیە کە ئێمەی کورد تا ئەمڕۆش بە هۆی دڵپاکی و خۆشبڕواییمانەوە ، زۆر لە سەرکردەکانمان بوونەتە قوربانی خۆشبڕواییمان ، دوژمنانی گەلەکەمان ئەم خاڵە لاوازەی ئێمەیان قۆزتۆتەوە و ، بە بەڵێن و پەیمانی درۆ و فێڵ و فەرەجە زۆر جار تەفرەیان داوین،تا ئەمڕۆش پەندمان لە هەڵەکان و لە قوربانییەکانمان وەرنەگرتووە. کەچی هەر خۆشمان دەڵێین:«دوژمن بوو بە پرد،بە سەریا مەپەڕەرەوە».

## دکتۆر کەمال مەزهەر

### باشوری کوردستان

– کمال مەزهەر – ١٤ شوباتی ١٩٢٧ –ئاغجەلەر –لە کەرکوك لە دایك بووە . سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردووە . – ١٩٥٥ – چۆتە کۆلێژی پەیمانگای مامۆستایان – بەشی مێژوو لە بەغدا ، لە ساڵی ١٩٥٩ کۆلێژی تەواو کردووە .

– ١٩٦٠ چۆتە یەکێتی سۆڤیەت تا ١٩٧٠ هەر لە یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٦٣ دوو دکتۆرای بی دەست هێناوە ، بە ناونیشانی (خەباتی ڕزگاری کورد لە عێراق (١٩١٨–١٩٣٢) ، کە کە دواتر کرا بە پەرتوکێك بە زمان ڕووسی بڵاوکرایەوە .

– دووەم دکتۆرای کمال مەزهەر بە ناوی زانستی (زانستی علوم) کە ئەمڕۆ ژمارەیەکی کەم لەو دکتۆرایەیان هەیە .

لەوانە لە (لەندەن–بەریتانیا) ، دواتر دکتۆر عیزەدین مستەفا رسول ئەم بڕوانامەیەیی بە دەست هێناوە .

– دەیان پەرتوکی مێژووی باڵاوکراوەتەوە ، لەگەڵ سەدان وتار بە زمانەکانی ( کوردی ، عەرەبی ، ڕووسی) کە یەکەم وتاری لە ڕۆژنامەی (ژین) بڵاوکراوەتەوە کە گۆرانی شاعیر سەرنووسەری بوو .

– دوای بەیاننامەی (١١) ئازار گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان بووە بە ئەندامی کارا و سکرتێری گشتی کۆڕی زانیاری کورد .

– سەدان قوتابی ماجستێر و دکتۆرا بە سەرپەرشتی دکتۆر کمال مەزهەر نامەکانیا نووسیوە ، یاخوود لیژنەی نامەکانیان بووە .

– ١٩٧٤ چۆتە پاڵ شۆڕشی ئەیلول ، وە لە کۆڕی زانیاری کورد بەشدار بووە پاشان بۆتە مامۆستای مێژوو لە کۆلێژی بەغدا .

– بەم زوانە گەڕاوەتەوە کوردستان و خۆی خانەنشین کردووە ، کە بە یەکجاری گەڕاوەتەوە .

پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ناوێکی دیارو یەکجار گەشاوەی نێو مێژوونووس و بیرمەندانی کوردەو بەرهەمە زانستیە مێژووییەکانی و پێگەیاندنی سەدان قوتابی و دەیان

پسپۆڕی مێژووی و مامۆستای زانکۆکان، سەدان توێژینەوەو نامەی ماستەرو دکتورا، وادەکەن ئەم نووسەرە لەڕیزی پێشەنگیدابێت.

بۆ پرسیارکردن لەسەر چەند لایەنێکی مێژوویی و مێژوونووسی کورد، لەدواین سەردانیدا بۆ کوردستان و لەشاری هەولێر لە دەرفەتێکدا ئەم دیدارەی لەگەڵ سازکرا لە لایەن رۆژنامەنوس نەوشیروان شەریف که تیایدا بیروڕای خۆی لەسەر زۆر مەسەلەی گرنگی مێژوویی دەخاتەڕوو.

**پرسیار : با لەو پرسیارەوە دەستپێبکەین، کورد تێکڕا لەئێستادا پێیانوایە ئەوەتەی میللەتی کورد هەیە چەوسێنراوەتەوەو ژێردەست بووە، داگیرکراوە، لێیدراوە، تەنانەت ئەمە چۆتە ناو پرۆگرامەکانی خوێندن و خوێندنی باڵاش، ئایا پێتوایە ئەمە راستە، یا ئەوەتی کورد هەیە داگیرکراو و ژێردەستەو لێدراو بووە؟**

د.کەمال مەزهەر: سەرەتا کورد داگیرکراوو ژێردەستە نەبووە، وەکو هەموو میللەتەکانی تر، بەڵکو کورد رۆڵێکی دیارتری بووە لە زۆربەی گەلەکانی ناوچەکە، بەوێنە زەینەفون لە ٤٠١ی پێش زاین کە بە سەرکردایەتی لەشکرەکەی لەئێران دەگەڕێتەوە، زۆر بە شێوازێکی موعەبیر باس لە ئازایەتی کورد دەکات، کە چۆن لەشکرەکەی ئەویان بەزاندوە، لەبەر ئەوە ئێمە دائیم ژێردەستە نەبووین، لەرۆژگاری دەوڵەتی عوسمانیدا ئیمارەتە کوردیەکان لەراستیدا سەربەخۆییان هەبووە، نیمچە سەربەخۆییەکی تەواو، هەر ئەوەیان لەسەر بووە کە ساڵی چەند کەسێك بنێرن سەرانەیان بدەن بە حکومەت، پارە بدەن بە ئەستەمبوڵ، لەکاتی شەڕیشدا بەشێك لە پیاوەکانیان بنێرن بۆئەوەی لەگەڵ سوپای عوسمانیدا بەشدار بێ، ئیتر ئەمە ئیمارەتی بابان ئەڵێی، بەدرخانیەکان ئەڵێی، هەمیشە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم کە بەدرخانی گەورە کارگەی دروستکردنی تۆپی هەبووە، تەواو نیمچە سەربەخۆ بووە .

لەدواییدا لە رۆژگاری سەرمایەداریدا، لە رۆژگاری پوکانەوەی دەرەبەگایەتیدا، لەو رۆژگارە کە ئیتر وڵاتە رۆژئاواییەکان بە تەواوەتی روودەکەنە ناوچەکە، ئیتر مەرکەزیەت پەیدا دەبێ، ئەو نیمچە سەربەخۆییەی کورد نامێنێ وەك ئەوسا، تەنانەت دوای ئەوەش کە ئیمارەتەکان روخان، گەلێك لە کەسانی ئەو بنەماڵانە رۆڵی گەورەیان هەبوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، هی وایان هەبوو گەیی بە پلەی وەزیر و سەرۆك وەزیر، هی وایان هەبوو گەیی بە پلەی باڵیۆز، هی وایان هەبوو گەیی بە پلەی شەیخول ئیسلام، لەبەر ئەوە ئێمە نابێ زۆر رەشبین بین لەو بوارە.

**دکتۆر کەمال مەزهەر لە بارەی سەلاحەدینی ئەیوبی دەدوێ ... رای خۆ دەربارە سوپاکەی و دەربارەی بۆ وەك کورد کوردایەتی نەکردووە ...**

د.کەمال مەزهەر: من زۆر بڕوام بەوانە نیە، جارێ ئەگەر سەلاحەدینیش نەبوایە دەبو رەهبەرێکی تر هەڵکەوتایە سەلیبیەکانی بوەستاندایە، ئەوە ئەوەنیە کە پەکیان لەسەر ئەو کەوتبێ، راستە لەوانەیە ئەو وەکو سەلاحەدین ئازا نەبوایە، بەلام دەبوو سەلاحەدین بێتە کایەوە، ئینجا کەی هەستی نەتەوەیی لەو کاتەدا هەبووە، تاکو من بێم داوا بکەم سەلاحەدین بەناوی کورد و کوردستانەوە بچێت شەڕی سەلیبی بکات، بەلام من شانازی بەوەوە دەکەم کە سەلاحەدینی ئەیوبی لەناو کوردا یەکێکی وا هەڵکەوتوە عەرەب خۆی کردویەتی بە رەهبەری لەشکرەکەی، دکتۆر محسن محمدامین کە ئەندامی کۆڕە، نامەیەکی دکتۆرای هەڵبژارد دەربارەی سەلاحەدینی ئەیوبی، (جیش سلاح الدین الایوبی)، تائیستا دووجار ئەو نامەی دکتۆرایە چاپکراوە، لەنامەی دکتۆراکەیدا نوسیویەتی دەڵێ لەسەدا چل و ئەوەندەی لەشکرەکەی سەلاحەدین کورد بوو، لە سەدا چل و ئەوەندەی لەشکرەکەی تورکمان بوو، ئەوانی تری عەرەب بوو، لە هۆڵێکی یەکجار گەورەی کۆلێژی ئاداب لە بەغدا نامەی دکتۆراکەی مامۆستا محسن گفتوگۆی لەسەر دەکرا، بەرنەدەکەوت، زۆرکەس بەپێوە دەوەستا، دنیایەك عەسکەری هاتبوو، یەکێك لە ئەندامانی توێژینەوەکە دکتۆر خاشع مەعازیدی بوو، کە هاوپۆلی منە لە کۆلیژ، زۆرم خۆشدەوێ، بەلام عەبدولرەحمان بەزاز خالیەتی، خۆی بوو بە بەعسی، هەرچەندە لەزەمانی سەدامدا لێشیاندا، ئەو زۆر توڕەبوو لە موحسین، وتی یەعنی تۆ هەموو جەیشەکەی سەلاحەدینت کرد بە ئەوەندەی کوردە و ئەوەندەی تورکمانە، ئەم عەرەبە لە کوێوە بوون، موحسین بەئەدەبەوە وتی مامۆستا جارێ من لەخۆمەوە لەو قسانەم نەهێناوە، ئەو قسانە عیمادەدین کاتب دەیکات، نازانم کێی مێژوونووسی عەرەب دەیکا، ئیبن ئەسیر دەیکا، من لەوانەم وەرگرتوە .

بەلام ئەگەر راستت دەوێ شەرمم کرد بنووسم کەوا ئەو لەسەدا دەی عەرەبە خیانەتیان لە سەلاحەدینی ئەیوبی کرد و لەژێرەوە چوون لەگەڵ سەلیبیەکاندا رێککەوتن. قاعەکە بوو بە پێکەنینێك، دکتۆر خاشع مەعازیدی ئەووەختە عەمیدی کۆلیژی تەربیە بوو، دکتۆر موحسینیش قوتابی ئەو کۆلێژە بوو، لەگەڵ ئەوەدا ئاوا پیاوانە ئەو وەلامە جوانەی دایەوە، ئەویش لێی قەبوڵ کرد، لەدواییدا نەعەزیەتی دا و نە هیچ، هەتا خانووی دایە لەنزیك کۆلیژی ئاداب و تەربیە، ئینجا موعین بەسیسۆ قسەیەکی زۆر جوانی هەیە کە دەڵێ (انتصر

صلاح الدين فغدا بطلا عربيا عضيماً، ولكن لو انتحر صلاح الدين لأعتبر كلبا كرديا حقيرا) مەسەلەکە ئاوایە، جرجیس زیدان لە کتێبی خۆیدا کە دێتە سەر باسی سەلاحەدینی ئەیوبی دەڵێ سەلاحەدین لەگەڵ ڕەهبەرە نزیکەکانی سوپاکەیدا بەزمانێك دەدوا کە ئەوانی تر تێنەدەگەیشتن، کە دیارە بە زمانی کوردی لەگەڵیاندا گفتوگۆی کردوە، سەلاحەدین دەخەمە ئەولاوە، ئەی باشە (مەشوب الهکاری) کە لە شاخەکانی هەکاریەوە کە ئێستا بنکەیەی سەرەکی پەکەکە (حزب العمال الکردستانی)یە، لەوێوە هاتوە چۆتە شەڕی خاچپەرستان، لەوێ دووجار بریندار کراوە، بۆیە ناوەکەیان گۆڕینەوە بە (مشوب الحکاری) یەعنی ئەوەی کە لە دەموچاویا بریندار کراوە، ئینجا (مەشوب الحکاری) ژن دێنێ، شەوی بوکێنیەکەی بۆ بەیانی دەچێتەوە بەرەی جەنگ لەوێ شەهید دەبێ، من ئەم (مەشوب الحکاری) بەلامەوە لە سەلاحەدینی ئەیوبی گەورەترە، هەر لە سەردەمی سەلاحەدینا بووە، د.محسن لەمن زیاتر شارەزایەتی.

**دکتۆر دەربارەی مێژوو دێتە دوان و دەڵێ ...**

من کتێبێکی تایبەتی سەربەخۆم هەیە دەربارەی مێژوو ، هەر بە ناوی مێژووە ، بە زمانی کوردی ، دواتر ڕۆڵی کورد لە مێژوودا ئەگەر سەیر بکەی بەرگی کتێبەکەم داربەڕوویەك کێشراوە کە ڕەگەکەی بە کەس هەڵناکەنرێ ، ئەو وێنەیە یەکێك لە دۆستەکانی کورد کە گاور بوو عەرەبیش بوو کاتێكماڵمان لە بەغداد بوو ، دراوسێمان بوو . پێم وت کە نیازم وایە کتێبێکی لەو بابەتە دەر بکەم ، دواتر ئەو وێنەیەی کێشا ، کە مانایەکی زۆر دەبەخشێ ، کاتی خۆی وێنەی دار بەڕوو لای ئەو عەرەبە سەبارەت بە مێژووی کورد ڕەگی داکوتاوە ، بە کەس هەڵناکەنرێ .

دەبێت ئەو کەسەی کە مێژوو دەنووسێتەوە دەبێت بێ لایەن بێت ، چونکە ئەگەر لە مێژوو نوسینەوە بێلایەن بوویت ، دەگەیتە ڕاستە مێژوویەکان بە وردەکاریەوە کە هەر ڕاستیەکانی بواری مێژوو .

بۆیە بەرژەوەندی کورد لەوەدایە ، کە مێژوو نووس بێلایەن بێت لە نووسینەکانی خۆیدا ، ئەبێت مێژوو نووسی کورد کاتێك مێژوو دەنوسێتەوە ئەوەی لە بیری بچێتەوە کوردە .

بۆ ئەوەی هەموو لایەنەکانی بخاتە بەر چاو ، گەلێکیش شانازی بەوە دەکەم ، پەرتوکێکم لە یەکێتی سۆڤیەت چاپ کراوە لە ساڵی (١٩٦٧) ، دەربارەی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد لە ساڵی (١٩١٨-١٩٣٢) (هێبرد ئیرڤانس) ، کە پیاوێکی ئینگلیزیە ، ئەو کتێبەی منی

هەڵسەنگاندووە ، کە هەرشتێ زیاتر کە من پێی بەختەوەرم ، ئەوەیە کەوا (هێبرد ئیرڤانس) هەستی نەکردووە کە من کوردم ، لە کتێکدا هەموو ژیانم لە کوردایەتی لە پێناو کورد ژیانم تەرخان کردووە . ئەگەر مێژوو نوسیش لایەندار بێت بە تەئکید بە هەڵە دەچێت ، ئەو کاتیش مێژووی ئەو مێژوو نووسە کە وا لایەنگرانە مێژووی نەتەوەکەی هەڵدەسەنگێنێ ئەوە شەڕی زیاترە لە خێرەکەی .

**دکتۆر دەربارەی ئاین پەیوەندی بە مێژووەوە بێت یان مێژووی ئایا دەبێت پەیوەندی بە ئاینەوە بێت و دەڵێ ..**

بۆچی ؟ چۆن دەتوانیت بێ ئایین بێت زۆر سەیرە ، بەڵام نابێت هەستی ئاینی وای لێ بکات ڕاستیە مێژوویەکان نەبینێت وەك خۆی ، ئەوە باش نیە (کورد دەوڵەتی خۆی لە دەست دابوو ، پێش ئەوەی ئاینی ئیسلام سەر هەڵبدات) ، کە ئاینی ئیسلامی سەریهەڵدا کورد خۆی نەتەوەیەکی ژێردەستە بوو دواتر کورد کەڵکی لە ئیسلام وەرگرت کاتێك ئیسلام یەکسانی بلاّو کردەوە بۆ هەموو نەتەوەکان ، بۆیە دەبینی گەلێك لە زانایانی ئیسلام بە ڕەگەز کوردن بەڵام ئەو مێژوو نووسەی بەهۆی ئاینەوە بەرژەوەندی نەتەوەی کورد دەخاتە ژێر پێیەوە ، ئەوە بە کارێکی زۆر نادرووست دەزانم .

**دکتۆر دەربارەی کورد بوونی یەزیدییەکان دەدوێ ...**

نەك خۆیان بە کورد دادەنێن ، بەڵکو یەزیدیەکان کوردایەتیان گەیشتۆتە ئاستی توندڕەوی ، بەڵام ئێمە ستەممان لێکردوون ، کاتی خۆی یەزیدی گەیشتۆتە کەرکوك ، ئێستا سنوورمان بۆ داناون هەر لە (سنجار)دان ، ئەوە وایان لێدەکات توندڕەو بن ، ڕابەرانی کورد وەکو شێخ عوبەیدوڵلاّی نەهری (١٨٨٠) یەکەم کەس بووە پێش عەرەب بە (٤٠) ساڵ دروشمی سەربەخۆیی کوردستانی بەرز کردۆتەوە ، قازی محەمەد ، شێخ سەعیدی پیران ، ئەوانە هەموو گیانیان بەخت کردووە لە پێناو کوردایەتی شێخ مەحمود هەرچی ئازار بوو کێشای لەبەر کوردایەتی .

هەموو ژیانم مێژووە ، فێربووم چۆن هەڵسوکەوت بکەم ئێستا هەر خزمەتی میللەتی کورد دەکەم ، ئەو ماوەیەش کە لە (لەندەن) بووم گەلێك دیداری زۆریان لەگەڵ ساز کردووم ، کە لە هەموویان گرنگتر لە (پەرلەمانی بەریتانیا) بوو .

## کیوی موکریانی
## ڕۆژهەڵاتی کوردستان
## ۱۹۰۳ – ۱۹۷۷ ز

ناوی تەواوی "عەبدولرەحمان لەتیف ئیسماعیل عەبدوڵلا لەتیف"ە و لە ساڵی ۱۹۰۳ لەشاری مهاباد لەدایکبووە .

لە ساڵی ۱۹۱۳ لەگەڵ حوسێن حوزنی برای چووە بۆ وڵاتی شام لە شاری حەڵەب تا ساڵی ۱۹۲۵ لەوێ نیشتەجێ بووە و خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەکانی حەڵەب خوێندووە ، لە ساڵی ۱۹۲٤-۱۹۲۵ چووە بۆ بەیرووت و لە دانیشگایەك فێری بنچینەی زمانی فەڕەنسی بووە ، لەساڵی ۱۹۱۵ حوسێنی برای مەکینەیەکی چاپی لە ئەڵمانیا کڕیوە و لە بازاڕچەی حەڵەبی داناوە .

لەساڵی ۱۹۲۵ لەگەڵ حوسێن حوزنی هاتوون بۆ عێراق و ماوەیەك لەشاری بەغدا نیشتەجێ بوون، هەر لەو ساڵەدا لەسەر داوای سەید تەهای شەمزینی بەڕێوبەرایەتی ئەوسای شارۆچکەی ڕەواندز و دۆستی دێرینیان لەشاری حەڵەبەوە چوون بۆ ڕواندز و چاپخانەکەیان لێ دامەزراندووە ، لەساڵانی ۱۹۲٦-۱۹۳۲ یاریدەری حوزنی و بەڕێوبەری گۆڤاری زاری کرمانجی بوو لە ڕواندز، لەساڵانی ۱۹۳۵-۱۹۳٦ کاری لە گۆڤاری ڕووناکیدا کردووە ، کە لەلایەن حوزنی و شێخ مستەفا لە ڕواندز و شاری هەولێر دەرچووە ، لەساڵی ۱۹۳۵ هاتۆتە هەولێر و لەگەڵ پیشەی وێنەگری و کاروباری چاپخانەکەشی بەڕێوبردووە ، هەر لەو ساڵەدا مەکینەیەکی گەورەتری بۆ چاپی کوردی لە مووسڵ لە فەزیل عیسا مەحفوز کڕیوە و لە هەولێر دایمەزراند بۆ چاپکردنی گۆڤاری ڕووناکی و پەرتووکی کوردی، لە ۱۹٤۷.۰۹.۲۰، کە حوسێن حوزنی موکریانی برای کۆچی دوایی دەکات، مەکینە کۆنەکەی زاری کرمانجی دەبێتە خاوەنی لەساڵی ۱۹٤۸ لەکاتی ڕاپەڕینە نیشتمانیەکەی گەلی عێراق و دوای وەدەستهێنانی هەندێ سەربەستی دیموکراتی لە وڵاتدا ناوی چاپخانەکەی زاری کرمانجی کردووە بە چاپخانەی کوردستان.

لەساڵی ۱۹٦۳ ناوی چاپخانەکەیان پێگۆڕیوە بە ناوی چاپخانەی هەولێر، لەساڵی ۱۹۷۰ لە دوای دەرچوونی بەیاننامە مێژووەیەکەی ۱۱ی ئادار ناوی چاپخانەکەی کردۆتەوە بە چاپخانەی کوردستان، لە نێو ئەم دەردە کوشندەیە ژیاوە ، تا کاتی نیوەڕۆی ڕۆژی ۱۹۷۷.۰۷.۲٤ لە نەخۆشخانەی شاری مووسڵ دڵە گەورەکەی لە لێدان دەکەوێ و لە

ئێوارەی هەمان ڕۆژدا لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد لە هەولێر لە تەنیشت نووسەر و مێژوونوسی ناودار حوسێن حوزنی موکریانی برایەوە بەخاك سپاردرا

گیو لە نوسینی پەخشانی کوردیدا شێوەیەکی سادەی بەکارهێناوە و زۆربەی نوسینەکانی ساد و ڕەوانن وتارەکانی بە وشەی جوانی کوردی نوسیون و ئەمەش پارچە پەشخانێکی ئەو کە لە نامیلکەی گیونامە هەڵ بژێرراوە و دەڵێ ...

ئەدەبیات و شوێنەوار بۆ هەموو گەلێك گەورەترین پشتیوانە و لە هەموو تەنگانە و لێقۆمانێکدا بەفریای دەکەوێ ، گەلێکی خاوەنی زمان و وێژەیی ئەگەر دەسەڵاتیشی لێ بروخێنێ کە تەکان بداتە خۆی سەرای سەرداریێتی خۆی لە جاران باشتر و خۆشتری بۆ دادەمەزرێنێتەوە .

یۆنانییەکان کە چەند سەدەیەك کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانییەکانەوە زمان و ئەدەبی یۆنان لە ئەوروپادا دەستە و لایەنگری بۆ پەیدا کردن تا ئازادکران .

ئێرانییەکانیش کە چەند سەدەیەك کەوتبوونە ژێر دەستیانەوە وێژەی فارسی رزگاری کردن .

عەرەبەکانیش کە چەندین سەدە بوو کەوتبوونە ژێر دەستی تورکەکانەوە زیندوویەتی زمانی عەرەبی ئەوانی گەڕاندەوە ژێر سێبەری داری ئازادی و ئەوەیان بەسەر تورکا هێنا ،هەروەکو بە چاوی خۆم دیتومە با بە دەواری شڕی نەکردووە .

هەموو گەلێك بە هۆی زمان و هەستی نەتەوایەتی و چەشنەکانی ژیانەوە لە هی تر جویێ دەکرێتەوە ، کەواتە ژیان و ئابڕووی هەموو نەتەوەیەك بەندیواری بەزمانەکەیەوە نەتەوەی خاوەن زمان نامرێ ، و مەرگی ڕاستەقینە ڕوو لە نەتەوەیەك دەکات کە لە بەرهەم نەتەوەکەی خۆی بەش براو بێ .

هەر هۆزێك بکەوێتە ژێر دەستی بێگانەوە سەربەخۆیی و ئازادێتی لە دەست دەردەچێ بەڵام دەستی لە ژیان بەرنابێ ، و ژیانی ئابڕوومەندانە بۆ نەتەوەی دیل تەنها پارێزگاری زمانەکەیەتی ، چونکە زمانی نەتەوەی دیل کلیلی گرتووخانەیە رزگار بوونی زۆر ئاسانە . بەڵام گەر هاتوو خوانەخواستە دەستی لە پارێزگاری زمانەکەی خۆی شل بێ هەروەکو ئازادیی لەدەست چووە . و پەردەی ناموسی نەتەوایەتیشی پارچە پارچە دەبێ .

هەرنەتەوەیەك زمانەکەی ڕوو لە بووژاندنەوە بکات ئەستێرەی بەخت و هیواشی سەر لە ئاسۆی دەردەهێنێ و گەلێکی بەزمانەکەی خۆی ڕێگای زانست و هونەر بگرێتە پێش بە

هەموو ئاوات و ئامانجێکی بەرز و پیرۆزی خۆی دەگات . ئەو نەتەوەیە بەختیار و کامەرانە ، و ئەو وڵاتە روو لە هات و شارستانێتی و ئاوەدانییە کە شارێگای بوژانەوە و پێشکەوتنیان بە چرای زانست و هونەرێك رەوشەن بکرێتەوە کە بە زمانەکانی خوێندەوار و هەڵسووڕێ و ئەو هۆزە بە بەختیار دەژمێردرێت کە رابەر و پێشەوایەکان خوێندەوار و زانستپەروەر و هونەر پەروەر بن بەو مەرجەی زمانی وێژەییان بە زمانەکەی خۆیان بێت .

## مامۆستا مەلا عەبدولكەریمی مودەریس
## باشوری كوردستان
## ( ١٩٠١ – ٢٠٠٥ ز )

"مەلا عەبدولكەریمی مودەریس" لە بەهاری ساڵی ١٩٠١دا لە گوندی تەكیەی سەر بەشارۆچكەی خورماڵ هاتووەتە دنیاوە و ناوی تەواویشی "عەبدولكەریم محەمەد فەتاح"ە و سەرەتای خوێندنیشی بە قورئان و پەرتوكە ئاینییەكان دەستپێكردووە و ساڵی ١٩١٣یش سەرەتاكانی "نەحو سەرف"ی خوێندووە، زۆر لە شوێن و جێگاكانی كوردستان گەڕاوە و لە مامۆستا ناودارو بەرزەكان خوێندوویەتی ، لەسەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانیشدا لەمزگەوتی مەڵكەندی شاری سلێمانی نیشتەجێبووەو دەستی بەخوێندنی پەرتووكی "شەرحی جامی" كردووە و دواتر چووەتە مزگەوتی "مەلا محەمەد ئەمین بالیكەدەر"ی و لە ساڵی ١٩٢٤یشدا لە ئاهەنگێكی فراواندا لە شاری سلێمانی مۆڵەت و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە .

مامۆستای مودەڕیس پاش وەرگرتنی مۆڵەتی مەلایەتی لە زۆریك لە شوێنەكانی كوردستان و عێراقدا خزمەتی زۆری بە خەڵكی گەیاندووە لە بیارەی شەریفە كە بە مودەڕیس ناوبانگی دەركردبوو ، خزمەتێكی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشتوو پاشان لە سلێمانی و كەركوك و تا دوا جار لە شاری بەغداد لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی نێشتەجێ بوو لەوێ دەستی دایە خزمەتی نوسین و وانە وتنەوە و بە سەدان كوردی كوردستان و پارچەكانی تر دەچوونە خزمەتی و سوودیان لێ دەبینی .

لەساڵی ١٩٦٠یشدا لە مزگەوتی "شێخ عەبدولقادری گەیلانی" لەبەغدا بەناونیشانی "مودەریس" دامەزراوە، زیاتر لە ٥٠ فەقێ لەسەردەستی مۆڵەتی زانستییان وەرگرتووە ، هەر لەو كاتەوە بەبێ پشوودان خەریكی وانەوتنەوە بووە لە زانستە شەرعی و وێژەی و عەرەبییەكاندا. مەلا عەبدولكەریمی مودەریس چەندین پەرتووك و بەرهەمی وەك نووسینەوەی ژیان و بەسەرهات و شیعری چەندین شاعیری وەك "مەولانا خالید" و "شێخ عوسمان و سەراجەدین"ی بڵاوكردووتەوە ، هەروەها چەندین شیعریشی لەژێر نازناوی "نامی" بڵاوكردووەتەوە ، هەروەها ڕۆڵێكی گرنگی هەبووە لە بەكوردیكردنی فیقهی ئیسلامی و تەفیسری قورئانی پیرۆز و تەجویدەكەیدا.

دەستێکی باڵای هەبوو لە چەندین بواردا ... یەکێك بوو لە زانا بلیمەت و لێهاتووەکانی ئیسلام و ئێستە فەتواکانیشی لە ناو زانایانی ئیسلامدا بە هەل وەردەگیرێت و کاری پێدەکرێت لە بواری ئەدەب و بەلاغەتدا دەستێکی باڵای هەبوو لە بواری مەنتیق و ئوصوڵدا لە بواری هۆنینەوەی هۆنراوە کە چەندین پەرتووکی بە هۆنراوە هۆنیوەتەوە چ لە بواری مێژوو و فیقە و کۆمەڵایەتی ....

مامۆستا بە یەکێك لە شاعیرانی کورد ناسراوە و نازناوی (نامی) یە کە دەستێکی باڵای هەبووە لە لێکدانەوەی شیعری شاعیراندا و خزمەتێکی گەورەی کردووە بە هونەرو هۆنەران

مامۆستا لە بواری زۆردا هۆنراوەی هۆنیوەتەوە لەوانە ...

دەربارەی زانست و زانین دەفەرموێ ...

عیلم عەشرەتە و عیلم بـــرایــــە    لە بۆ ڕۆژی ڕەش عیلم چرایــــە
هەرکەس زانا بێ بۆ کەس دانا بـێ    هەر کەس ڕدانە بێ پایەی بالایە

عیلم بیلبیلەی چاوی جیهانــــــە    عیلم زنجیری ملی دێوانــــــە
ئەوەی لە عیلم و زانین بێ بەش بـێ    دانیشتووی چاڵی ڕەشی زیندانە

دەربارەی دڵسۆزی بۆ خەڵك و گەل دەفەرموێ ...

یەکێ بێ غەم بێ لە غەمی عالـەم    قەد نەیژمێری بە بەنی ئـادەم
خاوەن وێژدانان خەفەتبار ئەبـــن    کاتێ بزانن بەخەمی عالــــەم

فرمێسکی چاوی هەتیوی بێ کـەس    یەکێ بیسڕێ لەبەر خودا و بـــەس
لە کاتی دەرد و ئازاری ئــــەودا    خوا ئەنێرێ بۆی دەستی فریادڕەس

عەبباسە دزەی خەڵکی ( خالیصات )    گەلێ دزی کرد لە هـــەرلای وڵات
بە هۆی بەزەیی بە دوو هەتیـــــوا    ئەنجامی خەیری کرا بەخـــــەڵات

دەربارەی خیانەت کردن دەفەرموێ ...

خیانەت مەکەن خیانەت عــــــارە بەری خەیانەت وەك زەهری مارە
ئینسانی خائین هەر ڕسوا دەبــــێ    فریشتەی حیساب زۆر خەبەردارە

شەخسی بێ تاوان قەد مەخەنـە داو    ئاگر ڕای ماڵێ یاخود بیبا ئـــاو

ئەو کەسەی داوێ دانیێ لە رێــــدا		سەرەنجام خۆی ئەوکەوێتە نــــاو

هەموو کەس رۆڵەی خۆی خۆش ئەوێ		بە نەخۆشی ئەو نەخۆش ئەکـەوێ
دەی بۆ بێ رەحمی لە گەڵ رۆڵەی من		چاکەت بۆ منیش وەکو خۆت بـوێ

مامۆستا دەربارەی پیلانگێڕەکان دەڵێ ...

پیلانگێڕەکان لە رۆوی رۆژگــــــار		رێتەگرن لە رۆوی رێبواری هــەژار
چەند هاوار بکا مەیدانی نــــادەن		تا توشی نەکەن بە ئێش و ئــازار

ئەڵێم رێبوارم بە رێدا ئــــــەڕۆم  رێگەرم لێەگرن منیش وەکو تۆم
با هەردوو بڕۆین بەرێی ئینسافــــا		خۆ تۆ لە منی و منیش خۆ لە تـۆم

شەخسی پیلانگێر دڵ پێی ئەتــەزێ		لە دوو سەرەوە ئینسان ئەگـــەزێ
کلکی دووپشکە و سەری رەشمـــارە		بەدەم ئەگەزێ و بە دەم ئەچـــزێ

ئەو توتکە سەگەی دایکی ئەمــــژێ		ئەوەڕێ لەوەی دایکی ئەکــــوژێ
یەکێ دێوانەی گۆشتی بەراز بـــێ بە دوای بەرازا خوێنی ئــــــەڕژێ

بۆیـــە ئەترســـم توتکە بـــوەڕێ  کەماڵ تێتەگا و بۆم دەرئەپـــەڕێ
پلانگێڕ دونیا ئەکا بـــە ئاشـــوب  لەسەر بەهانە بۆ شەڕ ئەگـــەڕێ

دەربارەی پیشە و پیشەسازی دەفەرموێ ...

هەرکەس صنعاتێك نەزانی بۆ خـۆی		ئەم سەرزەوییە زیندانە لە بـــۆی
پیشەیەکی باش فێر بە بۆ خـــۆت تابەنەوشت بێ ئەو نانەی ئەیخۆیت

پیشە بۆ بەشەر ئاڵتونی نەختـــــە  مەردی پیشەوەر سەرداری وەختە
هۆی ژینی خۆشە زانست و پیشـــە		پیاوی بێ سنعەت ژیانی سەختــە

دەربارەی خۆشەویستی نیشتیمان دەفەرموێ ...

(حـــب الوگـــن من الایمـــان ) ئەگەر بەراستی مەعنای بەزانــــی
ئەتۆ لە خاکی و خاکت خۆش بووێ		گۆڕستانی خۆت بکە بە نورانــــی

پیاو ئەبێ دڵی لە لا وەتەن بـــێ  گیرۆەی خاك و هەوای وەتەن بـێ
نەتەوەی رەسەن لە سەر رەسەنــــە		ئەولادی (عەلی) ئەبێ (حەسن) بێ

هەرکەس پێی نەبێ نیشانەی بابــی　　　تەبعی تێکەڵە لە نا حیسابـــــــی

نابێ ئینسانێ رەسەنی ساغ بــــێ　　　لای نەبێ سیما و سیرەتی بابـــــی

مامۆستا دەربارەی عەدل و داد دەفەرموێ ...

باران کە بار دەبێت بە گەوهـــــەر دەرژێتە خاکی گەورەی دادگەر

بەڵام لە موڵکی پیــــاوی زۆردارا درك سەوز دەبێ لە جێی گوڵزارا

مامۆستا چەندین کتێب و پەرتوکی بە هۆنراوە هۆنیوەتەوە و لە هەمو بوارەکاندا هۆنراوەی وتوە

نموونەی ژمارەیەك لە پەرتووکە بەنرخەکانی بەزمانی کوردی ئەمانەن: یادی مەردان و دووبەرگ، بنەماڵەی زانیاران، ژمارەیەك پەرتووك لە بارەی شەریعەت و ئیسلامەوە ، کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند، تەفسیری نامی حەوت بەرگ، مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ چوار بەرگ، عەقیدەی مەرزیەی مەولەوی، دیوانی نالی، دیوانی مەولەوی، دیوانی مەحوی و چەندین پەرتووکی دیکە بەزمانی کوردی و عەرەبی و فارسی نووسیوەو بڵاویکردۆتەوە .

دیارە جەنابی مامۆستا "مەلا عەبدولکەریمی مودەریس"، لەبەر ئەوەی لەسەر ئاستی عێراقیش بە زانایەکی گەورە ناسرابوو و خاوەن فتوای ئایینی بووە ، بۆیە چەندین ساڵ پۆستی سەرۆکایەتی "رابطة علماء العراق"ی بەدەستەوە گرتبوو، لەوەش گرنگتر لەم ساڵانەی دوایی ٣ هەزار زانای ئایینی سوننی ڕێڕەو کە لە هەموو پارێزگاکانی عێراق هاتبوون و لە بەغدا کۆبوونەوە، بەبێ بەشداریکردن و ئاگاداری خۆی جەنابی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بە سەرۆکی (الامانة العليا للافتاء و التدريس و البحوث و التصوف) هەڵبژێراو، بەڵام لەبەر ئەوەی باری تەندروستی نالەباربووە ڕەتیکردبۆوە . سەرەڕای ئەوەی ماوەیەك ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد - بووە، هەروەها باوەڕپێکراوی کۆڕی زانیاری وڵاتی ئوردون بووە.

کەسایەتی گەورەی ئایینی و ئەدیب و زانای گەلی کورد مامۆستا "مەلا عەبدولکەریمی مودەریس" لەتەمەنی ١٠٤ ساڵیدا لە کاژمێر ١٢ی شەوی ٢٩ لەسەر ٢٠٠٥.٠٨.٣٠ لە شاری بەغدای پایتەختی وڵاتی عێراق کۆچی دواییکرد

یەکێ لە پیاوە هەرە مەزن و بلیمەتانەی کورد، جەنابی  مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس ە ، کە نووسەر و زانایەکی هەرە گەورەی سەدەی بیستەمە .. کە زیاتر لە ٦٠ پەرتووکی زێدە بەنرخی ئایینی و ویژەی و کۆمەڵایەتی بڵاوکردۆتەوە ، هەر هەمووشیان دەچنە خانەی لێکۆڵینەوەی زانستی هەمەلایەنی، خوایی و دونیایی، کە بریتین لە تەفسیری قورئان بەشێوەیەکی ئێجگار فراوان و بەزمانی کوردی و عەرەبی، هەروەها ساغکردنەوە و شیکردنەوەی چەندین شاکاری شیعری مەزنی کلاسیکی کوردی، نموونەی "مەولەوی، نالی، مەحوی، فەقێ قادری هەمەوەندی...هتد."

بە ئەندازەیەك گەر هەموو بەرهەمەکانی کۆبکەیتەوە ونەوەوی ئاسا دابەشی سەر ڕۆژەکانی ژیانی بکەیت بێگومانم لەوەی کە ژمارەیەکی چاکمان بدات بە دەستەوە، ڕاستی ئەم بۆچوونە واقیع دەیسەلمێنێت و ئەو دەوڵەمەند کردنەی پەراوگەی کوردی و عەرەبی بەدەیان پەڕاوی بەنرخ و بەبەها، وێڕای ئەوەی کە خەڵکی بەغدا پێیان دەوت شافیعی بچکۆلە، ئەویش لەبەرئەوەی کە گەیشتبووە پلەیەکی زۆر بەرزی زانیاری.

### زمانی فارسی

بەم شێوەیەی لای خوارەوە ڕیزبەندی پەڕاوەکانی مامۆستا دەکەین، سەرەتا بە پەڕاوێ دەست پێ دەکەین کە بەزمانی فارسی نووسی بە ناونیشانی (شمشیرکاری برفرق نسیم رستکاری)، کرۆکی ئەم پەڕاوە بریتی بوو لەوەڵامدانەوەیەکی چڕ و پڕ و تێروتەسەلی ئەو کەسانەی کە ئینکاری بابەتەکانی تەقلید و ئیجتهادیان دەکرد، شایانی باسە ئەم پەڕاوە لە ساڵی ١٩٣٨دا بە چاپ گەیەنرا.

### پەڕاوە کوردیەکان

شایانی باسە مامۆستا لەم بوارەدا زۆر ڕۆچوو و دەیەها پەڕاوی جۆراو جۆری بەچاپ گەیاند لەهەموو بوارە جیاجیاکانی زانست و زانیاری و ئەدەب و شیعر و پەخشان و سەرجەم بوارەکانی تری ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بەم شێوەیەی لای خوارەوە باس لە پەڕاوەکان دەکەین :

١: پەڕاوی شەریعەتی ئیسلام کە پەڕاوێکی فیقهی شەرع ناسی لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعی و ئەم پەڕاوە لەساڵی ١٩٥٩ دا لە چوار بەرگدا بە چاپ گەیەنرا، شایانی باسە ئەم پەڕاوە پێناسەیەکە بۆ پەڕاوی یەکێك لە زانا بەرزەکانی فیقهی شافعی کە زۆرینەی کورد لەسەر مەزهەبی شافعین و ئەو پەڕاوەش منهاج النوويیە.

٢: لێکدانەوەی هۆنراوەی هۆنەرە بەرز و بەناوبانگەکانی کورد، دەسپێك بە شرۆڤە کردن و لێکدانەوەی دیوانی نالی، کە لە پەڕاوێکی گەورەدا لە نزیکەی ٧٠٠ لاپەڕەدا بەچاپ گەیەنرا لەساڵی ١٩٧٦.

٣: پاشان لێکدانەوەی هۆنراوەکانی سوار چاکی بواری تەسەوف و خواناسی، دیوانی مەحوی کە لەساڵی ١٩٧٧دا بەچاپ گەیەنرا، شایانی باسە مامۆستا لێکدانەوەیەکی زۆر جوان و نایابی بۆ وشە و زاراوەکانی نێو ئەم دیوانانە کردووە.

٤: دیوانی مەولەوی بەرهەمێکی تری مامۆستا بوو، کەبە شێوەزاری هەورامی نوسراوە و مامۆستا لێکدانەوەیەکی زۆر جوانی بۆ کردووە و لەساڵی ١٩٦١ دا بەچاپی گەیاندووە.

٥: پەڕاوی بەهار وگوڵزار کە تایبەت بە هۆنراوە و پەخشانە و سەبارەت ئامۆژگاری و پەند و حیکمەت و ئەدەبە و لە ساڵی ١٩٧٧دا بە چاپی گەیاند.

٦: مامۆستا کە رێبازی تەسەوفی هەڵبژارد بوو، لەم بوارەشدا بەپەڕاو بەشداری کردووە لەبەرز ڕاگرتنی یادی هەموو ئەو کەسانەی کە میابیح الهدي بوون و لەپەڕاوێکیدا بە ناوی یادی مەردان کە لە دوو بەرگدا بلاوکراوەتەوە باس لە مەولانا خالیدی نەقشەبەندی و سەرجەم ئەو زانا و دانایانەی رێبازی رێبازی نەقشەبەندی دەکات، شایانی باسە دوو بەرگی ئەم پەڕاوە لە دوو ساڵی جیاوازدا بلاوبویەوە، بەرگی یەکەمیان لەساڵی ١٩٧٩ و بەرگی دووەمی ئەم پەڕاوە لەساڵی ١٩٨٣دا بلاوبویەوە.

٧: لەبواری لێکدانەوەی قورئانی پیرۆزدا، مامۆستا تەفسیرێکی بەنرخی بۆ کتێبخانەی کوردی دوای خۆی بەجێهێلاً بە ناوی تەفسیری نامی کە لەحەوت بەرگدا خۆی بینیوەتەوە و هەر بەرگەی لە ساڵێکدا بەچاپ گەیەنراوە، بەم شێوەیە، بەرگی یەکەم لە ساڵی ١٩٧٥، بەرگی دووەم لە ساڵی ١٩٨٠و بەرگی سێهەمی لەساڵی ١٩٨١و بەرگی چوارەمیش لە ١٩٨٢ و بەرگی پێنجەم لە ساڵی ١٩٨٣دا و بەرگی شەشەم لەساڵی ١٩٨٤ و بەرگی حەوتەم و کۆتایی لە ساڵی ١٩٨٤دا بەچاپ گەیاند.

٨: لێکدانەوەی دیوانی فەقێ قادری هەمەوەندی لە ژێر ناونیشانی (کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند)، کە ئەمیش وەك پەڕاوەکانی تر لێکدانەوەیەکی تێر و تەسەلە سەبارەت بە شیعرەکانی فەقێ قادر، شایانی باسە ئەم پەڕاوەی مامۆستا لە ساڵی ١٩٨٣ دا بەچاپ گەیەنراوە.

٩: پەڕاوی بارانی ڕەحمەت کە لەساڵی ١٩٨٢دا بە چاپی گەیاند.

١٠: پاشان پەڕاوێکی زۆر بەنرخی لەهەمان ساڵدا واتە ١٩٨٢ دا نوسی بەناوی سەرچاوەی ئاینی، کە ماموٚستا ئەم پەڕاوە بەنرخەی دابەشکرد بەسەر چەند بەشێکدا و بۆ هەموو بەشێك ناونیشانێکی دیاریکراوی دانا، بۆ نمونە: بەشی یەکەمی ئەم پەڕاوەی ناونا ئیمان و ئیسلام کە تیایدا بنەماکانی ئەم دوو چەمکە گرنگەی خستۆتە ڕوو، بەشی دووەمیشی ناونا ئەساسی سەعادەت واتە بنەماکانی بەختەوەری کە زیاتر باس لە ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام دەکات، کە ئەوانیش دەرهاویشتەی بیروباوەڕن. بەشی سێیەم بەناوی ئاوی حەیات لەم بەشەدا ماموٚستا باسی مێژووی پێغەمبەران و حاڵ و ئەحواڵیان و ناو و ڕێبازیان دەکات. بەشی چوارەم بەناوی چل چرای ئیسلام کە تیایدا ماموٚستا چل فەرمودەی پێغەمبەری سالاری هێناوە و بەوردی بۆ وتارخوێن و ئاموٚژگاریکارەکان ڕوونی کردۆتەوە. بەشی پێنجەم بە ناوی نور و نەجات کە تیایدا ماموٚستا قەصیدەیەکی درێژی نوسیوە لە مەدحی سەرداری پێغەمبەران. بەشی شەشەم و کۆتایی لە ژێر ناونیشانی ئیقبال نامەدا بوو تیایدا ماموٚستا چەردەیەك حیکمەت و وتەی پڕ مانای خستووەتە ڕوو.

١١. پەڕاوی مەولوود نامە و میعراج نامە کە تیایدا ماموٚستا بە شێوازە ناوازە و جوانەکەی ئەم دوو جومگەی ژیانی پێغەمبەری سالاری خستووەتە ڕوو لەدایك بوونی، لەگەڵ گەشتی شەوڕەویی و بەرزبونەوەی بەئاسمانەکاندا و لیقای لەگەڵ خالقدا، شایانی باسە ئەم پەڕاوە لەساڵی ١٩٨٢ دا بەچاپ گەیەنرا.

١٢: ماموٚستا مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخی لە زمانی فارسیەوە وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی لە چوار بەرگدا و بە جیا بەچاپی گەیاند، بەرگی یەکەم لەساڵی ١٩٨٤. بەرگی دووەم لە ساڵی ١٩٨٨ و بەرگی سێیەم لە ساڵی ١٩٨٩ و بەرگی چوارەم لە ساڵی ١٩٩١دا.

١٣: پەڕاوی نوری قورئان لەم پەڕاوەدا ماموٚستا باس لە مانای قورئان و سەرەتای کۆکردنەوەی قورئان دەکات، لەگەڵ تەرخانکردنی بەشێکی باش بۆ باسی تەجویدی قورئان، شایانی باسە ئەم پەڕاوەی لە ساڵی ١٩٨٥دا بە چاپ گەیەنرا.

١٤: پەڕاوی ڕێگای بەهەشت تیایدا باس لە سروشتی ڕێگای بەرەو خوا چوون و سەرخستنی ئیسلام دەکات، ئەم پەڕاوەشی لەساڵی ١٩٨٦ بەچاپی گەیاند.

١٥: پەڕاوی سەنا و سکالا لەساڵی ١٩٨٧ بەچاپی گەیاند.

١٦: پەڕاوی حەج نامە کە تیایدا ماموٚستا هەموو مەناسیکەکانی حەج باس دەکات، لەگەڵ ئاماژە کردن بە ئادابەکانی ئەم گەشتە مەزنە لە ئیسلامدا.

١٧: پەڕاوی نوری ئیسلام لەساڵی ١٩٨٨ دا بە چاپی گەیاند.

١٨: لێکدانەوەی هۆنراوەی ڕێکخراوی عەقیدەی مەولەوی ناسراو بەعەقیدەی مەرزیە، کە تیایدا باس لە پێگە و بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەکات، ئەم پەڕاوەش لە ساڵی ١٩٨٢ دا بەچاپ گەیاند.

١٩: پەڕاوی نامەی هوشیار و لە ساڵی ١٩٩٢ دا بە چاپی گەیاند.

٢٠: پەڕاوی ڕێگای ڕەهبەر کە مامۆستا بە شێوەیەکی زۆر جوان باس لە زانستی فەرموودەناسی پێغەمبەرمان بۆ دەکات، شایانی باسە مامۆستا ئەم پەڕاوەی لەساڵی ١٩٨٥ دا بەچاپ گەیاند.

٢١: پەڕاوی بەدیع و عەروزی نامی کە بەشێوازی هۆنراوە دایڕشتبوو لە بواری زانستی بەدیع و عەروزدا و لەساڵی ١٩٩١دا بە چاپی گەیاند.

٢٢: پەڕاوی دوو ڕشتە کە بریتیە لە فەرهەنگێکی زمانەوانی عەرەبی-کوردی لەساڵی ١٩٩٢ دا بە چاپی گەیاند.

٢٣: پەڕاوی خولاسەی تەفسیری نامی کە مامۆستا تیایدا تەفسیری قورئانی پیرۆزی کردووە و لەسێ بەرگدا لە ساڵی ٢٠٠٠دا بەچاپی گەیاندووە.

بەم شێوەیە مامۆستا ئەم پەڕاوە نایەبانەی بە زمانی شیرینی کوردی نوسیوە بۆ هاوزمانەکانی تاوەکو لەڕێگەیەوە بەتەواوەتی شارەزایی پەیدا بکەن سەبارەت بە ئاینەکەیان، وێڕای ئەوەی مامۆستا بە ورە بەرزی خۆیەوە هێزێکی لەبن نەهاتووی هەبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەوری ڕەشی جەهالەت و نەفامی و نەزانی، ئەم ڕاستیەش لەپەڕاوەکانی مامۆستاوە زۆر بەئاشکرا دەردەکەون، چونکە مامۆستا توانی لەدەرگای هەموو زانستەکان بدات تەفسیری قورئان، زانستەکانی قورئان، زانستەکانی فەرموودە، فیقهی ئیسلامی، بابەتەکانی ئوصوڵی ئیسلامی، عەقیدەی ئیسلامی، ئەخلاقیات، تەسەوف، زانستی زمانەوانی، بەدیع و عەروز، لێکدانەوەی شیعری کەڵەشاعیرانی کورد و دەیەها زانستی تر...، ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە وەك لەسەرەتاوە ئاماژەمان پێدا مامۆستا فەرهەنگێکی زانیاری بووە و بەوپەڕی توانا و لێهاتنەوە لەهەموو بوارەکانی مەعریفە شوێن دەستی دیار بووە.

بەهەمان شێوە مامۆستا لە بواری زمانی عەرەبیدا دەیەها پەڕاوی بەنرخی پێشکەشی کتێبخانەی ئیسلامی و کوردی کردووە، ئەم پەڕاوانەشی بەوێنەی پەڕاوە کوردیەکان

سیفەتی گشتگیریان هەبوو، لەخوارەوە بە کورتی و بەخێرایی باسی ناوی ئەو پەڕاوانە دەکەین کە مامۆستا بە زمانی عەرەبی بەچاپی گەیاندن لە ژیانی خۆیدا.

**پەڕاوە عەرەبیەکان**

١: علماؤنا في خدمه العلم والدين تيايدا چەندەها زانای پایەبەرزی کوردی باس کردووە، ئەم پەڕاوە لەساڵی ١٩٨٣دا بەچاپ گەیاندووە.

٢: پەڕاوی مواهب الرحمن في تفسير القران کە تیایدا مامۆستا لە حەوت بەرگی قەشەنگدا تەفسیری قورئانی پیرۆزمان بۆ دەکات، شایانی باسە بەرگەکانی ئەم تەفسیرە بە جیاجیا لە چاپ درا، بەم شێوەیەی لای خوارەوە، بەشی یەکەم لەساڵی ١٩٨٦، بەشی دووەم لەساڵی ١٩٨٦، بەهەمان شێوە بەشی سێیەم لە ساڵی ١٩٨٦ بە چاپ گەیەنرا، بەشی چوارەم وپێنجەم لە ساڵی ١٩٨٧دا، بەشی شەشەم لەساڵی ١٩٨٨دا بەشی حەوتەمیش لەساڵی ١٩٨٨دا بەچاپ گەیاند.

٣: پەڕاوێکی زۆر بەنرخ و بەهێز کە لەژێر ناونیشانی الوسيله في شرح الفضيلة کە تیایدا لێکدانەوەیەکی تێروتەسەلی کردووە بۆ پەیامی فەزیلەی مەولەوی و بەشێوەی هۆنراوە نوسیویەتی و کۆی گشتی بەیتە شیعریەکانی ٢٠٣١ بەیتە و لەساڵی ١٩٧٢دا بەچاپی گەیاند.

٤: پاشان پەڕاوی رسائل العرفان في النحو و الصَرف و الوضع و البيان لە ساڵی ١٩٧٨ دا بەچاپی گەیاند.

٥: پەڕاوی رسائل الرحمة في المنطق و الحكمة لە ساڵی ١٩٨٧دا بەچاپی گەیاند.

٦: پەڕاوی نور الايمان لەساڵی ١٩٨٧دا بەچاپی گەیاند.

٧: پەڕاوی الرسالة و انوارها لە ساڵی ١٩٨٩ بە چاپ گەیاند.

٨: پەڕاوی الانوار القدسية في الاحوال الشخصِيَة لە ساڵی ١٩٩٠ دا لەچاپی دا.

٩: پەڕاوی جواهر الفتاوى او خير الزاد في الارشاد في الفقة کە مامۆستا لەسێ بەرگدا لە ساڵی ١٩٩٢ دا بە چاپی گەیاند.

١٠: پەڕاوی نور الإسلام في العقائد کە پەڕاوێکی عەقیدەییە و لەساڵی ١٩٧٨ دا بەچاپی گەیاندووە.

١١: پەڕاوی ارشاد الانام الى اركان الاسلام لەساڵی ١٩٩٠ دا بەچاپی گەیاند.

١٢: پەڕاوی جواهر الكلام في عقائد اهل الاسلام كە باسێكی عەقیدیانەیە و لەساڵی ١٩٩٣ دا بە چاپ گەیەنرا.

١٣: پەڕاوی اعلام بالغيب و الهام بلا ريب لەساڵی ١٩٩٤ دا بەچاپی گەیاند.

١٤: پەڕاوی الوردة العنبرية في سيرة حضرة خير البرية كە بەشێوەی شیعر نوسیویەتی و پاشان لێكدانەوەی بۆ كردووە.

١٥: پەڕاوی المواهب الحميدة في حل الفريدة كە تیایدا لێكدانەوەیەكی قوڵی كردووە بۆ پەڕاوە شیعری الفریدەی ئیمامی سیوتی.

١٦: پەڕاوی فوائد الفوائح في شرح منظومة الفوائح‌ی لەساڵی ١٩٩٥ دا بەچاپ گەیاند.

١٧: پەڕاوی صفوة الالي من مستصفى الامام الغزالي.

١٨: پەڕاوی اسناد الاعلام الى حضرة سيد الرِنام لەساڵی ١٩٩٥ دا بەچاپ گەیەنرا.

١٩: پەڕاوی القَيِّدة الوردية في سيرة خير البرية كە قەصیدەیەكی درێژ و پڕ مانایە بەسەر حەزرەتی پێغەمبەرەوە(د.خ)، ناوی ناوە قەصیدەی گوڵاوی، لە ساڵی ١٩٩٥ بە چاپ گەیەنرا.

٢٠: پەڕاوی اليَرف الواضح للمبتدئين في علم الصرف پەڕاوێكی زانستییە، بۆ قۆناغی سەرەتایی دانراوە لە زانستی صەرفدا.

٢١: پەڕاوی مفتاح الآداب في النحو كلیلی زمانەوانییە بۆ فێربوونی زانستی (نحو) ئەمیش بۆ قۆناغی سەرەتایی.

٢٢: پەڕاوی المفتاح في المنطق ئەم پەڕاوەش لە بواری زانسی مەنتیقدایە كە كلیلێكی زۆر گرنگ و باشە بۆ چوونە ناو زانستی مەنتیق و فەلسەفەوە.

٢٣: پەڕاوی العزيزة في المنطق كە ئەمەش پەڕاوێكی تری مامۆستایە هەر لە بواری مەنتیقدا، شایانی باسە مامۆستا لەم زنجیرەی مەنتیقدا بە سێیەم پەڕاو باس لە مەنتیق دەكات.

٢٤: پەڕاوی الوجيه في المنطق كە بابەتی مەنتیق و فەلسەفەی مامۆستا بووە.

٢٥: پەڕاوی الورقات في المنطق.

٢٦: پەڕاوی خلاصة البيان في الوضع والبيان كە باس لە بنەماكانی بەیان و زمان پاراوی دەكات.

٢٧: پەڕاوی رسالة طب القلوب کە تیایدا باسی خۆراکی ڕاستەقینەی دڵپاك.

پەڕاوە دەستنووسەکانی مامۆستا

یەکەم: بە زمانی کوردی

١: پەڕاوی وتاری ئاینی بۆ ڕۆژی هەینی ئەم پەڕاوە زیاتر هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی تیا بەکارهێنراوە، دەلیل نامەیەکی مامۆستایانی مینبەرە، لە ساڵی ١٩٨٣ دا نوسیویەتی.

٢: پەڕاوی شەمامەی بۆندار کە باس لە حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری دەکات.

٣: پەڕاوی لێکۆڵینەوەی دیوانی مەلا مستەفای بێسارانی.

٤: پەڕاوی پەیڕەوان کە باس لە مورید و خەلیفەکانی شێخ (عوسمان سیراجەددین) دەکات، لەگەڵ باس و خواسێکی منداڵەکانی.

٥: پەڕاوی بنەماڵەکانی کوردستان کە پێناسەیەکی تەفێلییە بەو ماڵانەی کە لە کوردستاندا بەناوبانگ بوون بە زانست و زانیاریی و دینداری.

دووەم: بە زمانی عەرەبی

١: پەڕاوی التصريف الزنجاني کە مامۆستا بە زمانی عەرەبی لە ساڵی ١٩٨٣ دا نوسیویەتی و لەبواری زمان و (صرف) دایە.

٢: پەڕاوی ارشاد المناسك الى المناسك مامۆستا ئەم پەڕاوەی لە ساڵی ١٩٨٣ دا نوسیوە.

مامۆستای ڕەحمەتی جگە لەم پەرتوکانەش چەندەها بابەت و فەتوای ل گۆڤار و ڕۆژنامە و نوسینە دەستەکاندا نوسیوە و هەردەم لە خزمەت بە شەریعەت و مسوڵمانان بەردەوام بووە . وا ئێستەش ناو و نوسینەکانی لە ناو مسوڵماناندا ماوە و ناوی قەد نامرێ ...

## پێرست

نالی ........................................(٣)
هەژار........................................(١٧)
احمدی خانی ........................................(٢٣)
فایق بێکەس ........................................(٣٥)
جگەر خوێن........................................(٤٢)
دڵزار........................................(٤٨)
دڵدار ........................................(٥٥)
احمد موختار جاف........................................(٦٢)
گۆران ........................................(٦٧)
قانع ........................................(٨٣)
زێوەر ........................................(٩٢)
کۆیی ........................................(١٠٠)
پیرەمێرد ........................................(١١٤)
مەولەوی ........................................(١٢٩)
هێمن ........................................(١٤٨)
بێسارانی ........................................(١٥٧)
مەحوی ........................................(١٦٨)
بێخود ........................................(١٧٩)
حەمدی ........................................(١٨٣)
سالم ........................................(١٨٥)
شێخ رەزای تالەبانی ........................................(١٨٩)
وەفایی........................................(١٩٣)
ولی دێوانە ........................................(١٩٨)
عەلائەدین سەجادی ........................................(٢٠٢)
قازی محمد ........................................(٢٠٩)
شێخ سەعیدی پیران........................................(٢٢٤)

مارف خەزنەدار.........................................(٢٢٨)
شێخ محمدی خاڵ .........................................(٢٣١)
مەلای گەورەی کۆیە .........................................(٢٣٤)
سەعید نەورەسی .........................................(٢٣٧)
عادلە خانم .........................................(٢٤٨)
زێبا خانم .........................................(٢٥٠)
حەبیٚ خانم .........................................(٢٥٢)
شێخ عبداللە ی نەهریٚ .........................................(٢٥٥)
شەرەفخانی بەدلیسی .........................................(٢٦١)
حوزنی موکریان.........................................(٢٦٣)
ڕەفیق حیلمی .........................................(٢٦٥)
تۆفیق وەهبی .........................................(٢٦٧)
قەدری جان .........................................(٢٧٠)
مسعود محمد .........................................(٢٧٣)
حەبسە خانی نەقیب .........................................(٢٧٦)
مەستوورەی ئەردەلان .........................................(٢٧٩)

صلاح الدینی ئەیوبی .........................................(٢٨٥)
محمد ئەمین زەکی بەگ.........................................(٣٠٩)
سمکۆی شەکاك.........................................(٣١١)
ئیبن خەلەکان .........................................(٣٢٠)
شێخ مەحمودی حەفید.........................................(٣٢٥)
قەدەم خێر .........................................(٣٢٨)
کمال مەزهەر .........................................(٣٣١)
گیوی موکریانی .........................................(٣٣٦)
مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەریس.........................................(٣٣٩)